# ڤلادیمیر
# ف. مینۆرسکیی

# رۆژهەڵاتناس

## نووسینەکانی لەبارەی کورد لەسەردەمی ئیسلامەتی
## تا سەرهەڵدانی خەلافەتی عوسمانی

لێکۆڵینەوەیەکی رەخنەیی



تاریق محەمەد عەبدولڕەحیم

وەرگێڕانی
ئازاد عوبێد ساڵح

تاریق محەمەد عەبدولڕەحیم

# ڤلادیمیر ف. مینۆرسکیی

ڕۆژهەلاَتناس

و نووسینەکانی لەبارەی کوردەوە هەرلە سەردەمی ئیسلامەتییەوە

تا سەرهەلّدانی خەلافەتی عوسمانی

لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەییە

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە

**ئازاد عوبێد سالّح**

کوردستان – هەولێر

٢٠٠٨ زایینی – ٢٧٠٨ کوردی – ١٤٢٩ کۆچی

وەزارەتی ڕۆشنبیری

بەڕێوەبەرایەتی گشتیی ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە

- ناوی کتێب : ڤلادیمیر ف. مینۆرسکی
- نووسینی: تاریق محەمەد عەبدولڕەحیم
- گۆڕینی بۆ کوردی: ئازاد عوبێد ساڵح
- تایپ : جەمیل سەید قادر
- ژمارەی سپاردنی (٢٤٤٢) ساڵی (٢٠٠٨) لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
- چاپ : چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری / هەولێر
- تیراژ : (١٠٠٠) دانە
- نرخ : (٢٠٠٠) دینار

له بنەڕەتدا ئەو کتێبە نامەیەکی ماستەرە بەسەرپەرشتی
پ.د. ئەرسەن موسا رەشید سەرۆکی بەشی مێژوو لە کۆلیژی
ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەددین - هەولێر ئامادەکراوە

## بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَلا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلاَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ وَقُولُوا آمَنَّا بِالَّذِي أُنزِلَ إِلَيْنَا وَأُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَإِلَهُنَا وَإِلَهُكُمْ وَاحِدٌ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾

صَدق الله العظيم

سورة العنكبوت.الآية٤٦

**پێشکێشە بە هەموو ئەوانەی**
**بەویژدانەوە لەبارەی کوردو کوردستانەوە**
**نووسیویانەو دەنووسن**

## Abbreviations / کورتکراوەکان

### ا- کورتکراوەکان بەزمانی عەرەبی

ت :توفي

ج : الجزء

د.ت : دون تاريخ الطبع

د.م : دون مكان الطبع

ر.د.غ : رسالة دكتوراه غير منشورة

ر.م.غ : رسالة ماجستير غير منشورة

ص : الصفحة

ص ص صفحات:

ط : الطبعة

ع : العدد

ق : القسم

م :الميلادي

مج : المجلد

هـ : الهجري

### ب- کورتکراوەکان بەزمانی کوردی و فارسی

١ـ الكردية:

بە (بەرگ) : المجلد

ز(زاینی) :الميلادي

ژ ( ژمارە) : العدد

ل (لاپەرە) : الصفحة

ل ل (لاپەرەکان) : (صفحات)

٢ـ الفارسية:

ش (شمارە) : العدد

هـ.ش :الهجري الشمسي

## ج — كورتكراوەكان بەزمانی بیانی

BSOS : Bulletin of the School of Oriental Studies.
BSOAS : Bulletin of the School of Oriental and African Studies.
BO : Bibliotheca Orientalis.
EB : Encyclopaedia Breatanica.
$EI^1$ : Encyclopaedia of Islam First Edition.
$EI^2$ : Encyclopedia of Islam New Edition.

Ibid (المصدر نفسه) : Ibidem.

JA : Journal Asiatique.
JRAI : Journal of the Royal Anthropological Instituc.
JRCAS : Journal of the Royal Central Asiatic Society.
JRAS : Journal of the Royal Asiatic Society.
MW : The Muslem World.

OP.Cit. (المصدر السابق) : Opere Cititao

p. :Page.
pp. : Pages.
Vol. : Volume.

# پێرست

# پێشەکی

لە سۆنگەی بایەخدانی ڕۆژئاوا بە ڕۆژهەڵاتەوە، ئەوا بەلێشاو کتێب و نووسراوی نیگا جیاوازی ڕۆژئاوایی هاتنە ئاراوە . ئەو نووسراوە دانراوانە وێنەیەکی ئاوەژووی دوور لە واقیعیانەیان بۆ چەندین سەدە لە مێشك و ئاوەزی مرۆڤی ڕۆژئاواییدا چەسپاند . جا لەبەر ئەوە دەبێ توێژەران ئەو وێنەیەی کە ڕۆژئاوا بۆ ئێمەیان کێشاوە بدەنە بەر تیشکی شیکردنەوەو ڕەخنە و تاوتوکردن، بۆ پەی بردن بەکێماسی و ناتەواوییەکانیان و پلەی دژایەتی و پێچەوانەیی لەگەڵ ئەو وێنە ڕاستەقینەیەی کە پێویستە بۆمانی بکێشن .

کوردیش ، وەك گەلێکی ڕۆژهەڵاتی، لەمێژە بۆتە جێی بایەخی ڕۆژئاواییان و نووسین لەبارەیەوە ، تا ئەوەی نووسراوێکی زۆری لەسەر نووسراوە، کەوا پێویست دەکات لێی بتۆژرێتەوە و شەن وکەو بکرێت .

سەردەستەی ئەوانەی لە سەدەی بیستەم لەبارەی کوردەوە بایەخیان بە تۆژینەوە داوە ، زاناو ڕۆژهەڵاتناسی ناوداری ڕووسی فلادیمیر مینۆرسکییە کە نووسینەکانی لە تۆژینەوە ئێرانییەکان بەگشتی و تۆژینەوەی کورد بەتایبەتی، بۆتە سەرچاوە بۆ هەرکێ بیەوێت، خۆ لەو بوارە بدات ، جا چ لەبارەی مێژووی کورد لەسەردەمی ئیسلامەتییەوە بێت، یانیش لەسەردەمی نوێدا . تۆژینەوە ئەکادیمییە زۆرەکانی مینۆرسکی، لەبارەی کورد لەسەردەمی ئیسلامەتی، هانی تۆژەری داوە سەربخاتە سەر ئەو لێکۆڵینەوانەو کۆیان بکاتەوە و بیانداتە بەر تیرۆژی ڕووناکایی و شرۆڤە کردن و شەن و کەو کردنیان .

جێی سەرنجە لە کتێبخانەکانی لای خۆمان، لێکۆڵینەوە لەبارەی ئەو ڕۆژهەڵاتناسە دەگمەنە، کەچی بەدرێژایی تەمەنی درێژی خۆی ، کەلەپوورێکی قەبەی کاری ڕەسەن و پوختی داهێناوە و مێژوو و جوگرافیاو شارستانیەتی مەڵبەندێکی فراوانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامەتی گرتۆتەوە و سەروکارێکی پتەوی بە هزروان و ڕۆشنبیرانی موسلمانی فارس و کورد و عەرەب و ئەوانی دیکەشەوە هەبوو . هەر ئەوەش وای لە تۆژەر کرد ، کە لە کەسایەتی ئەو ڕۆژهەڵاتناسەو

کاره زانستییەکانی لەبارەی کوردەوە بتۆژێتەوە ، نەخاسما، دوای هاندان و دەست لە پشتدانی زۆربەی ئەوانەی ئاشنای ئەو رۆژهەڵاتناسە بوون ، چ وەك کەسایەتی ئەو یاخود لەڕێی نووسین و دانراوەکانی، کە سەرنج و تێبینی قووڵ و وردیان لەلا دروست ببوو .

ئامانجی سەرەکی ئەو تۆژینەوەیە، دوو لایەنی هەن : یەکەمیان : دەرخستنی قەوارەو شەقڵ و سروشتی نووسینەکانی فلادیمیر مینۆرسکی ، سەبارەت بە تۆژینەوەی مێژووی هەمەلایەنی کورد لەسەردەمی ئیسلامەتیدا . دووەمیشیان : شەن وکەو کردنی ئەو نووسینانە و دەرخستنی ئاستی نزیکی نێوان تێڕوانینی خۆی وەك رۆژئاواییەك و تێڕوانینی ئیسلامی و نیشتمانی .

دیارە راپەڕاندنی ئەم کارە، پڕ ئاستەنگ و کۆسپ بوو ، ئەمە جگە لەوەی کە هیچ لێکۆلینەوەیەکی پێشتر لەبارەی ئەو رۆژهەڵاتناسە . نە بەزمانە رۆژئاواییەکان و نە بەزمانە رۆژهەڵاتییەکانیش نەبوو ، کەلەپووری زۆر بێ ئەندازەی و هەمەجۆری شوێن ، تۆژەری ناچارکرد کە کایەکی زۆر بەکۆکردنەوەی بابەتە جۆراوجۆر و پەرش و بڵاوەکانی لەنێوان لاپەڕەی سەرچاوە ، ئینگلیزی و فەرەنسی و رووسی و فارسی و عەرەبییەکاندا ، لەناوەوەی وڵات یان لە دەرەوەی وڵات بەخەرج بدات و بەدوای ئەوانەدا بگەڕێت کە ئەو رۆژهەڵاتناسەیان ناسیوە، یان قوتابی ئەو بوون لەزانکۆی تاران و ناردنی نامە بۆ هەندێ لەو رۆژهەڵاتناس و تۆژەرەوانەی کە زانیاری بەکەڵکیان لەبارەی ئەو رۆژهەڵاتناسە و نووسینەکانی هەبووە .

هەواری یەکەمی کارەکە، کۆکردنەوەی کەلەپووری بەبڕشتی ئەو رۆژهەڵاتناسە بوو ، بۆ ئەوەی بەو کەلەپوورە ئاشنابین و سەرلەنوێ بەپێی بەرنامەیەکی زانستی دایبڕێژینەوە تا بتوانرێت وێنەیەکی پەسندو روونی بۆ بکێشرێت ، ئەو کارەش کات و ئەرکێکی باشی زۆری برد .

لە کۆتایشدا تۆژەر پێی وابوو ئەو دابەشکردنە لە زۆربەی ئەوانی دیکە باشتر دەتوانێت بابەتەکە بخاتە روو و وەڵامی زۆربەی پرسیارەکانیش بداتەوە.

لەدەستپێکدا بۆ چوونە ناو بابەتەکە دەبوایە پێش بارێك هەبوا بۆ دەرخستنی ڕووکاری ڕۆژهەلاتناسییەکانی لێکۆلینەوە کوردییەکان بۆ دیاریکردنی ئەو چوارچێوەی کە مینۆرسکی تێیدا دەجولایەوە ، زانین و ئاشنا بوون بە ڕووکارە ئایینی و سیاسی و ئەکادیمی و لایەنەکانی دیکە، جەخت لەسەر سروشت و ئامانجی نووسراوەکانی مینۆرسکی دەکەنەوە — وەك هەر ڕۆژهەلاتناسێکی دیکە — و لەهەر هەوارێك لە هەوارەکانی ژیانیدا .

بەشی یەکەمی توێژینەوەکە تەرخان کراوە بۆ هەلوەستەکردن لەعاست ڕێڕەوی ژیانی مینۆرسکی ، ئەویش لەبەر پەیوەندی پتەوی نێوان ڕێڕەوی ژیان و کارە توێژینەوەکانی ، چونکە ئەوە دەرکەوتووە کە بەرهەمەکانی دەرەنجامی تێکەلبوونیەتی لەگەل ژینگە و دەوروبەرەکەی و نەخشە سیاسی و ئەکادیمییە جۆراوجۆرەکانییەوە . بۆیە بەشی یەکەم بەپێی ئەو هەوارانەی کە ئەو ڕۆژهەلاتناسەی پێدا ڕۆیشتووە کراوەتە چوار لك. ئەوانیش هەواری ڕووسی و فەرەنسی و بەریتانی و هەواری خانەنشینییە . لەهەر یەك لەو هەوارانەدا توێژەر هەولی داوە ئەو بارودۆخە بەسەر بکاتەوە کە مینۆرسکی تێیدا گوزەراندوویەو ئاماژەکردن بۆ چالاکییە جۆراوجۆرەکانی و تیشك خستنە سەر قەوارە و سروشتی کارەکانی.

هەرچی بەشی دووەمە، ئەو نووسینانە بەسەر دەکاتەوە کە مینۆرسکی لەبارەی کورد لەسەردەمی ئیسلامەتی نووسیوون بەپێی دابەشی بابەتی و کاتی. لەپاش دیقەت دان لە کەلەپووری ئەو ڕۆژهەلاتناسە دەرکەوت ، دەکرێت کارەکانی دابەشی سەر ئەم تەوەرانە بکرێت :

تەوەرەی یەکەم ، تەرخانە بۆ ئەو مەلبەند و شارە کوردیانەی ناو نووسراوەکانی مینۆرسکی . لەبەر ئەوەی بابەتی تایفەی ( هەقە ) ی ئایینی بایەخێکی زۆری پێدابوو لە ڕەوتی توێژینەوەکەیدا ، بۆیە تەوەرەیەکی سەربەخۆی بۆ تەرخان کراوە ، کە تەوەرەی دووەمینە . هەرچی هۆزە کوردەکانی سەردەمی ئیسلامەتییە ، ئەوا تەوەرەی سێیەمینە . لەتەوەرەی

چوارەمیـشدا ئـەو كارانـە خراونەتـە بەرچـاو كـە لـەبارەی بنەماڵـە كـوردە فەرمانڕەواكان دەدوێن .

ئەو بەشەیان بە پلەی سەرەكی وەسف ئامێزە و مەبەست لێـی هـەلێنجانی راو بۆچوونەكانی مینۆرسكییە لـە بـوارە جیاجیاكـانی بابەتەكـە بـەبێ شـرۆڤە و رەخنە لێ گرتن ، كە ئەوەیان بەشی سێیەمی بۆ تەرخان كراوە و شـەن وكـەوی رایەكانی دەكات بەپێی هەمان ئەو تەوەرانـەی كـە بەشـی دووەمـی پـێ دابـەش كرابوو . ئەمە وێڕای هەڵسەنگاندنێكی گشتی ژیـانی رۆژهـەڵاتناس و سروشـتی چالاكییەكانی و تۆژینەوە لە شێوازو بەرنامـەیی كارەكـانی و سـەروكاری لەگـەل سەرچاوەكان و پلە و پایەی لەچـاوی هـاوڕێ و قوتابییـە هاوچـەرخەكانییەوە و ئەوانـەی لێیـەوە نزیـك بـوون ، تەنانـەت تۆژەرەوەكـانی دوای خۆشـی . كۆتاییەكەشی كورتەیەكی ئەو دەرەنجامانەن كە تۆژەر بەدەستی هێناون .

شیكردنەوەی سەرچاوەكان :

أ – نووسینەكانی مینۆرسكی :

تـۆژەر ئـەركێكی زۆری بەخـەرج دا بـۆ كۆكردنـەوەی نووسـینەكانی كـە تـا ئەندازەیەكی باش بۆی لوا سەرناوی هەموو ئەو نووسـینانە ببینـێ كـە لـە رووی كاتـەوە بـەوردی ریزبەنـد كـراون ، ئـەویش لـەو بیبلیوگرافیایـەی كـە بـۆ نووسینەكانی رێك خرابوو . یەكەمیان ئەوەی كە لـە گۆڤـاری (دراسـات الـشرقیة والافریقیة) بەبۆنەی حەفتاو پێنج ساڵەی تەمەنی مینۆرسكی لە ( ١٩٥٢ ) بڵاوی كردبـۆوە . دووەمیـان ئـەوەی لەپێـشەكی كتێبـی ( ایرانیكـا ) كـە لـەژێر سەرپەرشتی مینۆرسـكی لـە سـاڵی ( ١٩٦٤ ) بـڵاو كراوەتـەوە ، دواهەمیـشیان كتێبـی ( یادنامـە ایرانـی مینۆرسـكی) سـاڵی ( ١٩٦٩ ) كـە هـەردوو هـاوڕێی مینۆرسـكی ، مجتبـی و ئیرەجـی ئەفـشار ، بـە پاڵپـشتی كتێبـی (ایرانیكـا ) ئامادەیان كردبوو ، بڵاوكرابۆوە . سەرەڕای ئەو بیبلیوگرافیایـەی كـە هاوسـەری مینۆرسكی لە دوای كۆچی دوایی ئامادەی كردبوو . تۆژەر پـشتی بـەو دووانـەی دواییان بەستووە بۆ ناسین و ئاشنا بوون بە نووسراوەكانی و كۆشاوە زۆربـەیان

بەجەنگ بخات و سەردەستەیی و بایەخی پتریشی بەو نووسراوانە داوە کە لەبارەی کوردەوەن لە سەردەمی ئیسلامەتیدا .

تۆژەر بۆی رەخساو توانی هەرچی تایبەت و سەروکاری بە بابەتەکەوە هەبوو بە دەست بێنێ، تەنانەت هەر بەو زمانەی کە مینۆرسکی خۆی پێی نووسیوون ، ئەوە جگە لە کتێبی ( الاكراد ملاحظات و انطباعات ) و ئەو وتارانەی کە لە ئینسکلوپیدیای ئیسلامی کراونەتە عەرەبی ، کە دەکرێ ئاوا دابەشیان بکەین :

١ – کتێب : گرنگترینیان کتێبی چەند لێکۆلینەوەیەك لە مێژووی قەفقاس (دراسات ڤى التاريخ القوقازی) لە سالّی ( ١٩٥٣ ) بڵاوکراوەتەوە . مینۆرسکی ئەو لێکۆڵینەوە درێژو وردەی بۆ تیشك خستنە سەر هەردوو بنەماڵەی کوردانی شەدادی و ئەیوبی تەرخان کردووە . بەسەرپێیش ئاماژەی بە کورد لەسەردەمی ئیسلامەتی لە کتێبی دیکەی وەك : ( سنووری جیهان – حدود العالم ) لە سالّی ( ١٩٣٧ ) و کتێبی ( سەفەرنامەی ئەبی دەلەف – سفرنامه ابی دلف ) لە سالّی ( ١٩٥٥ )، بڵاوکراونەتەوە .

٢ – تۆژینەوەو وتارەکانی : هەرە دیاریان ئەوانەن کە لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا بڵاوکراونەتەوە . لەوانەش ناودارتر ، هەردوو وتاری ( کوردو کوردستان ) ، گۆڤاری لێکۆڵینەوە رۆژهەلاتی و ئەفریقییەکان و گرنگترینی تۆژینەوەکانیشی ئەوانەن کە لە سالّی ( ١٩٤٣ ) بە سەرناوی (گۆران) و (ناوی مەغولی هەندێ شوێن لەکوردستانی موکریان – اسماء مغولية لأماكن في كردستان موكريان ) کە لە سالّی ( ١٩٥٧ ) بڵاوی کردوونەتەوە .

٣ – پێداچوونەوە : پێداچوونەوەکانی مینۆرسکی نەخشی دیاریان لە دەرخستنی راوبۆچوونەکانی مینۆرسکی و هەڵوێستی لە لێکۆڵینەوەی خەڵکانی دیکە ، هەبوو . لەو پێداچوونەوە هەرە گرنگانەشی ، ئەو کتێبەیە بەناوی ( کاکەییەکان لە مێژوودا – الكاكائية في التأريخ)ی عەباس ئەلعەزاوی مێژوونووسی عێراقی بوو کە لە سالّی ( ١٩٥٣ ) بڵاوی کردۆتەوە .

ب – چلەنامە : ( ئەو وتارانەی بۆ مەرگی مینۆرسکی و دوای مەرگی مینۆرسکی نووسراون) ئەگەرچی ئەو چلەنامانە کورتیشن ،بەڵام زانیاری بەکەڵکیان بۆ تۆژەر تێدایە ، چونکە ئەوانە رای خەڵکانێکن کە سەروساختی گەرمیان بەو رۆژهەڵاتناسەوە هەبووە . دەتوانین ئەمانەش دابەش بکەین بۆ :

١ – نووسینی رۆژئاواییەکان ، کە دیارترینیان ( د . لانك ) ی رۆژهەڵاتناسە کە لەگۆڤاری (قوتابخانەی لێکۆڵینەوە رۆژهەڵاتییەکان – مدرسة الدراسات الشرقية ) دا نووسیویە بە ناوی (پرسەنامەی فلادیمیر مینۆرسکی ) پرسەنامەکەی ( ج بویل ) ی رۆژهەڵاتناس لە رۆژنامەی (تایمس)ی بەریتانی کە سێ رۆژی دوای مردنی مامۆستاکەی نووسیوویەتی . رۆژهەڵاتناسە رووسەکانیش چلەنامەیان بۆ نووسیوە . تۆژەر نووسینەکانی ( ئەباییف و لافرینینکو )ی دەست کەوتوون . جێی سەرنجە ئەوەی دواییان لە یادی کۆچی دوایی ساڵی ( ١٩٨٠ ) بە درێژی لەبارەی مینۆرسکی نووسیوە و تیشکی خستۆتە سەر پێوەندییەکانی مینۆرسکی بە رۆژهەڵاتناسە سۆڤێتییەکانەوە .

٢ – نووسینی رۆژهەڵاتییەکان : بەتایبەتیش هاورێیە ئێرانییەکانی مینۆرسکی وەك سەید حەسەن ، تەقی زادە و مجتەبی مینوی و ئەمان الله نبهانی و دبیرسیاقی و سەید جەمال زادەن . ئەو چەند رۆژەی کە تۆژەر بەسەردان لەتاران بوو ، توانی هەموو ئەو نووسینانەی لە چلەو بیرەوەری کۆچی دوایی مینۆرسکی نووسراون ،دەست بخات و بۆ روونکردنەوەی لایەنە شاردراوەکانی ژیانی مینۆرسکی بەکاریان بهێنێت .

ج – ئەو پێداچوونانەوەی کە لەسەر تۆژینەوەکانی مینۆرسکی نووسراون :

ئەم پێداچوونانەوەش بایەخی خۆیان هەیە ، چونکە بەو هۆیەوە تۆژەر شارەزای تێروانینی رۆژهەڵاتناسان بووە سەبارەت بە کتێبەکانی . کەڵکی لەو پێداچوونانەوانە وەرگرتووە کە لەسەر هەقەکان لەساڵی ( ١٩٢٠ ) بەناوی (تۆژینەوە لەبارەی هەقەکان) بڵاوکراوەتەوە و گرنگترینیشیان

پێداچــوونەوەکەی (سموئیــل زویمــر)ی ڕۆژهەڵاتناســە . هــەروەها ئــەو پێداچوونەوانەی کە لەبارەی کتێبی ( دراسات في التأريخ القوقازي ) کەڵکیان بۆ تۆژەر هەبوو . لەوانەش پێداچوونەوەی ڕۆژهەڵاتناسانی وەك د. لانك و هاملتن کپ وفایر . لەدوو تۆیی ئەو پێداچوونەوانەدا ناوو ناوبانگی لێکۆڵینەوەکانی مینۆرسکی لای ڕۆژهەڵاتناسانی هاوچەرخ دەردەکەوێت .

د — سەرچاوە ڕەسەنەکان :

بەمەبەستی بەراورد کردن و تاوتوکردن و ڕەخنەگرتن لە بوارە جۆراوجۆرەکانی کارەکانی مینۆرسکی ، تۆژینەوەکە پشتی بەسەرچاوەو لێکۆڵینەوە ڕەسەنەکانی وەك کتێبە وڵاتناسییەکانی نموونەی (صورة الأرض)ی ئیبن حەوقەل ( لە ٣٦٧ ك / ٩٧٧ ز کۆچی دوایی کردووە دەقی دووەمی ئەبی دەلەف ( لە ٣٨٤ ك / ٩٩٤ ز کۆچی دوایی کردووە ) ی گەڕیدە و کتێبی (مسالك الممالك) ی ئیستەخری ( لە دوای ٣٤٠ ك / ٩٥١ ز مردووە ) و کتێبی (نزهة القلوب) ی حەمەدوڵلای مستەوفی قەزوینی ( لە ٧٥٠ ك / ١٣٤٩ ز مردووە)، بەستووە .

لەسەرچاوە مێژووییەکانیشدا کتێبی ( التنبیە و الأشراف ) و (مروج الذهب)ی مەسعودی (لە ٣٤٦ ك / ٩٥٦ ز کۆچی دوایی کردووە ) و کتێبی (الکامل في التأريخ)ی ئیبن ئەثیر ( لە ٦٣٠ ك / ١٢٣٢ ز کۆچی دوایی کردووە ) و کتێبی (معجم الأنساب)ی محەمەد کوڕی عەلی شوانکارەیی ( لەدوای ٧٤٥ ك / ١٣٤٤ ز مردووە ) و کتێبی ( السلوك لمعرفة دول الملوك ) ی مەقریزی ( لە ٨٤٥ ك / ١٤٤١ ز کۆچی دوایی کردووە ) و کتێبی ( شەرەفنامە ) ی مێژوونووسی کورد شەرەفخانی بەدلیسی ( لە ١١١٢ ك / ١٦٠٣ ز کۆچی دوایی کردووە ) .

هـ — لێکۆڵینەوە نوێیەکان :

بۆ ئەوەی نیگایەکی ڕەخنەکارانەی تێروتەسەڵمان سەبارەت بەو ڕۆژهەڵاتناسە بۆ دەربکەوێت، دەبوا لێکۆلینەوە نوێیەکانیش بەسەربکەینەوە، بۆ ئەوەی بیرو هزرەکانی لەگەڵ ڕۆژهەڵاتناس و تۆژەرەوە هاوچەرخەکانی بەراورد بکەین . لەو جۆرە کتێبانەش کتێبی ( بلدان الخلافة الشرقية ) ی

( کی لسترنج ) ی رۆژهەڵاتناسی بەریتانی و کتێبی ( کرد و ترك و عرب )ی ئەدموندسی رۆژهەڵاتناس و کتێبی ( شهریاران گمنام ) ی مێژوو نووسی تەورێزی (ئەحمەدی کسروی ) و ئینسکلوپیدیای ( عەلی ئەکبر دهخدا ) بەناوی ( لغت نامە) و کتێبی ( المستشرقون ) ی (نەجیب عەقیقی ) ... هەروەها تۆژینەوەکە بەهرەی لەنامە زانکۆییەکانی وەك : ( ئازەربایجان / لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی ژیارییە ) ی دکتور ( حیسامەدینی نەقشبەندی ) و ( کوردستان لەسەدەی هەشتەمی کۆچی ) ی دکتور ( زرار سەدیق تۆفیق ) وچەندین لێکۆڵینەوەی دیکە کە خوێنەر لە دووتوێی تۆژینەوەکە تێیان هەڵدەنگوێت ، وەرگرتووە .

و- پێوەندی تایبەتی :

پێوەندی کردنی تایبەتی تۆژەر بە چەندین کەسایەتی زانستی لەناوەوەو دەرەوەی وڵات، بواری رەخساند کە بەڵگەنامەی باش بەدەست بێنێت کە مەفایان بۆ تۆژینەوەکە زۆر بوو . سەردەستی ئەم کارەش :

١ – هەندێ لەو نامانەی کە مینۆرسکی لەگەڵ هاورێ ئیرانییەکانی بۆ یەکدیان دەنارد ، تۆژەر دەوروبەری چل نامەی مینۆرسکی دەست کەوت کە کاتی خۆی بۆ سەید حەسەنی تەقی زادەی[(١)] هاورێی ناردبوو و ژمارەیەکی زۆری ئەو نامانەشی بۆ هات کە مینۆرسکی بۆ ئیرەج ئەفشاری هاورێی ناردبوو[(٢)] هەروەها تۆژەر بەهرەی لەو نامانەش وەرگرت کە مینۆرسکی بۆ حوسێن حوزنی موکریانی و تۆفیق وەهبی ناردوونی .

٢ – وەڵامی ئەو پرسیارانەی کە تۆژەر لەهەندێ رۆژهەڵاتناس و تۆژەری کردووە ، لەوانەش:

---

(١) ایرج افشار ، نامەهای مینورسکی بە تقی زادە ، لە گۆڤاری (یغما) ،(تهران:١٣٥٥هـ ش) ج٢٩،ص ص٧٠٩–٧١٤؛ ج٣٠،ص ص ٨١–٨٧،ل٣٠ ،ل٨١–٨٢؛ص ص٢١٢–٢٢٢، بلاوکراوەتەوە .

(٢) یرج افشار ، فارسی نویسی مستشرقان ، لە گۆڤاری ( گلستان ) ، ( نیویورك : ١٣٧٦هـ ش) ژ٢، ص ص ٣٧ - ٥٠ ، ش٢ ، ص ص ٨٣ -- ٩٧ ، بلاوکراوەتەوە .

نامەی ی. ئی. ڤاسیلیڤای رۆژهەڵاتناسی رووسی لە ١٦ای شوباتی ٢٠٠٠.

نامەی عەبدولعەزیز دوری ( قوتابی مینۆرسکی ) لە ٢٤ ی نیسانی ٢٠٠٠.

ماریا ئوسیای رۆژهەڵاتناسی بەریتانی داوای بەخشینی لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکان کرد ، جگە لە هەندێ کەسی بێ وەڵامیش .

لەکۆتاییدا دەڵێم ئەم نامەیە هەولێکی سەرەتایی بێ کەم و کورتی نییە ، بەڵام مەبەستی سەرەکی من سەرنج راکێشانە بۆ لایەنێکی گرنگی تۆژینەوە کە ئەویش رەخنەگرتنە لە نیگای رۆژئاواییانە ، دەخوازم بە پشتیوانی خودا لەداهاتوودا ببێتە سەرمەشق بۆ تۆژەر . هەرخودا پەنای سەرکەووتوانە .

تۆژەر ٣١ / ١٠ / ٢٠٠٠

پێشبار

## رووكاره رۆژهەڵاتناسییەكانی كوردناسی

رۆژهەڵاتناسی[٣] هەوڵ وكۆششی رۆژئاوایە بۆ ناسین و ئاشنابوون بە رۆژهەڵات و دیاردەیەكە لە دیاردەكانی سەرو كاری ( بەندیواری ) رۆژئاوا بە رۆژهەڵاتەوە و بەدوایشدا بەرهەمی هۆكاری ئەو بەندیوارییە . مێژووی رۆژهەڵاتناسیش[٤] مێژووی شێوازی ئەو بەندیواری و پەیوەندییە كە رۆژئاوا، رۆژهەڵاتناسی پێ ناسیوە و بەرەو پێشچوونی ئەو تێروانینە رۆژئاوایە بۆ رۆژهەڵات و ئەو هۆیانەش كە لە دروست بوونی بەشدار بوونە . دیارە سەروكاری جۆراوجۆری رۆژئاوا بە رۆژهەڵات جۆرەها ئامانج و مەبەست گەلی لێ كەوتۆتەوەو لە نووسینی رۆژهەڵاتناساندا رەنگی داوەتەوە ، ئیدی شێوازو جۆرەكانیشی جۆراوجۆر بوون و نووسینی ناوەرۆك ئایینی و ئامانج میسینێری لێ كەوتەوە . هەرچی بەرژەوەندییە ئابووری و سیاسییەكانن، ئەوا شێوازی دیكەی رۆژهەڵاتناسی لێ بەدەر داوە ، دام و دەزگا ئەكادیمییەكانیش چەندین

---

(٣) بۆ زانینی پتر لەبارەی زاراوەی رۆژهەڵاتناسی بڕوانە : میشیل جحا ، الدراسات العربية الأسلامية في اوربا ، (بيروت:١٩٨٢ ) ، ص ص ١٥ — ١٧ ؛ علي أبراهيم النملة ، كنة الأستشراق مناقشات في التعريف والنشأة ، تۆژینەوەكە لەگۆڤاری (الدعوة) ی زانكۆی ( محمد بن سعود )ی ئیسلامی ، (الرياض : ١٩٩٣) ؛ ع١ ،ص ص ٢٢ — ٩٠ ، بڵاوكراوەتەوە.

(٤) رای جۆراوجۆر سەبارەت بە مێژووی رۆژهەڵاتناسی هەیە ، بەڵام نیمچە گردەكۆیەك لەنێوان تۆژەران هەیە، كە مێژووی رۆژهەڵاتناسی رەسمی بۆ كۆمەلگای ڤیەنای كەنیسەیی ( ١٣١٢ ز ) دەگێڕێتەوە و تێدا بریاری دامەزراندنی مەڵبەندەكانی لێكۆلینەوەی زمانە رۆژهەڵاتییەكانی لە ئەووڕپا دا . بۆ درێژەی بڕوانە : محمود حمدی زقزوق ؛ الأستشراق والخلفية الفكرية للصراع الحضاري، (قطر : ١٤٠٤هـ) ، ص١٩ : شكري النجار ، لم الأهتمام بالأستشراق ، تۆێژینەوەیەكە لە گۆڤاری ( الفكر العربي ) ؛ ( بيروت : ١٩٨٣ ) ، ع ٣١ ، ص٦٢ ؛ بڵاوكراوەتەوە .

نەوەی رۆژهەلاتناسیان دەرچوواند و سازکرد کە دەسکەوتی زانستی رەسەنیان بەدەست هێناوە[٥] .

سەبارەت بە بایەخدانی رۆژئاوا بە ولاتی کوردەواری و گەلەکەی ، ئەوا کوردناسی شوێنێکی فراوانی لای رۆژهەلاتناسان داگرتووە ، کورد وەك گەلێکی رۆژهەلاتی زیندوو، لە مەلبەندێکی ستراتیژی خودان شارستانی دێرین، توانایەکی ئابووری گەش، ئەمە وێرای فراژۆبوونی نەخشی سیاسیی و رۆشنبیریی رۆلەکانی نەخاسما لە سەدەی بیستەمدا ، هەموو ئەمانە بوونەتە هۆی بایەخ پێدانی رۆژئاوا بە کوردستان و گەلەکەی . رۆژهەلاتناسان هیچ لایەنێك لە لایەنەکانی زمان و دیرۆك و باری ئابووری و کۆمەلایەتی و ئایینی و ژیاری کوردیان فەرامۆش نەکردووە و بەتۆژینەوە و باس و خواس و بەدواداگەران لەئاستیا هەلوەستەیان کردووە و بەتێرو تەسەلی لێی دواون . تۆژینەوەکانیان ئەوەندە زۆرو جۆراوجۆر بوون تەنانەت پێویستی بەسازکردنی پێرست و بیبلیۆگرافیا کرد، بۆ بەسەر کردنەوەیان و ئاسان کردنی کاری تۆژەران .

رۆژهەلاتناسەکان چەندین پێرستیان ساز کرد[٦] ، یەکەمیان ئەوەی پ. لیرخی[٧] رۆژهەلاتناسی رووسی بوو سالی ( ١٨٥٦ ) ، دوا پێرستیش ئەوەی ج. موسیلیانی ژنە رۆژهەلاتناسی رووس بوو سالی ( ١٩٩٦ ) ، لەدوو بەرگدا کە پتر

---

(٥) بۆ درێژەی بروانە: ادوارد سعید، الأستشراق، ترجمة: کمال ابو دیب، (بیروت : ١٩٨١)، ص ص ٣٧–٦٠؛ عبد الجبار ناجي ، تطور الأستشراق في دراسة التراث العربي ، (بغداد : ١٩٨١) ص ص ٩ –١٨

(٦) بۆ درێژەی بروانە : مەعرووف خەزنەدار : بیبلیۆگرافیای کوردی ؛ وتارەکە لە گۆڤاری رۆژی کوردستان ؛ (بەغدا:١٩٧٢ ) ؛ ژ ٨ ؛ ل ٤٤ – ٤٥ ، بلاوکراوەتەوە .

(٧) لەنامەکەدا ناوی دەیان رۆژهەلاتناس دێت، بەلام پێناسەیان ناکەین ، ئەوەی دەیەوێت ئاگاداری ژیان و چالاکی هەر یەکێکیان بێت ئەوا لە ئینسکلۆپیدیای جۆراوجۆردا هەن دیارترینیان : نجیب العقیقي ، المستشرقون ، ( مصر : ١٩٦٤ ) سێ بەرگە : گروه مؤلفان و مترجمان . فرهنگ خاورشناسان ؛ ( تهران : ١٣٧٦ هـ . ش ). تا ئێستا بەرگی یەکەم دەرچووە؛
Dictionary of the National Biography. (London.1901-1950)

له هەشت هەزار سەردێری کاری رۆژهەڵاتناسی سەبارەت بە کوردناسی گرتبووە خۆ ، ئەوەی جێی سەرنجە ئەو کارەی دواییان ئاکامی ئەرك و ماندوبوونی دەوروبەری نیو سەدە بوو ؛ بە بەڵگەی ئەوەی کە تۆژەر بەرگی یەکەمی کارەکەی لە ساڵی (١٩٦٣)(٨) بڵاوکردۆتەوە .

لەبەرانبەر ئەو هەموو تۆژینەوە رۆژهەڵاتناسیانەدا هەڵوەستە دەکەین و دەپرسین ، ئاخۆ روو لەوکارانە وەرگێڕین، بە بیانووی ئەوەی گوایە بە مەبەستی رق و قین و ئامانجی ئیمپریالیزمیانە نووسراون ؟ یاخود لەهەمبەر هەموو کارێکی رۆژهەڵاتناسی لەبارەی خۆمان بێ دەنگ بین، هەر لەبەر ئەوەی کارێکی رۆژئاواییە ؟ . لەنێو رۆژهەڵاتناساندا ، رۆژهەڵاتناسی وا هەیە ئەرك و ماندووبوونێکی زۆری لە لێکۆڵینەوە و تۆژینەوە لە مێژووی کوردستان بەخەرج داوە ، تۆژینەوەی بەبریشت و شایانی لێ هاتۆتە بەرهەم ، لەبەرانبەریشدا کتێب و تۆژینەوەی رۆژهەڵاتناسی وا هەن کە سادەوساکار و رووکەشن و گەلێ وێنەی شێواوی لە نەزانی و تۆمەت بۆ هەڵبەستنیش هەن ، لەو بوارەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بە رای مینۆرسکی بکەین کە دەڵێت (( زۆرن ئەوانەی لە ژیانی کوردان دواون، بەڵام کەمیان بەهێمنی لەو ژیان و کەسایەتیەی کوردیان کۆڵیتەوە . زۆربەی ئەو گەڕۆکانەی کوردیان بینیوە، لەلایەنی باشەی کوردیان نووسیوە و لەبەرچاو گرتووە ، بەڵام ئەوەی کە لەبارەی کوردەوە هەیە ، بەشێوەیەکی گشتی ، وێنەی لایەنی خراپەن ، دیارە ناکرێت ئەوانە لەبەرچاو بگری، چونکە نە لەئاگادارییەوە دەرچووەو نە بەڵگەشی لەگەڵدایە ))(٩) .

پەی بردن بەو جیاوازییە ناچارمان دەکات کە بەرهەمە رۆژهەڵاتناسییە جۆراوجۆرەکان بدەینە بەر تیشکی رووناکی بۆ ئەوەی ئەو رووکارو ئامانجانە دیار بکەین کە بە هۆیەوە رۆژهەڵاتناسی لێ کەوتۆتەوە، دەشێ ئەو بەرهەمانە بەپێی ئەو رووکارانە دابەش بکەین :—

---

(٨) بۆ زانیاری پتر بروانە : ج. موسیلیان ، بیبلیۆگرافیای کوردناسی ، ( موسکو : ١٩٩٦ ) بەزمانی رووسی .

(٩) الأكراد ملاحظات و انطباعات، ترجمة: معروف خزندار (بغداد ١٩٦٨)، ص ص ٦٩ — ٧٠ .

### یەکەم : رووکاری ئایینی ( میسێنری )

ئـەو رووکارەیـان ئـەو پیـاوە ئایینیــە مەسـیحیانەن کــە سەردەسـتەی رۆژهەڵاتناسان بوون ، چونکە هۆکاری ئـایینی، بـەری هـەر هۆیـەکی دی، دنـەی رۆژئاواییەکانی داوە ، بایەخ بـە رۆژهـەڵات بدەن ، ئەوانـە سـەرهەڵدانی ئـایینی ئیسلام وەك ئایینێکی نوێ و وپێرەوێکی بەسەروبەر بە سەرچاوەی هەرەشە بۆ دەوڵـەتی مەسـیحی بیزەتنـی دەبیـنن، ئـەویش بـە رزگـارکردنی وڵاتـی شـام و میـسر و بـاکووری ئـەفریقیاو ئـەوروپا و ئەسـپانیا و سـقیلیا بـوو ، ئـەو مەیدانخوازییە پـاڵی بـە رۆژئاواییەکانـەوە نـا بـەوردی بایـەخ بـە ئیـسلامناسی و ئایینی ئیسلام بدەن[١٠].

بەسـەرهەڵدانی بزووتنـەوەی جوگرافیاناسـی و فـراوان بـوونی بەرژەوەندییەکانی رۆژئاوا لە رۆژهەڵات و سـەرەتای سـەرهەڵدانی ئیمپریـالیزم ، لێرەوە میسێنرەکان روویان لە رۆژهەڵات[١١] کرد، بە مەبەستی مەسیحی کردنی رۆڵـەکانی رۆژهـەڵات، تایفـەی فەرەنـسی[١٢] دۆمـینی[١٣] و یەسـیوعی[١٤] پەیـدا

---

(١٠) بۆ درێژەی بڕوانە:

N . Danicl ، Islam and the west،(Edinburgh:1960)pp160-188 .

(١١) ماوەیـەك پێشتر رۆژهەڵات نێردەی میسـینێری بـە خـۆوە بینیبوو ، بـەڵام نـەخشی راستەقینەو کاریگـەری هاوکـاتی سەرهەڵـدانی ئیمپریالیزم بـوو . بـڕوانە : عبد اللطيف الطيبـاوي ، المستشـرقون النـاطقون بالأنكليزيـة ومـدى اقـترابهم مـن حقيقـة الأسلام . تـۆژینەوەیەکـە لـە گۆڤـاری (الفكـر العـربي )؛ ( بـيروت : ١٩٨٣ )، ع٣٢. ص ص ٩٥ – ٩٦ بڵاوکـراوەتەوە.

(١٢) تایفەیەکی ئایینی بوون؛ قەشە فرانیس ئەلئەسیزی لە ساڵی (١٢١٢) دایمەزراند و خەریکی بڵاوکردەوەی کاسۆلیکییەت بوو ؛ بڕوانە:

Avdrey Butler.Dictionary of Date Every Mans (London:1964)P.167.

(١٣) تایفەیەکی ئایینیە قەشە دومنیك ساڵی (١٢١٦) دایمەزراند. بڕوانە : Ibid. P. 126.

(١٤) تایفەیەکی ئایینییە، پیاوێکی ئەسپانی لیولا ناو لەسەدەی شازدەیەم دایمەزراندو ئەرکی بڵاوکردنەوەی مەسیحییەتی لەجیهاندا و بەگژداچوونەوەی هەرکەسێ کە دژایەتی ئاینزای کاسۆلیکی بکات، گرتە ئەستۆ. بڕوانە:

Butler ، Dictionary، p. 245.

بوون، خەڵکی خۆی بۆ ناوچەکانی ڕۆژهەڵات دەنارد؛ بەمەبەستی ڕاکێشانی خەڵك بەگشتی و مەسیحییەکانیش بەتایبەتی بۆ ئاینزای کاسۆلیکی(١٥).

کوردستانیش لەو مەڵبەندە سەرەکیانە بوو، کە نێردە میسێنرییەکانی ڕۆژئاوا ڕوویان تێدەکرد . مەڵبەندێك بوو کە بیروباوەڕی جۆراوجۆری وەك ئاینی زەردەشتی لێ هەبوو(١٦). هەروا هەندێ جوولەکەش لە ناوچەی کوردستان دەژیان(١٧). بڕوا وایە کە هەولێر لەپێشەنگی ئەو شارانەیە کە ئاینی مەسیحی لە دوای نیوەی دووەمی سەدەی یەکەمی زایینییەوە تێدا بڵاوبۆتەوە(١٨). هەر بەهاتنی ئیسلام بۆ ناوچەکە، کورد نەخشێکی کاریگەریان لەبەرگری لێ کردن و چەسپاندنی ئەو ئاینە بینی ، هەروا تایفەی ئاینی وەك ئێزیدی و هەقەکانی لێ پەیدابوون.(١٩)

کۆنترین کەس کە هاتۆتە ناوچەکە، ریکولد و مونتکریشی ئیتالی باوك بوو رووی لە تەورێز کرد(٢٠). لەوێشەوە بە کوردستاندا بۆ مووسل ، لەساڵی (١٢٨٨) لەگەڵ ئەندامانی ، نێردەکەی لەمووسڵ نیشتەجێ بوون ، کتێبێکی لەبارەی گەشتەکەی نووسی و تێبینی و سەرنجی بەبایەخی سەبارەت بە ناوچەی کوردەواری تێدا تۆمار کردبوو.(٢١)

---

(١٥) س . ج . ا ادموندز ، كرد و ترك و عرب سياحة ورحلات وبحوث عن الشمال الشرقي من العراق ( ١٩١٩ — ١٩٢٥ ) ؛ ترجمة : جرجيس فتح الله ( بغداد : ١٩٧١ ) ؛ ص ٢٥ ، پەراوێزی ١٠ ؛ الطيباوي ، المستشرقون الناطقون (ص ص ٩٦ — ٩٧ ؛ عزيز عبد الأحد نباتي ، تأريخ عينكاوة، مراجعة وتقديم البير أبونا،( اربيل : ٢٠٠٠ ) ؛ ص ص ١٩١ — ٢٠٠ .

(16 ) H. M. Burton. " The Kurds ." JRCAS. 1944. Vol. xxxi. P. 67 .

(١٧) بۆ زانیاری پتر بڕوانە : بنيامين التطيلي ، رحلات بنيامين ، ترجمة و تعليق: عزرا حداد ، (بغداد : ١٩٤٥ ) ، ص ص ١٥٣—١٥٤ .

(١٨) نباتی ، المرجع الساب ، ص ٤٥ .

(١٩) بۆ درێژەی بڕوانە: مينۆرسكی ، الأكراد ، ص ص ٥٢ — ٦٠ .

(٢٠) بڕوانە: نەخشە لە پاشکۆدا .

(٢١) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: ميريلا غاليتي ، التراث الكردي في مؤلفات الايطاليين ، ترجمە: يوسف حبی. تۆژینەوەیەکە لە گۆڤاری المجمع العلمي العراقي — الهيئة الكردية.( بغداد : ١٩٨١ )؛ ج٨ ، ص ص٢٣٤ — ٢٣٥ ، ٢٦٧ ، بڵاوبۆتەوە .

لەسەدەکانی دواتردا پیاوانی ئایینی مەسیحی لەگەشتەکانیاندا بەردەوام بوون بۆ ناوچەکە ، بەپێی لێکۆلینەوە دەرکەوتووە، ژمارەی ئەوانەی هاتوونەتە ناو قەلەمڕەوی دەولەتی عوسمانی، لەوانەی بایەخیان بە ڕۆژهەلات دەدا، لەسەدەکانی چواردەیەم و پازدەیەم و شازدەیەم لە چوارسەد ڕۆژهەلاتناسی تێپەڕاندووە، حەفتاو پێنجیان پیاوی ئایینی بوونە[٢٢] .

پیاوانی تایفەی کابوشی[٢٣] . لەو فەڕەنسییانەی بەرایی بوون کە سەروکاریان بە کوردستانەوە هەبووە ، لە سالی ( ١٦٣٢ ) نێردەیەکیان ناردۆتە موسل، بەمەبەستی بلاوکردنەوەی ئاینزای کاسۆلیکی لەوێ ، ئەوانە بیرەوەری خۆیان بۆ وەسف کردنی ولاتی کوردەواری نووسیوە[٢٤] . ئەوانە بۆ ئەوە چوون کە فێری زمانی کوردی ببن تا پردی پەیوەندی لەگەل خەلکی ولاتەکە دابمەزرێنن و قامووسی زمانەوانی دابنێن، بۆ ئەوەی ئەو میسێنرانەی دوای ئەوان دێن کاریان ئاسان بێت[٢٥] .

لەلایەکی دیکەوە باوکانی فەرەنسیی و دۆمینیکان نەخشێکی دیاریان لە گەشەپێدانی زانیاری ڕۆژئاوا بە کوردستان و خەلکەکەی بینیوە لەڕێی گواستنەوەی دەستنووسەکان بۆ ئەوروپا، کوردناسییش لەسەر ئەو بنەمایە دامەزرا[٢٦] .

---

(٢٢) بڕوانە : فەرهاد پیربال ، سەرچاوەکانی کوردناسی، ( سلێمانی : ١٩٩٥ ) ؛ ل ١٤.

(٢٣) تایفەیەك بوون لەسالی ( ١٥٢٨ ز ) پێك هات، ماتیوئەلباسی دایمەزراند. بڕوانە:
Butler. Dictlionary, p. 82.

(٢٤) بۆ زانیاری پتر بڕوانە : موسیلیان ، ببیلیوغرافیا ، ج١، ص١٧٣ ؛ فەرهاد پیربال ؛ سەرهەلدانی کوردناسی لە فەرەنسا ، وتارەکە لە وەرزنامەی سەنتەری لێکولێنەوەی ستراتیژی ؛ ( سلێمانی : ١٩٩٩ ) ، ژ ٢٥ ، ل ل ٧٥ — ٧٦ ، بلاو بۆتەوە .

(٢٥) بڕوانە : فەرهاد پیربال ؛ ئینجیل د مێژوویا ئەدەبیاتێن کوردیدا ، پێداچوونەوەی محەمەد گەزنەیی ، ( دهۆك : ١٩٩٩ ) ، ل٢٥ .

(٢٦) پیربال ؛ سەرهەلدانی کوردناسی ، ل٧٦ .

لەسەدەی هەژدەیەم بایەخدان بە کوردستان بە دامەزراندنی نێردەی باوکانی دومینیکان لە ساڵی (١٧٤٨)لە موسل فراوانتر بوو و ئەو نێردەیە نەخشێکی گرنگی لە ناساندنی ناوچەکەدا بینی(٢٧).

کاری گرنگی یەکێك لە ئەندامانی ئەو نێردەیە ئەو قامووسەیە کە ماریزو گارزونی میسینێر بەناوونیشانی: رێزمان و قامووسی زمانی کوردی ساڵی (١٧٨٧) دایناوە و مینۆرسکی زۆری بە دڵ بووە، بە یەکەمین کتێبی داناوە، کە لەبارەی رێزمانی زمانی کوردی بڵاو کراوەتەوە و گارزونی بەباوکی کوردناسی(٢٨) ناودێر کردووە ، خەڵکانی دیکەش نازناوی پێشەنگی رێزمانی کوردیان پێ گوتووە ، چونکە یەکەمین کەسی ئەورپایی بووە، قامووسی زمانی کوردی دابنێت ، ئەوەش لە دوایی مانەوەی پازدە ساڵ لە ئامێدی، ئینجا بۆی چووە سەر . بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەش مەبەستی بنەڕەتی کێشەکە میسینێری بوو، ئەوەتا دانەر خۆی ئەوە تۆمار دەکات :(( تەنیا مەبەستم لەوە، یارمەتیدانی نێردەکانە لە دوارۆژدا))(٢٩)بەشداری پیاوانی نێردەی دۆمینیکان لە موسڵ لەبارەی لێکۆلینەوە لە مێژووی کوردستان هەر ئەوە نەبوو؛ بەڵکو میسنێریی دیکەی بەدوادا هات، ئەویش جوزینی کامبانیلی بوو بەکتێبی (مێژووی ناوچەی کوردستان و تایفە ئایینیەکان )؛ ئەویش بەرهەمی بەسەرکردنەوە تایبەتیەکانی بوو لە ناوچەکەدا لە نێوان سالآنی (١٨٠٢ — ١٨١٥ ).

دەبێ ئاماژە بەوەش بکەین کە ئەم کتێبە یەکەم کاری چاپ کراوە لە ئیتالیا ، رەنگە لە سەرتاپای جیهانیش — بەپێی قسەی میریللا گالیتی — کە بەتەنیا سەرجەمی بۆ ناوچەی کوردەواری تەرخان کراوە بێت، نووسەرەکەی بەدرێژی باسی لە لایەنە جیاجیاکانی کوردو کوردستان دەکات .(٣٠)

---

(٢٧) بۆ درێژەی بروانە : غالیتی ؛ التراث الكردي ؛ ص ص٢٣٩—٢٤٠؛٢٨٠ - ٢٨٤ .

(٢٨) الاكراد ، ص ص٤٥ -- ٤٦ .

(٢٩) مینۆرسکی نفسە ،لا ٤٥ — ٤٦ ؛ غالیتی ؛ التراث الكردي ؛ ص ص٢٧٧.

(٣٠) غالیتي ، نفسە ،ص ص ٢٨٠ — ٢٨٤.

میسنێرەکان لەهەردوو سەدەی نۆزدەیەم و بیستەم خەریکی کارەکانیان بوون و هەروەها نێردەی میسینێری فەرەنسی و بەریتانی و ئەلمانی داڕژانە سەر ناوچەکە و لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمینیش نەخشی میسنێرە ئەمریکاییەکان بەدەر دەکەوێت [٣١].

دانراوی دیکەی چالاکی میسێنرەکان، وەرگێڕانی چوار ئینجیلەکەیە بۆ زمانی کوردی، کە یەکەمین جار لە ساڵی (١٨٥٧)[٣٢] لە ئەستەنبۆڵ بلاّوکراوەتەوە . جێی وەبیرهێنانەوەیە، کە ئەو کارە یەکەمین هەنگاوی وەرگێڕانی کتێبە لە زمانە بیانییەکانەوە بۆ زمانی کوردی، پەخشی وەرگێڕدراوی ئینجیلەکان بۆکوردی ئەوەندە زۆربوون لە ماوەی سەدەیەکدا ١٨٥٧ – ١٩٥٧ لەدە چاپ پتر بوو ، لەمەشدا دام و دەزگا میسنێرە ئەمریکاییەکان نەخشێکی دیاریان هەبوو[٣٣].

کاری میسنێرەکان لە سەدەی بیستەمیشدا بەردەوام بوو، گۆڤارێکی میسنێریی بە ناوی ئیسلامەتی ( The Muslem World) [٣٤] کە بایەخێکی

---

(٣١) مینۆرسکی ،الاکراد ، ص٢٤ ؛ ن. ا. خالفین ، خەبات لەرێی کوردستاندا ؛ وەرگێرانی: جەلال تەقی ، (سلێمانی : (١٩٧١) ، لا ٤١ – ٤٣؛ م. س. لا زاریف ، کێشەی کورد ، وەرگێڕان و لێدوانی: کاوس قەفتان ، (بەغداد : ١٩٨٩ )، بە١ . ل ل ١٤ – ١٦؛ کەمال مظهر احمد، کردستان فی سنوات الحرب العالمیة الاولی ، (بغداد : ١٩٨٤ )، ص ص٧٠ –٧٤، – ٧٩؛ فوزی خلف شویل ، تغلغل النفوذ الامریکي في ایران ، ر.د.غ ؛ الاداب، ( جامعة بغداد : ١٩٩٠) ص ص٢٠– ٢٣ ؛ عبد الرحمن معروف ، موجز تاریخ وضع القوامیس الکردیة، تۆژینەوەکە لە گۆڤاری المجمع العلمي الکردي، ( بغداد : ١٩٧٥ ج٣ ، ف١، ص٧٠٨ بلاّوبۆتەوە .

(٣٢) هەندێ رای دیکە وەرگێڕانی ئینجیلەکان بۆ سەدەی پازدەیەم یان حەڤدەیەم دەباتەوە. بۆ زانیاری پتر بڕوانە: کەمال مەزهەر ، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، (بەغدا: ١٩٨٥)؛ ل ٢٧٤ ؛ پیربالّ؛ ئینجیل د مێژوویا ،ل ٢٤ – ٢٧ .

(٣٣) بۆ درێژەی بڕوانە : پیربالّ، هەمان سەرچاوە ، لا ٤٧ – ٨٧ .

(٣٤) گۆڤارێکی میسنێری بوو، جاری یەکەم لە ساڵی (١٩١١) لە ژێر سەرپەرشتی بەریتانیا دەرچووە، پاشان گوازرایەوە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تا هەنووکە دەردەچێت و لەسەرتاپای جیهان دابەش دەکرێت .

تایبەتی بەناوی کوردەواری دەدا، لەرێی ئەو راپۆرت و باسانەی میسنێرەکانی نیشتەجێی ناوچەکە لەبارەی ناوچەی کوردەواری ئامادەیان دەکرد (٣٥) مینۆرسکی نووسیویەتی کەوا میسنێرە ئەمریکاییەکان لە ورمێ (٣٦) و نێردەی ئەلمانی لە سابلاخ – شاری مەهابادی ئیستا لە کوردستانی ئێران – گۆڤارێکیان بەناوی (کوردستان ) بەزمانی کوردی لە سەروبەندی شەڕی یەکەمی جیهان دەردەکرد (٣٧).

**دووەم : گەڕیدەو بازرگانەکان (٣٨)**

لکی دووەم پێکهاتەی کەلەپووری رۆژهەڵاتناسی نووسینی ئەو گەڕیدانەن کە بە مەبەستی گەشتیاری یان بازرگانی و ئاڵوێر سەردانی رۆژهەلاتیان کردووە، هەلکەوتی کوردستان لە چواررێیانی هاتوچۆی نێوان رۆژهەلات و رۆژئاوا و باکوور و باشوورەوە، ئەمە جگە لە سروشتی جوگرافیایی تایبەتمەندی و پایەی بەرزی دیرۆکی ، وای لە گەڕیدەکان کردووە، پێیدا گوزەر بکەن، سەرنج و دیدەنییەکانیان لەبارەیەوە تۆمار بکەن .

پێشەنگی ئەو گەڕیدانەش بنیامین تەتیلیسییە کە لە سەروبەندی گەشتەکەی لە نێوان سالانی ١١٦٣ – ١١٧٢ ، بەکوردستاندا رەت بووەو کتێبەکەی هەندێ ئاماژەی بۆ زۆر ناوچەی کوردستان (٣٩) تێدایە . ئەسپانییەکی دیکە کە ناوی گۆتێنگنە لە سالی (١١٩٠) (٤٠) ، سەردانی کوردستانی کردووە

---

(٣٥) بۆ نموونە:

N.J. Lohre، The highlanders of Kurdistan، 1920،Vol. X. PP.282-286: R.C.C. Cumberland، the kurds، 1926،Vol. Xvi،pp.150-157.

(٣٦) ورمێ : شارێکە دەکەوێتە رۆژئاوای ئێران نزیك گۆلی ورمێ. بۆزانیاری پتر بروانە : بەشی دووەمی توێژینەوەکە .

(٣٧) بروانە : الاکراد، ل ٢٤ ؛ أهل الحق، دائرة المعارف الاسلامية ،ط١ ؛ ج٣ ، ص٩٤ .

(٣٨) کارەکانی ئەو گەڕیدەو بازرگانانە ناچێتە ژێر باری هیچ رووکارێك و هیچ ناوێکی دیاریکراویشمان بۆ نەدۆزینەوە.

(٣٩) بۆ زانیاری پتر بروانە: رحلة بنيامين ؛ ص ص١٢٥ – ١٢٧ ، ١٥٣ – ١٥٧ .

(٤٠) بۆ زانیاری پتر بروانە: پیربال ؛ سەرچاوەکانی کوردناسی، ل٢٨.

وەسفی جوانی لە کتێبەکەی سەبارەت بە کاروباری شاری هەولێرو ئەدیب و پیاوە ناودارەکانی ئەو کاتەی کە لێی بوون کردووە . مارکۆپۆلۆی گەڕیدەی ناوداریش هەندێ سەرنجی لەبارەی کوردو کوردستانەوە نووسیوە لە و کتێبەیدا کە دەنگ و باسی گەشتەکەی بۆ ئاسیای لە سالآنی (١٢٧٠)– (١٢٩٥) [٤١] تێدا تۆمار کردووە .

یەکێ لەو تۆژەرەوانە، وەك بەڵگە لەسەر قەوارەی گەشت و گوزار و بازرگانی، ئاماژە بەوە دەکات، کە سەدەکانی چواردەیەم و پازدەیەم و شازدەیەم پتر لە حەفتا گەڕیدە و سی و هەشت بازرگان هاتوونەتە قەلەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی [٤٢]. بەلآم لە سەدەکانی دواتردا ژمارەیان بە شێوەیەکی بەرچاو زیاد بووە [٤٣] .

لە سەدەی حەڤدەیەمیشدا گەڕیدەی دیکە پەیدا بوون، لەوانە پیترو دبیلاڤالی ئیتالیایی کە لە نێوان سالآنی (١٦١٤ – ١٦٢٦ ) دا گەشتێکی بۆ ناوچەکە کردووە ، ئەو زانیاریانەی لەبارەی کوردەوە تۆماری کردوون دروست و ڕاستگۆیانەیە [٤٤]. هەرچی گەشتەکەی ڤ. ی. کاکارای بازرگانی رووسە لەنێوان سالآنی ١٦٣٤ – ١٦٣٧ )بۆ ناوچەکە دیدەنییەکانی لەبارەی شارە

---

(٤١) رحلات ماركوبولو ، تعريب: عبد العزيز جاويد ، (مصر : ١٩٧٧) ص ص٣٦ – ٤٥.

(٤٢) بڕوانە : پیربال ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٤.

(٤٣) بۆ درێژەی بڕوانە : س. ر. بولارد ، بريطانيا والشرق الاوسط من اقدم العصور حتى عام (١٩٥٢) ، ترجمة حسن أحمد السليمان ، (بغداد: ١٩٥٧) ص ص٩–٢٥ ؛ غاليتي ، التراث الكردي ص ص٢٦٢ –٢٦٤.

Mohsen Ahmed Omer.Les Voyageurs Francais Au Kurdistan XVII exVIII ex Ixe siecles.

( ر.د.غ، جامعة سوربون، باريس ١٩٩٦ ) .

(٤٤) غالیتی : هەمان سەرچاوە . ل٢٦٧ ٢٧٠٠ ؛ شوکر مستەفا ، کوردستان لە نیگای چەند گەڕیدەیەکی رۆژئاواییەوە، تۆژینەوەیەکە لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق -- دەستە کورد – . (بەغداد : ١٩٨١ )؛ ل ٨ ، ل ١٣٢ -- ١٤١ بلاوکراوەتەوە: Omar, Ibid, p5.

کوردییەکانەوە لە کتێبەکەیدا تۆمارکردووە [٤٥] . بەڵام دیارترینی ئەو گەڕیدانەی کە بایەخێکی تایبەتی و زۆریان بە کوردستان داوە – ج . پ . تافرینەی بازرگانی فەرەنسییە کە مینۆرسکی ئاوای لە بارەوە دەڵێت : ((ئەو یەکەمین ئەوروپاییە سەردانی کوردستانی ئێران و سنەی پایتەختی کردووە))[٤٦]. تافرینە هاتۆتە کوردستان و تێبینی وردی سەبارەت بە بارودۆخی ستراتیژی ئەو رێگا بازرگانیانەی پێیدا تێدەپەڕن تۆمار کردووە[٤٧].

لە هەردوو سەدەی هەژدەیەم و نۆزدەیەمی زایینی، گەشتیار و بازرگانانی ئەوروپایی بۆ کوردستان زێدەتر بووە [٤٨]، بەڵام بەگشتی زانیارییەکانی ئەو گەشتیارانە لەلانی راستی و ناڕاستیدا پێك ناکۆکن . گەشتەوەری وا هەیە بە راستگۆییەوە، ئەوی دیویە تۆماری کردووە، بەمەش وێنەیەکی راستەقینەی ناوچەکەو دانیشتوانەکەی راگوازتووە ، کەچی هەندێکی دیکە گەشتەکانیان لە ژێر کاریگەریی بیستنی ئەو هەواڵە شێواوانە نووسیوە، کەبەر لە هاتنیان بۆ کوردستان گوێیان لێ بووە، بۆیە کە هاتوونەتە ناوچەکە هەر بە دوای شتی خراپەدا گەڕاون، هەروەك مامۆستا جەمال نەبەز دەڵێت و رایەکەشی بە نموونە و بەڵگەی جۆراو جۆر دەربڕیوە [٤٩] . هەروەها مێجەر برتنش ئاماژە بەوە دەکات کە شوێنەواری نالەباری نووسینەکانی هەندێ لەو گەشتیارانەی کە لەبارەی کوردیانەوە نووسیوە لە کۆمەڵی ئەوروپاییدا دیارە[٥٠].

---

(٤٥) بۆ درێژەی بڕوانە: ب. م. دانتسیغ ، الرحالة الروس فی الشرق الاوسط ، ترجمة و تعلیق: معروف خزندار ، ( بغداد: ١٩٨١) ص٥١.

(46) Review of Taverniers Voyages Perse. Bsos. 1931. Vol. p.787.

(٤٧) شوکرمستەفا ، چەند گەڕیدەیەکی ، لا ١٤١ – ١٥٤ . Omare, Les Voyageurs. p.5.

(٤٨) بۆ زانیاری پتر بڕوانە : موسیلیان ، بیبلیوغرفیا ؛ ج١، ص ص٧٩ – ٨٦؛ دانتسیغ الرحالة الروس، ص ص٦٧–٧١؛ جەمال نەبەز، کورتە مێژوویەکی کوردناسی لە ئەڵمانیادا ، تۆژینەوەکە لە گۆڤاری کۆری زانیاری کورد (بەغدا : ١٩٧٤ ) بە ٢ . لا ٤١٨ – ٤٢٠ بلاوکراوەتەوە.
Omar, cit ; Ibid ; pp.24-27.

(٤٩) جەمال نەبەز ؛ هەمان سەرچاوە ، لا ٤٢٧ – ٤٣١ .

(50) The Kurds. pp. 67 – 68.

### سێیەم : رووکاری سیاسیی

سەرەڕای ئەوەی لەوە پێشتر گوترا، ئەوا رۆژهەلاتناسی سەردەمی هەرە درەوشاوەی لەباوەشی گەشەسەندنی سەرمایەداری ئابووری رۆژئاوا و ئەو بنەما سیاسییەی پێیەوە بەندە، بەخۆوە بینی ، دوا بە دوای مەزنبوونی دەوڵەتە نەتەوەییەکان لە ئەوروپا و بەدوایشدا سەرهەڵدانی بزووتنەوەی دۆزینەوەی جوگرافی و کێبڕکێی بازرگانی نێوان ولاتانی ئەوروپایی، دۆخەکەی بۆ ئیمپریالیزم رەخساند . بەرژەوەندییە سیاسییەکان کەلەپوورێکی رۆژهەلاتناسی قەبەی لێ کەوتەوە ، کە مەبەستی سەرەکی لێی سەروسۆراخ کردنی بارودۆخی گەلانی ئەو ناوچانە بوو، کە دەسەلاتی دەگەیشتێ بۆ ئەوەی بە ئاسانی ملیان پێ کەچ بکات ، یانیش بۆ ئەوەی وێنەیەکی تەواو سەبارەت بە رۆژهەلات و گەلەکانی بداتە حوکمەتە رۆژئاواییەکان بۆ داڕشتنی سیاسەتێکی هەرە پێگەیشتوورو پتر خزمەت بەئامانجەکانی ئەو حوکمەتانە بکات [٥١] .

راپۆرتی بالیۆزە رۆژئاواییەکان لە ئەستەنبۆل کونسولەکان لە ولایەتە عوسمانییەکان هەر لە سەدەی شازدەیەمی زایینییەوە بە یەکەمین نموونەی رۆژهەلاتناسی سیاسیی دەژمێردرێت [٥٢] ، لە وانەش ئەو راپۆرتانەی کەکنسولی کۆماری ڤێنسیا لە ئەستەنبول بۆ حوکمەتەکەی دەنارد، کە چەند ئاماژەی سەبارەت بە بارودۆخی ولاتی کوردەواری تێدایە کە بووە بنەمای داڕشتنی سیاسەتی ئەو کۆمارە بەرانبەر بە دەوڵەتی عوسمانی [٥٣] .

بە زێدەبوونی بەرژەوەندییەکانی ئەورووپا لە دەوڵەتی عوسمانیو ولاتی ئێراندا، ژمارەی تۆژینەوە رۆژهەلاتناسییەکانیش زێدەتر بوون ، ڕووسیای تەزاریش لە پێشەوەی ئەو ولاتە ئەوروپایانە بوو کە چاوی فراوانخوازی لە سەر حیسابی ولاتانی دراوسێوە. لە وانەش کوردستان، کردبوّوە . هەر لە دەستپێکی

---

(٥١) بۆ زانیاری پتر بڕوانە : ناجی ، تطور الاستشراق ، ص٢٦ .

(٥٢) روبیر منتران : الاستشراق الفرنسي اصوله تطور افاقه ، ترجمة: یوسف حبي ، توێژینەوەیەکە لە گۆڤاری الاستشراق ،( بەغداد :١٩٨٧ ) ، ع٢ ، ص٢٣ ، بلاوبۆتەوە .

(٥٣) غالیتی : التراث الکردي ، ص ص٢٦٥ -- ٢٦٦ .

سـەردەمی پەترۆسـی گـەورە (١٧٠١ — ١٧٢٥) و دوای ئـەویش کـاترینی دووەم (١٧٦٢ — ١٧٩٦) سیاسـەتی رووسـیا، خـۆی لـە گەیـشتن بـە ئـاوە گەرمـەکان بەرجەستە دەکـرد[٥٤]. سـەرزەمینی قـەوقاز (دەروازەی ئاسـیا) لـە پـشتیەوەش کوردسـتان، ئـەو پـردە بـوو کـە دەبوایـە رووسـیا بیبڕێـت بـۆ گەیـشتن بـە ئامانجـەکانی ، جـا بـەری یەکـەمین بالیۆزخانـەی رووسـیا لـە ئەسـتەنبول دووبەڵگەنامـەن، کـە بـاڵیۆزی رووسـیا بـێ . ئـە . تولـستوی وەسـفێکی وردی هەندێ ناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانی بـە وڵاتـی کوردەواریـشەوە کـردووە [٥٥] . هەروەها کنسولە رووسیەکانیش لە ویلایەتە جیاجیاکاندا راپۆرتیان سەبارەت بە دەولـەتی عوسـمانی بـەرز دەکـردەوە کـە زانیـاری زۆرو پـڕ بایـەخیان لـەبارەی کوردستان تێدا بوو [٥٦] .

دەکرێ ئاماژە بە چالاکی دبلۆماسییە رووسەکانی ناوچـەکە خـۆی بکـەین ، ئە. ژابای کنسولی رووسی لەئەرزەرۆم لەسەروبەندی کـاری دبلۆماسـی خـۆی لـە نێـوان سـاڵانی (١٨٣٦ — ١٨٦٨) ئـەو هەلـەی قۆزتـەوە تـا پـەیوەنـدی لەگـەڵ هەنـدێ زانـای کـورد بکـات و چـەندین دەستنووسـی کـوردی دەسـت بخـات و پێـشکەشی ئـەکادیمیای پەترسـبۆرگ کـرد لـە سـەر داوای ب . دورنـی رۆژهەڵاتناس. ژابا بە هاوکاری ئەو زانایانە کۆمەڵێك وتاری ئامادە دەکرد [٥٧] .

---

(٥٤) بۆ درێژەی بڕوانە : سهیل فرح، الاستشراق الروسی نشأته ومراحله التأریخیة ؛ توێژینەوەیەکە لە گۆڤاری (الفکر العربي) ، (بیروت : ١٩٨٣) ، ع٣١ ، ص ص٢٢٥ — ٢٦٥ ؛ بڵاوبۆتەوە .

(٥٥) غالیتی : التراث الكردي ، لا ٧٢ — ٧٧ ؛ کمال مظهر ، کردستان فی سنوات ؛ لا ٥٣ — ٥٦ .

(٥٦) بڕوانە : خالفین؛ خەبات ، لا٥٧—٣٦ ؛ کمال مظهر، کردستان ڤ سنوات ؛ ص ص٥٣— ٥٦ .

(٥٧) بۆ زانیاری پتر بڕوانە : م. ب. رودنکو ، احمدی خانی؛ مم و زین ؛ (موسکۆ: ١٩٦٢)، لا ٥ —٦؛ ئەوڕەحمانی حـاجی مـارف لەبـارەی کـوردناسییەوە لە رووسیـاو یـەکێتی سۆڤیـەت. تۆژینەوەیەکە لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ؛ (بەغدا : ١٩٧٤) ؛ بەرگی ٢، ل٥١٣ ، بڵاوکراوەتەوە ؛ کەمال مەزهەر ، مێژوو؛ لا ١٢٧ — ١٣١ .

بارودۆخی ناوچە کوردەوارییەکان؛ لایەنێکی گرنگی ئەو راپۆرتانەن کە مفەوەزییەی رووسی لە ناوچەکە سەبارەت بە کێشەی سنوور [٥٨] ، هەروەها لەبارەی شەڕی قرم ئامادەی دەکرد [٥٩].

هەرچی ئینگلیزە ئەوا بەمەبەستی دەستەبەرکردنە بازرگانییەکانیان و دۆزینەوەی بازاڕ بۆ بەرهەمی زێدە لە پێویستی خۆیان، بایەخیان بە کوردستان دا ، بۆیە دبلۆماسییەکانیان روویان لە ناوچەکە کرد، نەخاسما دوای دامەزراندنی خانەی کۆمپانیای هیندی رۆژهەڵات لە بەغدا ساڵی (١٨٠٦ )، وەك كلوديس . ج ريچی [٦٠]، بەرپرسی کۆمپانیاکە ؛ فرایزەر و زۆرانی دی [٦١]. لە سەدەی بیستەمیشدا، دوای داگیرکردنی عیراق لە سەروبەندی شەڕی یەکەمی جیهانیدا دبلۆماسییە ئینگلیزەکان لە کارەکانیان بەردەوام بوون، وێڕای یاداشتنامە دبلۆماسییەکانیان لەبارەی ناوچەکە و راپۆرت و لێکۆڵینەوەکانیان لە جاران پترتر بوون، بایەخێکی تایبەتیشیان بە ناوچەی کوردەواری داوە ، بەو پێودانگەی کە بەشێکی گرنگە لە عێراق [٦٢] ، بە جۆرێ ناکرێ مێژووی نوێی یا هاوچەرخی ناوچەکە بنووسرێتەوە، ئەگەر نووسینی کارگێڕە بەریتانییەکانی ئەو سەردەمە شەن و کەو نەکرێن ؛ نموونەشیان مێجەر سۆن و لونگریك و ئەدموندزو هی دیکەن . کۆمەڵەی پاشایەتی ئاسیای ناوەڕاست [٦٣]

---

(٥٨) هەر لە شەڕی چالدێرانەوە لە ساڵی (١٥١٤ ) ؛ کێشەی سنوور لە کێشە درێژەخایەنەکانی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و حوکمەتە یەك لە دوای یەکەکانی ئێران بووە . بۆ زانیاری پتر بڕوانە: خالفین ،سەرچاوەی پێشوو ، لا ٧٤ — ٩٨ .

(٥٩) ئەو شەڕە بوو کە لە نێوان رووسیا و دەوڵەتی عوسمانی لە نێوان ساڵانی (١٨٥٣ — ١٨٥٦)بەرپابوو . بڕوانە : هەر ئەوێ لا ٩٩ — ١١٨ .

(٦٠) بۆ ئاگاداری سەبارەت بەو تۆمارانەی لەبارەی ناوچەی کوردەواری و خەڵکەکەی نووسراون بڕوانە: ك . ج. ريج ، رحلة ريج في العراق عام ١٨٢٠ ، ترجمة: بهاء الدين نوری ؛ (بغداد ١٩٥١).

(٦١) بۆ زانیاری پتر بڕوانە : خالفین ، خەبات ، لا ٣٦ ، ٥٣ .

(٦٢) بۆ درێژەی بڕوانە : نجدة فتحي صفوة؛ العراق في مذكرات الدبلوماسيين الأجانب ، (بيروت: ١٩٦٩)؛ العشائر الكردية، ترجمة وتعليق: فؤاد حمة خورشيد ،(بغداد ١٩٧٩).

(٦٣) ئەو کۆمەڵەیە لە ساڵی (١٨٩٦)دامەزراوە ؛ ژمارە (١)ی گۆڤارەکەشی ساڵی (١٩١٤) دەرچووە.

(Royal central Asiatiq socaity)چاودێـــری رۆژهـــەڵاتناسی ســـیاسیی بــەریتانیای کــردووە، بــە بەڵگــەی ســەردێری ئــەو لێکۆڵینەوانــەی کــە گۆڤــاری کۆمەڵەکەیان پێ پڕکرابۆوە [٦٤] .

له دبلۆماسییه فەرەنسییەکانیش، دەکرێت ئاماژە بە کنسولی فەرەنسی لـە بەغدا ج. روسو بکەین لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەم و ئـەوەی لـەبارەی شـاری هەولێر و ئەو رووداوانەی کە لە کوردسـتان لـەو سـەردەمە قـەوماون ، نووسـیوە [٦٥]، هــەروەها ئــە .جــۆبیر ئــەوەی کــە نــاپلیۆن بــە ســەرۆکایەتی شــاندێکی دبلۆماســی بــۆ لای شــای ئێرانــی لــە نێــوان ســالآنی (١٨٠٥– ١٨٠٦)نــاردبوو ، هەرچـی لـەبارەی ژیـانی کـوردەواری لـە سـەرووبەندی رۆیـشتنی بـە ناوچـەکەدا بینیوە، تۆماری کردووە[٦٦] .

یاداشـتنامەو تێبینیـەکانی ئــەو ئەفـسەرە ئەلمانیانـەی کـە لـە سـوپای عوسمانی خزمەتیان دەکرد ، لەبارەی ناوچەکە لەوکاتی، ئەویش بایـەخی خـۆی هەیە . جا ئەوەی کە هـ . ف مولتکەی ئەفـسەری ئـەلمانی لـەو نامانـەی کـە لـە نێوان سالآنی (١٨٣٦ – ١٨٣٩) بۆ هاوسەرەکەی دەنارد، سەبارەت بە نەخـشی کـورد لـەو شـەرانەی کـە لـە ژێـر ئـالآی سـوپای عوسمـانی لەگـەلیان کـردوون نموونەیەکی دیارە لەو بوارەدا [٦٧] .

---

(٦٤) تۆژینەوەی دی هەن سەبارەت بە کوردو وڵاتەکەیان وەك :
E.B. Soan, The Southern Kurdistan, JRCAS, 1922, Vol.x. pp. 40-47;
C.J.Admonds, Akurdish Newspaper Rozhikurdistan. JRCAS, 1925, Vol.xii, pp 83-90.

(٦٥) ئەنوەر قادر محەمەد ، لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، (ستۆکهۆلم : ١٩٩٠) ، ل٢٢.

(٦٦) خالفین ، سەرچاوەی پێشوو ، ل٣٢، Omar, Les Voyageurs, p. 24.

(٦٧) بۆ زانیاری پتر بروانە: نەبەز ، کورتە مێژوویەکی ؛ ل٤٢٢– ٤٢٤

## چوارەم : رووكاری ئەكادیمی [٦٨]

كاری ئەكادیمی وای كرد بایەخ بەرۆژهەلات بدرێت ، چونكە پیاوی ئایینی یان سیاسیی بە زۆری پێویستی بە ئامادەكاری و سازدان هەیە، بۆ ئەوەی رووبكاتە رۆژهەلات، بەتایبەتی لە لایەنی زمانەوە ،رۆژهەلاتناسی ئەكادیمیش نەبێت ناتوانێت ئەو ئامادەكارییە بگرێتە ئەستۆ [٦٩].

رۆژهەلاتناسی ئەكادیمیش ئەو خوێندنەیە كە لەدام و دەزگا زانستییە رۆژئاواییەكانەوە سەرچاوە دەگرێت و ئەویش خۆی لەو زانكۆو پەیمانگایانە دەبینێتەوە كە بۆ تۆژینەوە لە رۆژهەلات و خوێندن لەبارەیەوە تەرخان كراوە . تەوەرەی ئەو بایەخ پێدانەی ئەو رووكارەش بواری زمانە(زمانەكانی رۆژهەلات)، ئەو بوارەش روخساری جیاجیای وەك بلأوكردنەوەی دەستنووس و ئامادەكردنی قاماووس و وەرگێڕان بۆ زمانە ئەورووپاییەكان و شتی دیكەش دەگرێتەوە [٧٠] .

دیرۆكی رۆژهەلاتناسی ئەكادیمی لە ئەورووپا بۆ سالّی (١٥٣٩)دەگەڕێتەوە كە تەختێك بۆ خوێندنی زمانە رۆژهەلاتییەكان لە كۆلیژی دی فرانس ( colleje de france) لە پاریس [٧١] دامەزراوە . لە سالّی (١٦٣٢)یش تەختێكی دیكە بۆ خوێندنی رۆژهەلاتی لە كمبریج دامەزرا ، مێژووی جیاوازی دیكەش هەن بۆ دامەزراندنی تەختەكانی خوێندنی رۆژهەلاتناسی لە ئەوورپا [٧٢]. لە سالّی

---

(٦٨) جێی سەرنجە لێرەو لە سەرتاپای نامەكەدا مەبەست لە (ئەكادیمی) ئەو كارە بێ كەم و كورتی و كەلێن و قوژبنانە نین .مانای ئەوەش نییە دژی توێژینەوەكانی دیكە بێت .

(٦٩) ناصر عبدالرزاق الملا جاسم ؛ المستشرق هاملتن كب دراسة نقدية لتطور مواقفه من التاريخ والحضارة العربية والاسلامية ، (ر. د. غ. الآداب )، ( جامعة الموصل : ١٩٩٨ ) ، ص١٨ .

(٧٠) يوئيل عزيز ، اللغات الشرقية وادابها في القرن السابع عشر في انكلترا ، تۆژینەوەیەكە لە گۆڤاری الجامعة ، الموصل : ١٩٧٥ : ع١ ، ص٤٦ ، بلأوكراوەتەوە .

(٧١) نجيب العقيقى ، المستشرقون ،ج١ ، ص٢٢٣ ؛ ماكسيم رودنسون ، الصورة الغربية والدراسات العربية الاسلامية ، ضمن كتاب تراث الاسلام ، تحرير شاخت وبوزورث ؛ ترجمة: محمد زهير السمهورى (الكويت :١٩٨٨) ، ج١ ، ص ص٦٢ – ٦٣.

(٧٢) بۆ درێژەی بروانە : العقيقى ، هەر ئەوێ ، ج٢ ، ص٤٥ و دواتری .

(١٧٣٢)یش ئەکادیمیای زانستی رووسی لە سەر دەستی پەتروسی گەورەی تزاری رووسی دامەزرا بایەخێکی لە ئەندازە بەدەری بە خوێندنی زمانە رۆژهەلاٌتییەکان و مێژووی ئیسلامەتی بەشێوەیەکی تایبەت دەدا [٧٣] .

ئەوانەی دواتر هاتنە سەر تەختی خوێندنی رۆژهەلاٌتی، بایەخیان بە بلاٌوکردنەوەی دەستنووسە رۆژهەلاٌتییەکان و ئامادەکردنی قامووسی زمانەوانی داوە، بۆ نموونە ئەدامۆندِ کاستل ((مامۆستا لە کمبردیج)) قامووسێکی گەورەی دە زمانی رۆژهەلاٌتی بە زمانی کوردیشەوە ، ئامادەکردبوو [٧٤] .

بە شێوەیەکی گشتی لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەیەم تا کۆتایی سەدەی هەژدەیەم، سستییەك لە بواری خوێندنی رۆژهەلاٌتی بەریتانی دەبینرێت[٧٥] . بەپێچەوانەوە سەدەی دوایی، زۆربوونی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا لە رۆژهەلاٌت پالٌی بەو دام و دەزگایانەوە نا کە سەروکاریان بە رۆژهەلاٌتەوە هەبوو توێژینەوەکانیان فراونتر بکەن و لە سالٌی (١٨٢٨) یەکەمین تەختی خوێندنی رۆژهەلاٌت لەزانکۆی لەندەن دامەزرا [٧٦] ، لە سالٌی (١٨٣٢) یشدا هەنگاوێکی یەکجار گرنگی بە دامەزراندنی کۆمەلٌەی پاشایەتی ئاسیایی (Royal Asiatic Society) هەلٌهێنا کە گورێکی تازەی بە توێژینەوە رۆژهەلاٌتناسییەکانەوە بەخشی [٧٧]، کە هەموو ئەوانەی بایەخیان بە رۆژهەلاٌت دەدا لە ژێر ئالاٌی خۆی کۆکردبۆوەو گۆڤارەکەش تا ئێستا دەردەچێت، بە مانای تۆژەر و ئارەزوومەندان بە یەکەوە دێت، تۆژینەوەی زۆری لەبارەی

---

(٧٣) فرح ، الاستشراق الروسی ، ص٢٢٣.

(٧٤) بۆ زانیاری پتر بڕوانە : یوئیل عزیز، اللغات الشرقیة ، ص٤١ .

(٧٥) لە بەر ئەوەی خەریکی کێشە ناوخۆییەکانی ململانێی نێوان پاشایەتی وپەرلەمان بوون . بۆ زانیاری پتر بڕوانە : ب . م . هولت من رواد الدراسات العربیة في انكلترا أدوارد بوكوك ، ترجمة یوئیل عزیز . توێژینەوەکە لە گۆڤاری الاستشراق، (بغداد :١٩٨٧) ،ع٢ ، ص٣٠ بلاٌوبۆتەوە .

(٧٦) العقیقي ،المرجع السابق ، ج٢ ، ص٤٣٣ ، جحا ، دراسات العربیة ،ص٣٢.

(٧٧) العقیقي ، نفسه ،المستشرقون ، ج٢ ، ص٤٣٣ .

کوردناسی تێدا بڵاوکراوەتەوە [٧٨].

بـەڵام لەگـەڵ ئـەوەش بەریتانییـەکان ،هەرکـە چـوونە نـاو سـەدەی بیـستەم، خۆیـان بـە دواکـەوتوو بینـی لـەو بـوارەدا، لەچـاو ئـەو هـەموو کۆلۆنیانـەی کـە هـەیانبوو، بۆیـە قوتابخانـەی خوێنـدنی ڕۆژهـەڵاتی و (ئەفریقیایی)[٧٩] (The school of oriental and African studies) لـە زانکـۆی لەندەن لە ساڵی(١٩١٧)[٨٠] دامەزرا . وەك لەو توێژینەوانـەی کـە لـە گۆڤارەکـەی ئـەو قوتابخانەیـەدا بڵاوکراونەتـەوە دیـارە ، ئـەوا بایـەخیان بـە کوردناسـییش داوە[٨١].

بەڵام لە ڕووسیادا ، هۆکاری ئـەکادیمی و سیاسـیی تێکـەڵ بەیـەك دەبـن ، ڕووسـیا لـە نێـوان وڵاتـانی ئـەورووپایی، تاکـە وڵاتـە کـە سـنووری ڕاسـتەوخۆو دوورودرێژیان بە ڕۆژهەڵاتەوە هەیە ، یەکەمین ئامۆژگـای زانـستی کـە بایـەخ بـە توێژینەوەی ڕۆژهەڵات بدات لە ساڵی (١٧٢٤) بە فەرمانی تزاری ڕووسیا دامـەزرا، بە دامەزراندنی موزەخانـەی ئاسـیاش لـە پەترۆسـپۆرگ سـاڵی (١٨١٨) بازنـەی بایەخدان بـە ڕۆژهـەڵات فراوانتربـوو . زانکۆکـانی خـارکوڤ سـاڵی (١٨٠٣) و قـازان سـاڵی (١٨٠٤) و پەترسپۆرگ سـاڵی (١٨١٩) و پاشـان بـاکۆ، کەوتنـە جموجـۆڵی ئامادەکردنی توێژینەوەی هەمەجۆر لەبارەی گەلانی ڕۆژهەڵاتەوە [٨٢].

---

(٧٨) بۆنمونە :

E. B .Soan. Asouthern Kurdish Folksong in Kermanshan dialect. JRAS 1909. January، pp.35-51; C. J، Edmonds، suggestions for the use of the Latin character in writing Kurdish، JRAS. January. pp.27-46.

(٧٩) لە ساڵی (١٩٣٧) (ئەفریقیا)ی خرایە سەر .

(٨٠) بۆ درێژەی بڕوانە: الملا جاسم؛ کب، ص ص٢٥ – ٤٢؛

The Open in Cermony، Bsos،1917-1920.vol.i.pp.24-32.

(81) G R. Driver The Religion of the Kurds، Bsos، 1922، Vol.ii،pp.197-203; B.Nikitine Kurdish storees: from My colledion،Bsos. 1926-28 Vol.iv pp.643-650 D.N. Makenzie، Gender Kurdish، BSOAS،1954، Vol.xvi، pp.528-541.

(٨٢) بۆ درێژەی بڕوانە : مجموعة المستشرقين الروس ، تأريخ الاستشراق ((الدراسات العربية والكردية في العراق الاسيوي ومعهد الدراسات الشرقية في لينغراد (١٨١٨ – ١٩٦٨) ، ترجمة وتعليق:

کۆنترین کاری ئەکادیمی لە بواری کوردناسی لە رووسیا ( ئامادەکردنی قامووسێکی بەراوردکاری بوو لە ساڵی (١٨٧٨) بۆ چەند زمانێکی رۆژهەڵاتی بە زمانی کوردیشەوە [٨٣] لەلایەکی دیکەشەوە بۆ یەکەمین جار رۆژهەڵاتناسی رووسی ق . زێرنۆڤ کتێبی (شەرەفنامە)ی[٨٤] لە نێوان سالانی (١٨٦٠ – ١٨٦٢) بلأوکردەوە ، پاشان شارموای رۆژهەڵاتناس بۆ زمانی فەرەنسی وەریگێڕاو و بە پەراوێز لێدانەوە لە نێوان ساڵانی ( ١٨٦٨ – ١٨٧٥ ) بلأوی کردۆتەوە[٨٥] .

هەر لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم، ئەکادیمیای زانستی بەپێی بەرنامەیەکی تۆژینەوەی رێك و پێك، بەری تۆژینەوەکانی لەگەڵ کورد کردو لەئاکامی ئەمەشدا، بنکەیەکی زانستی و مادی پەرەسەندووی تۆژینەوەی ئەتنۆگراڤی کوردی لەرووسیا پێك هات[٨٦] . لەم بوارەشدا تۆژینەوەی ئەمانە دێنە پێشەوە : ئە . خودزکو ، پ . پیرزین ، پ . لیرخ ، ڤ . یوستی ، س . یەگیزاروڤ و پاشان .ن.ی . مار[٨٧] .

جێی گوتنە شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ( ١٩١٧ ) گۆڕێکی تازەی بە تۆژینەوە رۆژهەڵاتییەکان بەخشی و بایەخدان بەم بوارە بەئەندازەیەکی زۆر پتر بوو، بۆ تێگەیشتنی قوولتر لە زمان و گەلانی رۆژهەڵات[٨٨] . بۆ ئەم مەبەستەش

---

معروف خزندار ، (بغداد : ١٩٨٠) ؛ العقيقي ((المستشرقون ، ج٣ ، ص ص٥٣ – ٥٧ ؛ ماكسيم رودنسون ، الصورة الغربية ، ص ص٧٧ – ٧٨ .

(٨٣) مینورسکی ؛ الاكراد ، ص٤٥ ؛ حاجی مارف ، لەبارەی کوردناسییەوە ؛ ل٥٠١ .

(٨٤) شەرەفنامە: لە سەرچاوە بڕواپێکراوەکانی توژینەوەی مێژووی کوردە، میر شەرەفخانی بدلیسی (١٥٤٣ – ١٦٠٣) کورد بە فارسی نووسیوویەتی. بۆ زانیاری پتر بڕوانە : کەمال مەزهەر ، چەند لاپەڕەیەك لا ٢٥ – ٣٦ .

(٨٥) بۆ زانیاری پتر لەبارەی کاری رۆژهەڵاتناسان سەبارەت بە کتێبی شەرەفنامە. بڕوانە: کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك؛ لا٢٥–٣٦؛ حاجی مارف؛ لەبارەی کوردناسییەوە، لا١٢٥ – ٥١٤ .

(٨٦) کمال مظهر ، کردستان ڤ سنوات الحرب ، ص ص٥٨ – ٦٤ .

(٨٧) بۆ درێژەی بڕوانە : موسیلیان ؛ بیبلوغرافیا ؛ ج١ ؛ ص ص٥١ – ٥٤ ؛ ٨٥ .

(88) V . Minorsky، oriental studies in USSR، JRCAS، 1943،Vol.xxx ،p.81.

دام و دەزگا و پەیمانگای نویّ دامـەزران[٨٩] ، سـەبارەت بـە کوردناسـییش ئـەوا سـالآنی سـی و چـلەکان، نەوەیـەکی پـسپۆری بـواری کوردناسـی هێناکایـەوە . ئەویش لەبەرئەوەی ی. ئوربیلیی رۆژهەلآتناس و زانای رووس، بەدرێژایی بیـست سالآن، سەرپەرشتی ئەو نەوەیـەی لـەکوردی رووسـیا خۆیـان – کـرد لـەزانکۆی لینینگـراد، لــەزمانی کـوردی و هـــەموو بوارەکــانی دیکــەی کوردناسـیـان کۆلّییەوە[٩٠] .

لەو رۆژگارەی کە ئەو کارگێڕی ئامۆژگاکە بوو بەکۆشـش و فـەرمانی ئـەو، بەشتێکی سەربەخۆ بۆ کوردناسی لە رۆژی ( ٢٨ ی شوباتی ١٩٥٩ ) دامەزرا[٩١] . جێی ئاماژەیە ئەو بەشـە یەکـەمین بەشـی سـەربەخۆیە کـە بەتـەواوی خـەریکی کوردناسـییە، نـەك هـەر بەتـەنیا لەرووسـیا، بـەلّکو لـە سـەرتاپای ئـەورووپاش ، چـونکە کوردناسـی لەهـەموو ئامۆژگـاو زانکۆکـان هـەر لەگـەل ئێراننـاسـی دەخوێندرا. لەلایەکی دیکـەوە بەشـی ئێرانناسـی لەمۆسـکۆ و یـەریڤان و بـاکۆ ، دەیـان تـۆژەرەوەی رۆژئـاوایی و رۆژهـەلآتیان دەرچـواند، کـە دواتـر جلّـەوی سەرۆکایەتی بزاڤی تۆژینەوەیان گرتە دەست[٩٢] .

جێی گوتنە ژمارەیـەك دەستنووسـی کـوردی لەئەرشـیفی ئـەو ئامۆژگایانـە هەلّگیراون . بـۆ نموونـە زانکـۆی پەترسـبۆرگ پـتر لـە هەشـتا دەستنووسـی لـە

---

(٨٩) بۆ زانیاری پتر بڕوانە : قەناتی کوردۆ؛ ئۆربیلی و کوردناسی ، و : ئاورەحمانی حاجی مارف، تۆژینەوەکە لەگۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ؛ ( بەغدا : ١٩٧٥ )؛ بەرگ ٣ ، ب١ ، لا ١١٣ – ١٤٢ ، بلآوکراوەتەوە .

(٩٠) هەمان سەرچاوە ، لا ١١٦ – ١١٧ ؛ مجموعة المستشرقین ؛ تأریخ الآستشراق ، ص٢٤١ .

(٩١) مجموعة المستشرقین ، تاریخ الآستشراق ؛ص ص٢٤٥ – ٢٤٦ .

(٩٢) بۆ درێژەی بڕوانە: مجموعة المستشرقین ؛ تأریخ الآستشراق ؛ لا ٢٤٦ – ٢٥٤ ؛ حاجی مارف؛ لەبارەی کوردناسییەوە لە رووسیا ؛ لا ٥٥٤ – ٥٥٥ ؛ شکری خودو ، کوردولوجیا ، ترجمة حازم عبد القادر الباشا . وتارەکە لەگۆڤاری لالش ؛ ( دهۆك : ١٩٩٩ ) ، ع١٠ ؛ ص ص٦ – ١٢ بلآوکراوەتەوە.

ئەرشیفی خۆی هەڵگرتووە[٩٣]. جگە لە ئامادەکردنی قاموسی جۆراوجۆر کە دیارترینیان ئەو کارەی فەرمانبەرانی بەشی کورد لە زانکۆی لینینگراد بوو، بۆ دانانی قاموسێکی کوردی – رووسی ، کە دەوروبەری سی هەزار وشەی کوردی لە دوو تۆی خۆی کۆکردۆتەوە[٩٤] .

هەموو ئەمانە وایان لەرووسیا کردووە، ببێتە بەردەسیلەی کوردناسی ، هەر لەوبارەیەوە مینۆرسکی دەڵێت : (( هەرچەندە گەڕیدەی رووسی بۆ کوردستان کەمن ... بەڵام بە شانازییەوە دەتوانین بڵێین کە بێشکەی تۆژینەوەی زانستی لەبارەی کوردەوە وا لە رووسیایە .. ))[٩٥] . لە شوێنێکی دیکەشەدا دەڵێت : (( کوردناسی رووسیا ( دراسات کوردیة ) لەدەرەوە دانی پێدانراوە ، بۆیە دەبینین کە کاری زانا ئەلمانییەکان ... وەئەستۆی ئەکادیمیای ئێمە خراوە، بۆ چاپکردنی ، بەو جۆرە هەموو کارە زانستییە بەکەڵکەکانی لەمەڕ کورد لای ئێمە بوون لە پیترۆگراد ))[٩٦] .

ئەوە گەواهی مینۆرسکییە لە دەیەی دووەمی سەدەی بیستەمدا ، جا کوردناسی دوای ئەو هەموو پەرەسەندنانەی کە روویاندا، دەبێ چۆن بێت ، نەخوازە ئەو پەرەسەندنە خێرایەی لە ئاکامی کاری بەردەوام سەرچاوەی گرتووە کە گرنگترین هۆکارەکانی ئەمانن :

أ – هاوسێیەتی کوردستان بۆ سنووری رووسیا ، کە لەوێیەوە رووسیا رەت دەبێت بۆ ئەو ناوچانەی پشتەوەی؛ کە چاوی لێیانە .

ب – بوونی ژمارەیەکی باشی کورد لەرووسیا .

---

(٩٣) کەمال مەزهەر ، چەند لاپەڕەیەك ، لا ٣٠ – ٣١ ؛ جەودەت هوشیار ، کەلەپووری کوردی لە گەنجینەکانی پترسبۆرگدا . وتارەکە لە گۆڤاری ( رامان ) ، (هەولێر : ٢٠٠٠) ژ٤٣؛ لا ١٥ – ١٦، بڵاوکراوەتەوە .

(٩٤) بۆ درێژەی پتر بروانە : معروف ، موجز تأريخ وضع القواميس ، ص ص٧٢٠ – ٧٤٢ .

(٩٥) الأكراد ، ص ص٥٤ – ٥٥ .

(٩٦) نفسه ، ص ٤٨ .

ج – دەرکەوتنی زاناو تۆژەری کورد خۆیان، کە دیارترینیان کوردۆیڤ بوو، پاشان بووە سەرۆکی بەشی کوردناسی، دوابەدوای ئوربیلی لەساڵی ١٩٦١[٩٧]. هەروەها ئە . شامیلۆڤ و جاسمێ جەلیل و .... چەندانی دیکە[٩٨].

ئەلمانیا سێیەمین گۆشەی گرنگ بوو لەجیهانی رۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیدا، لەرووی چۆنیەتییەوە. ئەو نێردە زانستییە ئەلمانیایانەی کە لەسەرەتای سەدەی بیستەم نێردراونەتە کوردستان، نەخشی زۆریان لە دەولەمەندکردنی بزاڤی تۆژینەوەی مێژوویی بە کەرەستەی زانستی بەنرخ هەبوو[٩٩]. ئەمەندە بەسە، ئاماژە بەو ئەکادیمی و مامۆستا بەرزانە بکەین کە بەشدار لەو نێردانە بوون، لەوانە ئوسکارمان ، ئەدوارد سخاو ، ئە . پیترمان ، م . هارتمان کە هەشتاو نۆ دەستنووسی کوردیان دەست خستبوو، ئەمە سەرباری ئەو تۆژینەوە بە نرخانەی لەبارەی زمانی کوردی، دوای گەڕانەوەیان بۆ ئەلمانیا[١٠٠]. نووسیوویانە ، دیارترینی ئەوانەش ، ت . نولدکە و ئە . کریستینسین و م . پیتنر بوون[١٠١].

لەسەر ئاستی جیهانیش ئەرکی زۆربەی رۆژهەڵاتناسان سەری گرت بۆبەستنی کۆنگرە رۆژهەڵاتناسییە نێو دەوڵەتییەکان ، هەر لەسەرەتای ساڵی (١٨٧٣) وە لەپاریس و تاوەکو ساڵی ( ١٩٧٦ ) ، سی کۆنگرەیان لە شوێنی

---

(٩٧) مجموعة المستشرقين : تأريخ الأستشراق ، ص٢٤٧ .

(٩٨) نفسه ، ص ص٢٤٦ – ٢٥٦ ؛ مارف خەزنەدار ؛ کوردناسی لەروسیا ، چاوپێکەوتنێکە رۆژنامەی (وڵات) لە رۆژی ١٠ ی حوزەیرانی ١٩٩٦ لەگەڵی کردووە، ژ ١٦٦ ، ل ٥ .

(٩٩) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: نەبەز ؛ کورتە مێژوویەکی ؛ ل ٤٣٨ و دواتر .

(١٠٠) نەبەز ؛ کورتە مێژوویەکی ، لا ٤٣٨ ؛ موسیلیان ؛ ببيليوغرافيا الدراسات الكردية ؛ ( موسكو: ١٩٦٣ ) ؛ ل ١٣٩ .

(١٠١) نەبەز ؛ هەمان ؛ لا ٤٤٠ – ٤٥٤ .

جیاجیای جیهاندا بەستووە[١٠٢]؛ جێی سەرنجە کوردناسی هەمیشە دەخرایە ناو لیستی ئەو تۆژینەوە و نووسینانەی کە لەو کۆنگرانەدا دەخوێندرانەوە[١٠٣] .

رووخسارێکی دیکەی هاوکاری نێوان رۆژهەڵاتناسان، دەرکردنی ئینسکلۆپیدیای بەناوبانگی ئیسلامی ( Encyclopaedia of Islam ) بوو کە چاپی یەکەمی لەنێوان سالانی ( ١٩١٣ – ١٩٣٦ ) دەرچوو و چاپی دووەمیشی سالی ( ١٩٥٤ ) دەرچوو و هێشتاکەش تەواو نەبووە[١٠٤]. و کوردناسی بەشێکی گرنگی وتارەکانیەتی[١٠٥] .

**پێنجەم : رووکاری ئەدەبی :**

ئەگەر لەو تۆژینەوەو کارانەی رۆژئاوا سەبارەت بە رۆژهەلات کردوویانە، رابمێنین جۆرە کارێکمان دەکەوێتە بەرچاو کە ناکرێت بیانخەینە نێو ئەو دابەشکردنەی پێشوو ، چونکە ژمارەیەکی زۆر کاری هونەری و ئەدەبی هەن بەسەیرو سەمەرەیی و کەسایەتیەکانیان شەقلی ئەندێشەیان پێوە دیارە و چەردەیەك راستیان لەخۆ هەلگرتووە، ئەوا سروشیان لە رۆژهەلاتەوە وەرگرتووە .

کوردستانیش بە مێژووەکەی و کورد بەکەسایەتییەکانەوە و ئەو رووداوە دیارانەی کە لەسەر خاکەکەی روویان داوە خەیاڵ و ئاوەزی هونەرمەندان و ئەدەبیانی وروژاندووە ، ئاماژە کردن بەشەری ئەربیلای بەناوبانگ، کە لەنێوان

---

(١٠٢) العقیقی، المستشرقون ، ج٣ ، ص ص٢٦٥ -- ٢٧٠ ؛ جحا ، الدراسات ، ص ص٢٧٨ – ٢٨١ .

(١٠٣) بۆ نموونە :

A . Safrastian, The Kurdes. Broceedings of the xvii. International congress of Orictalists of Oxford.1928.p.78: Bakaoyov. "Monnaies de Daisam ibn Ibrahim Al-Kurdi".1960.xxv.pp.154-159.

(١٠٤) بروانە : العقیقی ؛ المرجع السابق ؛ ص ص٢٧٠ - ٢٧٢ .

(١٠٥) بۆ نموونە بروانە: نووسینەکانی مینۆرسکی لە پێرستی کارەکانی؛ لەم تۆژینەوەیەدا لەپاشکۆ.

سوپای یۆنـان و سـوپای فـارس لەسـالّی ( ٣٣١ پ . ز ) بـەرپابوو ، بەسـە کـە ڕۆژئاوا بە هێمای سەرکەوتنی خۆی دەزانی بەسەر ڕۆژهەلاّتدا[١٠٦] .

دوای ئـەوە نـۆرەی کەسـایەتی نـاودار سـەلاحەدینی ئەیوبییـە ( ٥٣٢ ك / ١١٣٧ — ١١٩٣ ز ) کە ناودارترین کەسایەتی ڕۆژهەلاّتە کە لە ڕۆژئاوادا ناسـراوە و پێی سەرسام بوون ، شـەڕەکانی لەگـەل ڕیـچاردی یەکـەم ( ٥٥٢ — ٥٩٦ ك / ١١٥٧ — ١١٩٩ ز ) ناسراو بە شێردلّ ( قلب الأسد )، بابەتی تـابلۆ هونەرییـەکان و داستانە شیعرەکان بوو لە ڕۆژگاری چاخەکانی ناوەڕاستدا[١٠٧]. بەهۆی ڕۆمانی (الطلـسم)ی ڕۆماننووسـی ئیـسکۆتلەندی سـیر والتەرسـکوت کـە سـەلاحەددین تـەوەرەی ڕووداوەکـانی ڕۆمانـە بەناوبانگەکـەی بـوو، ئـەو پالّەوانـە پـتر نـاوی کـرد[١٠٨]، هــەروەك هـ . کپــی ڕۆژهەلاّتناســی بــەریتانی ئامــاژەی پێــدەکات و دەلێت:(( سەرچـاوەیەکی ڕۆژهەلاّتناسـییە دەتوانێـت زۆر یارمـەتیمان بـدات بـۆ تێگەیشتن لە ڕۆژهەلاّت ))[١٠٩].

دوابەدوای پتـەوبوونی پێوەنـدی نێـوان ئـەوروپا لەسـەدەی نۆزدەیـەم لـەو سـەرەو ئاسـان بـوونی جموجـۆلی دەریـاوانی بـە کردنـەوەی نۆکەنـدی سـوێس لەسالّی ( ١٨٦٩ ) لەسەرەکەی دیکەوە، ئەوا ژمارەی هـاتنی ئەوروپاییـەکان بـۆ ڕۆژهــەلاّت زۆر زێــدە بــوو، کــە هونەرمەنــدو ئەدیبیــشیان تێــدا بــوو، لــەکاتی گەڕانـەوەیان بـۆ ئـەوروپا تـابلۆو چـیرۆکی وایـان لەسـەر ڕۆژهــەلاّتی دێـرین لـە

---

(١٠٦) بڕوانە: فەرهاد پیربالّ ، دراسات في التأريخ الكردی ، ترجمة: تەرزە فائق جاف ، ( بیروت : ١٩٩٨ ز ) ، ص ص١٠٥ — ١٠٦ .

(١٠٧) بۆ درێژەی بڕوانە : ناصر عبد الرزاق الملا جاسم ، صلاح الدين الأيوبي في القصص الرومانسية الفرنسية و الأنكليزية ، تۆژینەوەیەکە لە گۆڤاری (مركز الوثائق و الدراسات الأنسانية )، (جامعة قطر : ١٩٩٦ ) ع٨ ، ص ص٢٧١ — ٢٨٥، بلاّو بۆتەوە .

(108) Lanepoole، Saladin and the fall of the king-dom of Jerusalem. (London: 1898) pp.332-340.

(١٠٩) الملا جاسم ، كب ، ل ١٨ .

خورجی خۆیـان ئـاخنی بـوو، وێنـەی شـارو کەسـایەتی و نـاودارانی کوردیـشی تێدابوون[١١٠] .

هەرچی سەبارەت بـە بـواری ئەدەبیـە ئـەوا ڕۆمـانی ڕۆماننووسـی ئـەڵمانی کارل مای بەناوی ( گوزەر بە کوردستانی شاخاویدا ) نەخـشی پێـشەنگانەی لـە ناساندنی کوردو کوردستان نەك لەنێو ئەڵمانیان بەتـەنیا، بـەڵکو لەسەرانـسەری ئەوروپادا بینی[١١١] .

پێویـستە ئامــاژە بــەوەش بکــەین کــە ئــەوکارە هونــەر و ئەدەبیانــە بەئەندازەیەکی زۆر بەشداریان لە دروسـت کردنـی وێنـەی ڕۆژئـاوا سـەبارەت بـە ڕۆژهەڵات کردووە، تەنانەت سەرچـاوەی بنـەڕەتیان لـەبارەی بڵاوکردۆتـەوە کـە بـواری تۆژینـەوەی زانـستی و ورد و دروسـت بـوونی تێـڕوانین و بـیرو بۆچـوونی قووڵتر و بەڵگەدارتری ڕەخساند[١١٢] .

ئەوانە دیارترین رووکارە ڕۆژهەڵاتناسییەکان بوون سەبارەت بە تۆژینەوەی ڕۆژهەڵات بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی کە تائێستاشی لەگەڵ دابێ ڕواڵـەت و شـوێنەوارەکانی لــە مەیدانـدا مــاون . بۆیــە هـیچ لــەجێی خـۆی نییـە کەیـەك هەڵوەستمان لەبەرانبەر کاری ڕۆژهەڵاتناسان و ڕەوتی ڕۆژهەڵاتناسیدا هـەبێت ، یان پەسند کردنی بێ بەربەرچدانەوە ، یانیش بەربەرچدانەوەی بێ مەرج ..

---

(١١٠) بۆ ئاگـادار بـوون لەهەندێ لەو کارە هونەرییـانە. بڕوانـە: فەرهـاد پیربـاڵ، وێنەی کـورد لەئەرشیفی کوردناسە ئەوروپییەکاندا ( هەولێر : ١٩٩٩ ) .

(١١١) بۆ زانیاری پتر بڕوانە : نەبەز ، کورتە مێژوویەکی ؛ ل ٤٢٠ .

(١١٢) ماکسیم رودنسون؛ الصورة الغربية؛ ص ص٤٦ – ٤٧ ؛ الملا جاسم؛ صلاح الدين الأيوبي؛ ص٢٨٠.

# بەشی یەکــەم

سەربردەی مینۆرسکی ڕۆژهەڵاتناس (١٨٧٧ – ١٩٦٦ز)

یەکەم : هەواری رووسیا ( ١٨٧٧ – ١٩١٩ )

دووەم : هەواری فەڕەنسا (١٩١٩ – ١٩٣٢)

سێیەم : هەواری بەریتانیا ( ١٩٣٢ – ١٩٤٤ )

مینۆڕسکی ڕۆژهەڵاتناس و خوێندنگای لێکۆڵینەوەی ڕۆژهەڵاتی

چوارەم :هەواری خانەنشینی ( ١٩٤٤ – ١٩٦٦)

## بەشی یەکـەم

## یەکەم :هەواری رووسیا ( ١٨٧٧ – ١٩١٩ )

### أ – لەدایك بوونی :

ڤلادیمیر ڤیـودوروڤیچ مینۆرسـکی لـە رۆژی دووشـەممەی رێکـەوتی پێنجـی شوباتی ساڵی (١٨٧٧ )لە شارۆچکەی کورجیڤای هەڵکەوتووی بەشـی بـاکووری خۆرئـاوای مۆسـکۆ لەسـەر کـەناری رووبـاری ڤولگـا لـەدایك بـووە ، بـاوکی ڤیودوروڤیچ و دایکیشی ناوی ئولکانی کولوبتیسکییە[١١٣] .

### ب – پێگەیشتنی :

مینۆرسکی لەمۆسکۆ پێگەیشت و دەستی بە خوێندنی کرد ، سـەرەتایی و پاشان دواناوەندی تەواوکردو لەبەر ئەوەی بەپلەی نایاب سـەرکەوتبوو، خـەڵاتی زێرینـی وەرگـرت[١١٤] و لـەزانکۆی موسـکۆ لـە کـۆلیجی مـاف لـە سـاڵی (١٨٩٦) وەرگیراو لە ساڵی ( ١٩٠٠ ) [١١٥]یشدا تەواوی کـرد . ئـارەزووی تایبـەتی خـۆی و پێویـستی وڵاتەکـەی تێکیـان کـردەوە و چـووە ئامۆژگـای خوێنـدنی زمانـە رۆژهەڵاتییەکانی لازاریف لەهەمان ساڵ لە موسکۆ[١١٦] .

---

(١١٣) سید حسن تقی زادە ، در رثای مینورسکی ، وتارەکە لەگۆڤاری راهنمائی کتاب ، ( تهران : ١٣٤٥ هـ . ش ) . ج ٩ ، ش ١ ، ل ٣ بلاو بۆتەوە ؛ مجتبی مینودی ، یاد بروفیسور ولادیمیر مینورسکی ، وتارەکە لە گۆڤاری راهنمائی کتاب ، (تهران : ١٣٤٥ هـ. ش )؛ ج٩ ؛ ش١ ؛ ل١٥ بڵاوبۆتەوە ؛ محمد دبیر سیاقی ؛ مرگ مینورسکی ، وتارەکە لەگۆڤاری سخن ؛ (تهران : ١٣٤٥ هـ. ش ) ، ش ٣ ، ل ٣٢٢ بڵاوبۆتەوە .

D. M. Lang . The obituary of Vladiner Vidrovitich Minorsky BSOAS، 1966، vol.Xxv، p.694.

(114) Lang ، Lbid .

(١١٥) مسعود رجب نیا ، استاد مینورسکی ، وتارەکە لە بڵاوکراوەی کتابخانەی ملی تبریز ، (تبریز : ١٣٤٥ هـ. ش) ش ١٠ ؛ ل ٨٢ بڵاوبۆتەوە ؛ ڤ ئی ئەباییف ، بیرەوەری مینورسکی ، وتارەکە لەگۆڤاری هەواڵەکانی ئەکادیمیای زانستی سۆڤیەتی ، زنجیرەی ئەدەب و زمان ، ( موسکۆ ١٩٦٧:) ب ٢٥٠ . ژ ٢٥ . ل ٣٩٨ ( بەزمانی رووسی بڵاوبۆتەوە ) .

(١١٦) تقی زادە ، سەرچاوەی پێشوو ؛ ئەباییف . هەمان .

ج – مامۆستاکانی :

مینۆرسکی سێ ساڵی لە ( ١٩٠٠ – ١٩٠٣ ) ی لە ئامۆژگای لازاریف(١١٧). بەسەربرد ، هەر لەوێش چاوی بەو ڕێگایەدا کرایەوە، کە لەتەواوی ژیانی خۆی پێیدا ڕۆیشت و بەری نەدا ، ئەویش ڕێگای تۆژینەوەو لێکۆڵینەوەی زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان و لك وچڵە جۆراوجۆرەکانی بوو. لەو ئامۆژگایەدا زمانی فارسی و تورکی و عەرەبی لەسەردەستی لێهاتووترین مامۆستای رووسی و بیانی خوێند ، مینۆرسکی فارسی(١١٨) لەسەردەستی مامۆستایان ف . ئە . کورش و میرزا جەعفەر محللاتی و عەبدوڵڵا غەفاروفی خاوەنی قامووسی فارسی – رووسی خوێند ، کە مینۆرسکی(١١٩). زۆری پێدا هەڵدەڵێ. هەروەها لەسەردەستی مامۆستا بارون ر. ستاکلبرکیش . بە سەرپەرشتی دوکتور ستافروس ساکوڤ و مامۆستا س . دزریونیان زمانی تورکی خوێند(١٢٠) . هەرچی زمانی عەرەبی(١٢١). بوو، ئەوا بە سەرپەرشتی ئە . ی. کریمسکی زانای رووسی خوێندو قوتابیەکەی سەبارەت بە مامۆستاکەی دەڵێت ئەو ((خزمەتێکی مەزنی بە عەرەبناسی لە رووسیادا کردووە))(١٢٢). ، هەروەها مامۆستا میخائیل یوسف عەتایاش دەرسی پێ گوتووە ، هەر لەو ئامۆژگایەدا مێژووی ڕۆژهەڵاتی نزیکی لەسەردەستی مامۆستا ڤ . میللری پسپۆر لە ڕەچەڵەکی زاراوەکانی کەناری ڕۆژئاوای دەریای قەزوین(١٢٣) خوێندووە .

د – چالاکییەکانی لەرۆژگاری خوێندنی لە ئامۆژگای لازاریف :

لەساڵی یەکەم وەك بەرنامەی خوێندنی، پاژێکی نامیلکەی تیودور نولدکەی

---

(١١٧) مینوی ، یاد بروفیسور ، ل ١٥ . Lang, The obituary, p. 694.
(118) Idid;C.E.Bosworth، Iran and Islam،(Idinburgh:1971)Preface،P.V.
(119)Oriental،P.92.
(120) Lang OP.cit.; Bosworth،OP.cit .
(121) Lang، Ibid.
(122) Minorsky، OP.cit.
(123) Ibid.

ڕۆژهەڵاتناسی ئەلمانی ناودار بەناوی ( پێشەكییەك بۆ زمانە سامییەكان )[١٢٤]. بەسەرپەرشتی مامۆستا میللر لە دەقە ئەسلییە ئەلمانییەكەوە وەرگێرا . واپێدەچێت ئەو كارە تا ئەو ئەندازەیە نایاب و بەرز بووبێت كە وای لەمامۆستا كریمسكی كردووە، بەخۆی بۆ بڵاوكردنەوە، ئامادەی بكات .

لە هاوینی ساڵی ( ١٩٠٢ ) یەكەمین جار سەردانی ئێرانی كرد[١٢٥]. ئەویش هەروەك بەرنامەی خوێندنی ئامۆژگا ، ئەوەش ئاسۆیەكی فراوانی بۆ تۆژینەوە بۆ كردەوە ، نەخاسما توانی خۆ بخزێنێتە ناو جیهانی ئاڵۆزی تایفەی ئایینی هەق و توانی لەتاران كۆمەڵێك سەرچاوەی بەنرخی زۆر دەگمەنی بەدەست بكەوێت و توانی سەروساختێكی پتەویش لەگەل پەیرەوانی ئەو تایفەیە دابمەزرێنێت [١٢٦].

مینۆرسكی لە گەشتەكەی بەردەوام بوو ، سەردانی ئاسیای بچووكی كردو بۆ ئەو ئاسایی بوو، وەك كابرایەكی رووسی سەروسۆراخی ئەو رووسانە بكات كە كەوتبوونە ژێر باری فەرمانڕەوایەتی سوڵتانی عوسمانی ، بەرهەمی ئەو گەشتەشی ئامادەكردنی لێكۆڵینەوەیەك بوو، كە لە موسكۆ بە ناوونیشانی (سەردانێك بۆ قۆزاقی[١٢٧] رووس لە ئاسیای بچووكی پەیرەوانی سولتانی عوسمانی ) بڵاوكردەوەو پاشان لە كتێبێكی سەربەخۆدا چاپی كردووە[١٢٨] .

---

(١٢٤) بڕوانە: پێرستی كارەكانی مینورسكی كە لە : مجتبی مینوی وایرج افشار ، یادنامه ایرانی مینورسكی ، ( تهران : ١٩٦٩ ) ، پێشەكی ، بڵاو بۆتەوە . هەروەها لە :
V. Minorsky, Iranica, (Tehran: 1964), pp. XII – XXVI. لەسەرجەم نامەكەدا بە دەستەواژەی ( بڕوانە: پێرست ) سەرنجی خوێنەر بۆ هەردوو پێرستەكە رادەكێشین بۆ ئەو تۆژینەوانەی كە نەكرا بەدەستیان بێنین .

(125) V. Minorsky, Iranica, p.vii.

(١٢٦) مینورسكی ، أهل الحق ، دائرة المعارف الأسلامیة ، ط ١ ، ج ٥ ، ل ١٤٧ .

(١٢٧) قۆزاق بەروسی بە ( كازاك ) واتە ( خەڵكی ئازاد ) گۆ دەكرێت ، بەرەسەن ئەو جووتیارانەن كە لەرووسیاو پۆلۆنیا لەنێوان هەردوو سەدەی یازدەیەم و هەڤدەیەمی زایینی لەئاكامی پێرەوی دەرەبەگایەتی هەڵاتوون و لەناوچەكانی ئاسیای بچووك نیشتەجێ بوونە . بۆ زانیاری پتر بڕوانە : ئەلیكسەندەر پۆشكین ، گەشتێك بۆ ئەرزەرۆم ، وەرگێرانی مارف خەزنەدار ، ( سوید : ١٩٩٥ ) ، ل ٩٨ .

(١٢٨) بڕوانە : پێرست .

وا دیاره ئەوکاره ئەوەنده بەبایەخ بوو بێت ڕۆژهەڵاتناسی گەورەی رووس ڤ. پارتولد[129]. گفتوگۆی لەسەر کردووه ، ئەوەش سەرەتای پێوەندی مینۆرسکی بوو بەو ڕۆژهەڵاتناسەکە، هەمیشە شانازی بەشاگردبوونی خۆی لەسەر دەستی ئەو دەکرد[130]. هەرچی سەردانەکانی بوو بۆ ئەستەنبول، سەرەتای پێوەندی راستەوخۆی بوو بە ئەدەبی میللی تورکی و لەو شتە بایەخدارانەی کەسەرنجی راکێشاون و پێی وابوو شایەنی ئەوەن رووسەکان بیزانن ، ئەویش (ئامرازەکانی رابواردنی میللی بوو لە قوستەنتەنییە )[131].

مینۆرسکی ساڵی ( ١٩٠٣ ) خوێندنی تەواوکردووه و خەرمانی چالاکییەکانی ئامۆژگای، تەواوکردنی سێ تۆژینەوه بوو کە هەموویان بڵاوبوونەتەوه[132]. و بەسەر هەرسێ لەو تەوەرانە دابەش بووه، کەلە ئامۆژگا دەیخوێند، ئەوانیش فارسی و تورکی و عەرەبی بوون . لەفارسیدا تۆژینەوەکانی لەبارەی چالاکییە فارسییەکانی ئەودیوی قەوقاز بوو ، لە تۆژینەوەی تورکیشدا ساغ کردنەوەی کتێبێك بوو لەبارەی زمانی تورکییەوە ، لە عەرەبیشدا بەهاوکاری کریمسکی مامۆستای، تۆژینەوەیەکی رەخنەیی بوو لە کتێبێکی لاتینی کۆن لەمەڕ ڕێزمانی زمانی عەرەبی.

لەو تۆژینەوانەی پێشوودا، دەردەکەوێت زۆربەی تۆژینەوەکانی مینۆرسکی زمانەوانی ئەکادیمی بوون و هیچ ئاماژەیەك نییە کە دواتر بایەخی بە جوگرافیای مێژوویی یان ئەثنولوجیا دابێت. کەچی هەڵبژاردنی ناوچەی قەفقاس لەبەر ئەوە بووه، کە خاڵی بەیەکگەیشتنی گەلانی جیاجیا بووه، سەرباری بایەخی بۆ رووسیا. رەنگە کاریگەریی میللری مامۆستاشی لەسەر بێت، چونکە ئەو

---

(١٢٩) بروانە : پێرست .

نامەیەکی تایبەتی بەڕێز عەبدولعەزیز ئەلدوری بۆ تۆژەر لە ڕێکەوتی ٢٤ ی نیسانی ٢٠٠٠ . بروانە: پاشکۆ .

(130) Bosworth Iran. P.V.

(١٣١) بروانە: پێرست .

(١٣٢) بروانە: پێرست .

ماموستایەکی بالادەست بوو لە توژینەوە لەو ناوچەیەدا[١٣٣]. خوێندنی لەئامۆژگادا توانای رەخنەگرتنی لەلا خولقاند، چونکە – هێشتا خوێندکاری سالّی سێیەم بوو – کە رەخنەی لە کتێبێکی ئەلمانی گرت، کە لە مێژووی نوێکردنەوەی تورك دەدوا[١٣٤].

**هـ – کارکردنی لەبواری دبلۆماسی :**

خوێندنی یاساو زمانە رۆژهەلاتییەکان هەلی بۆ مینۆرسکی رەخساند بتوانێت لە وەزارەتی دەرەوەی رووسیا کاربکات . لە کونسلخانەی تەورێز دامەزراو دووسالّی[١٣٥] لیّ مایەوە، پاشان گوازرایەوە تاران و بووە سکرتێری دووەمی کونسلخانە و چوارسالّیش لەویّ مایەوە . لەتەورێز بواری بۆ رەخسا سەردانی زۆری ناوچەکانی دەوروبەر بکات بە کوردستانیشەوە[١٣٦] ، هەروا بۆشی لوا برادەرایەتی هەندیّ کەس بکات کەهەندێکیان کاریگەریی زۆریان لەسەر رەوتی ژیانیدا هەبوو ، لەوانەش ئاشنابوونی بە سەید حەسەن تەقی زادە[١٣٧] . لەسەرەتای کاری لە تەورێز لەسالّی (١٩٠٤) دا ، ئەو کابرایە نزیکترین هاورێی مینۆرسکی بوو ، بەدرێژایی ژیان سەردانی یەکتریان دەکرد و نامەیان بۆ یەکتر دەنارد و کتێبیان بەدیاری بۆ یەکدی دەنارد[١٣٨] .

---

(133) Minorsky، oriental، p.92.

(١٣٤) بڕوانە: پێرست .

(١٣٥) أباييف ، ذكرى ، ل ٣٩٨ ؛ ن . ئە . لافرينيكو ، نامەگۆڕینەوەی مینورسکی لەگەلّ زانایانی سۆڤیەت ، لە کتێبی ئێران مێژوو و رۆشنبیری سەدەکانی ناوەڕاست و هاوچەرخ ، ( مۆسکۆ : ١٩٨٠ ) ، ل ١٤٤ ،( بەزمانی رووسی )؛ Lang ،The obituary، p.625.

(١٣٦) نامەی مینورسکی بۆ عبد العلی کارنك . بڕوانە : مینورسکی تأریخ تبریز ، ترجمە: عبدالعلی کارنك،(تهران:١٣٣٧ هـ.ش)،المقدمه، ص أ ؛ نامەی مینۆرسکی بۆ تەقی زادە لە رێکەوتی ١٢/ کانوونی یەکەمی ١٩٥٦ .

(١٣٧) سەید حەسەن تەقی زادە ( ١٨٨٦ – ١٩٧٠ ) رۆشنبیرێکی دیاری ئێرانییە ، چەندین پایەی کارگێری بەرزی لەئێران وەرگرتووە ، نێوانی لەگەل هەندیّ رۆژهەلاتناس خۆش بووە .

(١٣٨) بۆ زانیاری پتر بڕوانە : تقی زادە ، بروفیسور مینورسکی؛ وتارێکە لە گۆڤاری (یغما)، (تهران :١٣٣٧ هـ . ش ) مج١٩، لا٩٨–٩٩؛ افشار ، نامەهای مینورسکی بە تقی زادە، لا ٧٠٩٧ .

بـوونی مینۆرسـکی لەشـاری نـاوبراودا، کردبوویـە نوێنـەرو هەڵسورێنەری سیاسەتی رووسیا ، هەروا بەچاوی خۆشی کوشتنی جەعفەر ئاغای شۆرشگێری کـوردی لەسـاڵی ( ١٩٠٦ ) و جـوامێری پیاوەکـانی لـە بەرەنگاربوونـەوەی دەسەلاتداران دیبوو[١٣٩] ، بۆیە پەنجەی تاوانیان بـۆ درێـژ دەکرد ، هەربۆیـەش رۆژهەلاتناسـی بـەریتانی ئـە. ج- بـراون - کەرەخنـەی لـە تـەواوی کارمەنـدانی رووس گرت - یەکێ لەوانەبوو بە توندی پەلاماری مینۆرسـکی دا ، بـەلام دوای ئەوەی براون لە نزیکەوە چاوی پـێ کـەوت ، بینـی جێـی رێـزەو لـەو بەخـەراپ هەلسەنگاندنەی پاشگەز بۆوەو بەتایبەتیش دوای ئەوەی مینۆرسکی هەلوەستی راستەقینەی خۆی لەو کێشانە بۆ روون کردەوە[١٤٠] ، بۆیە بـراون زۆر راشـکاوانە جاری بێ تاوانی دا . ئەوەش سەرەتای پێوەندییەکی پتەو بوو لەنێوان ئـەو دوو پیاوە[١٤١] . بێ گومان بێتاوان راگەیاندنی مینۆرسـکی لەلایـەن بـراون گـەواهێکی گرنگ بوو بۆ بەرز کردنەوەی پایەو شوێنی مینۆرسکی لای فارسـەکان ، چـونکە ئەوان براونیان بە زانایەکی بـەرز دادەنـاو پێیـان وابـوو گـەورەترین بیانییـە کـە خزمەتی ئێران و کەلەپوورەکەی کردووە[١٤٢] .

بەلام ئەوە رێی لە مینۆرسکی نەگرت ئەرکە دبلۆماسییەکانی بەشێوەیەکی رێك وپێك بەرێوە ببات ، وەك بەشێکی کارەکەشی راپۆرتی سیاسـیی سـەبارەت بە ئێران دەنووسی ، هەنـدێکیانی لـە گۆڤارەکـانی رووسـیا بلاوکـردەوە[١٤٣]. بـۆ ئەوەی ببێتە شێوازێکی جودای تۆژینەوەی رۆژهەلاتناسـی کـە ئـەویش شـێوازی سیاسـییە و تێیـدا وەسـفی ناوچـەکانی مەراغـەو مـاکۆ و ئـەو رێگایـەیی نێـوان

---

(١٣٩) مینورسکی ، الأكراد ، ص ص٦٥ - ٦٦ .

(١٤٠) بزووتنەوەی دەستووری : لەو سەروبەندەدا جموجۆل و پەشێوی لەدژی حکومەتی قاجاری ملهور بەرپا بوو کە بە بزووتنەوەی دەستووری ناسراوە ( ١٩٠٥ - ١٩١١ ) ، رووسیاش لاگیری سیاسەتی سەرکوتکەرانەی حکومەتی ئێران بوو لەو ئالۆزیانەدا . بۆ زانیاری پتر بڕوانە : احمد کسروی ، تأریخ مشروطه ایران، (تهران: ١٣٧٨هـ . ش) ج١، لا ٤٦٤ - ٤٦٥ ، ج٢ لا لا ٥٠؛٣٦.

(141) Lang، the obituary.pp 694-695.

(١٤٢) العقيقي، المستشرقون ، ج٣،ص ص٥٠٠-٥٠٢.

(١٤٣) بڕوانە: پێرست .

قەزوین و هەمەدان بەیەکەوە دەبەستێتەوە ، دەکات . ئەو راپۆرتانەو ئەوانی دواتریش نووسینی، بایەخێکی ئەکادیمی زۆریان بۆ مینۆرسکی لەژیانی زانستی ئەو هەوارەدا هەبووەو زانیارییەکی تۆپۆگرافی و زمانەوانی بێ هاوتای پێ بەخشی و بووە پاڵپشتێکی باشی تۆژینەوەکانی دواتری .

لەساڵی ( ١٩٠٨ ) بانگ کرایەوە بۆ پەترسبۆرگ[١٤٤] ، لەوێش هاموشۆی ئەکادیمیای زانستی رووسیای دەکرد و لەگەل ناودارترین و گەورەترین زانای رۆژهەلاتناسی ولاتەکەی ف. بارتولد[١٤٥]، پێوەندی پتەوی گرت و زۆریشی کار لێ کرد و پەیرەوی هەمان رێرەوی ئەوی لە راپەڕاندنی کارەکانی دواتری کرد . هەر لەهەمان ساڵیشدا گوازرایەوە تورکستان و بووە مولحەقی دبلوماسی کارگێری سەربازی لەوێ، ئەوەش بواری بۆ هەموارکرد خۆ بداتە مەغۆلناسی[١٤٦] .

لەساڵی ( ١٩١١ ) دا یەکەمین تۆژینەوەی بەرزی زانستی کە وەرگێرانی (سرانجام) ی کتێبی پیرۆزی تایفەی هەقەکان بوو بۆ زمانی رووسی لەگەل پێشەکییەکدا لەبارەی مێژووی ئەو تایفەو نوێشکێکی بە زمانی فەرەنسی بلاوکردەوە [١٤٧]. ئەویش لەئاکامی کاری بەردەوامی لەو تۆمارە رەسەنانەی پەیرەوانی ئەو تایفەیە لەساڵی ١٩٠٢ دۆزییەوە، بەم کارەشی نیشانەی زێڕینی لەبەشی ئەثنوگرافیای کۆمەلەی ئیمپراتۆری زانستی سروشتی لە مۆسکۆ وەرگرت . لەبەر بایەخی کتێبەکە ئامۆژگای لازاریف خەرجی بلاوکردنەوەی کتێبەکەی گرتە ئەستۆ[١٤٨] .

لەهاوینی هەمان ساڵ مینۆرسکی گەڕایەوە تورکستان بۆ ئەوەی ئەرکێکی دیکەی پێ بسپێردرێت کە کاریگەرییەکی زۆری بەسەرەوە جێهێشت ،

---

(١٤٤) تقی زاده ، بروفیسور مینورسکی: لا٩٨ ، لافرینیکو ، مراسلات ،لا١٤٤.

(145) Bosworth، Iran،p.v.

(146)Lang، The obituary.p.T 695.

(١٤٧) بروانه: پێرست .

(148) The Obituary، p. 694.

کارەکەش بەشداریکردن بوو لە کێومالّی زەوی و زاری ئازەربایجان و کوردستان لەگەل کنسولی بەریتانیا لە تەوریز شیبلی وەك پێشدەستیەك بۆ پێك هێنانی لێژنەیەکی هاوبەشی سنوور بۆ کۆتایی هێنان بە ململانێی دوورودرێژی سنووری نێوان ئێران و دەولەتی عوسمانی ، ئەو گەڕان و سوڕانە شارەزاییەکی باشی سەبارەت بە تۆپۆگرافیای کوردستان پەیداکردو سەروساختی پتەوی لەگەلّ هەندێ کەسایەتی کوردی ناوچەکە دامەزراند[149] .

لەسالّی ( ١٩١٢ ) مینۆرسکی بووە سکرتێری دووەمی بالیۆزخانەی رووسیا لە ئەستەنبۆل، بۆئەوەی لە پرۆژەی لێژنەی پێشوو بەردەوام بێت و بەشداری لە ئامادەکردنی نەخشەکان و کارە پێویستەکانی کێومالّی لەوێدا بکات[150] .

لە ئۆکتۆبەری سالّی ( ١٩١٣ ) تاتیانای شیبونیای نەوەی رۆژهەلاّتناسی گەورەی رووس سەمیرنۆڤ کە بنەمالّەیەکی بەرزی زانستی بوون، هێنا ، ئەمەش سەروکاری بە لێکۆلینەوە رۆژهەلاّتناسییەکانی رووس و پسپۆرانی پتەوتر کرد[151] . هێنانی ئەو ئافرەتە هەلّبژاردنێکی دروست بوو ، چونکە پالّپشتێکی باشی خۆشی و ناخۆشی ژیانی مینۆرسکی بوو ، خۆی دەلّێت : (( هەرچی نووسیویەتی ئەوا دەست خەتی ژنەکەی بووە ))[152] وێرای چەندین کاری کە بەیەکەوەیان کردووە[153] .

لەهەمان سالّیشدا مینۆرسکی وەك نوێنەری رووسیا لە لێژنەی چوارقۆلّی پێك هاتوو لە نوێنەری دەولەتانی عوسمانی و ئێرانی و بەریتانی و رووسیا سەرلەنوێ لەکاری گرانی دیاریکردنی سنووری عوسمانی و ئێرانی هەلّچۆوە[154] .

---

(١٤٩) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: مینورسکی، الأكراد، ص ص٥٠ — ٧٢
Iranica p.vii; Ibid.p 695.

(١٥٠) نامەی مینۆرسکی لە ١٦ی نیسانی ١٩٥٦، لە گۆڤاری آینده ، (تهران :١٣٦٧ هـ.ش)، ج١٤، ش١—٢ ،ل٧١ ، بلاّوکراوەتەوە .

(151) Bosworth، Iran،p.ix.

(152) Iranica،p.v.

(١٥٣) بڕوانە: پێرست .

(١٥٤) نامەی مینورسکی لە رێکەوتی ١٦ ی نیسانی ١٩٥٦ .

لێژنەکە لە شوباتی ( ١٩١٤ ) دەستی بەکاری دیاریکردنی سنوور کرد لە شاری محەمەرە ( خورم شەهر ) ، دەستیان پێکردو رووەو باکوور تا چیای ئارارات . لەبەرئەوەی مینۆرسکی شارەزاییەکی وردی لە جوگرافیای ناوچەکەدا هەبوو ئەوا کاریگەرییەکی زۆری لە راکێشانی سنوورەکە هەبوو تا ئەو ئەندازەیەیی هێلی سنوورەکەیان ناونا ( هێڵی مینۆرسکی )[١٥٥] .

لەئاکامی ئەو هەڵسوڕو داسوڕەی کە پتر لە هەشت مانگی خایاند ، ئاسۆی زانیاری مینۆرسکی سەبارەت بەناوچەکە فراوانتر بوو . هەروەك ( بوزورث )ی رۆژهەڵاتناسی بەریتانی ئاماژەی پێ دەکات، مینۆرسکی ببووە (( کانگایەکی لەبن نەهاتووی زانیاری کە – مینۆرسکی – هەمیشە دەیتوانی لەژیانی دواتری ئەکادیمی خۆی لێی بەرخورداربێت ))[١٥٦] . لەئاکامی هاتووچۆی بەناوچە سنوورییەکانی کوردستان ئاشنایەتی لەگەڵ خەڵکی ناوداری کورد پەیدا کردو دەستنووسی بە بەهاشی کەوتنە دەست [١٥٧].

لە شێخ قادری برای شێخ مەحمودی حەفید دەگێڕنەوە ئەندامانی لێژنەکە لە سلێمانی چاویان بە شێخ مەحمود کەوتووە و شێخیش سەبارەت بە چارەنووس و ئاکامی کوردستان لەگەڵیان دواوە . مینۆرسکی وەك نوێنەری رووسیا – گفتی پێداوە کە چەك و پارەی بداتێ لەدژی دەولەتی عوسمانی پشتگیری بکات . مینۆرسکی بەشێخی گوتووە : کە گەڕامەوە کرماشان چێشتخانەیەك لەوێ دادەمەزرێنم ، پیاوێکی جێ باوەڕی خۆتم بۆ بنێرە تا چەك و پارەت بۆ بنێرم ، بەلام کاتێ نوێنەری شێخ لەسەر گفتی مینۆرسکی چۆتە کرماشان، لوت و بزوت مینۆرسکی لە گفتەکەی پاشگەز ببۆوە، بەبیانووی ئەوەی کەوا ولایەتی موسل کەوتۆتە ناو ئەو نەخشانەی کە بەریتانیا دەستی

---

(١٥٥) سبهبند امان الله جهانبهانی ، بروفسور ولادیمیر فیودورویچ مینورسکی، وتارێکە لە گۆڤاری ( یغما ) . (تهران:١٣٤٥ هـ.ش) ، ج١٩ ،ل١٦١.

(156) Bosworth، Iran، p.vi.

(١٥٧) بۆ درێژەی بڕوانە : مینورسکی ، الاکراد، ص ص٦١–٧١ .

بەسەردا دەڕوات ، ئەوەش ڕێ لە رووسیا دەگرێت خۆ لە کاروباری ئەوێ هەڵقورتێنێ ، بۆیە نێراوەکە بە هەناسە ساردی گەڕایەوە [١٥٨].

بەڵام محەمەد رەسول هاواری نووسەر گومان لە راستی ئەو گوتەیە دەکات[١٥٩] هەرچی چۆن بێت ، ئەگەر ئەو دیاردە رووی دابێت ئەوا دامەزراندنی چێشتخانە لەلایەن دبلۆماسییەکی ئاست بەرزی وەك مینۆرسکی لەوسەروبەندەدا لەراستی دووره و بڕوای پێ ناکرێت ، چونکە ئەگەر ئەو دیدارە بووبایە ئەوا لە سەرەتای شەری یەکەمی جیهان دەبوو ، مینۆرسکی دوای تەواو کردنی کاری لێژنەکە لە ئۆکتۆبەری ساڵی ( ١٩١٤ ) یەکسەر گەڕاوەتەوە تاران[١٦٠].

مینۆرسکی گەڕایەوە وڵاتەکەی خۆی و تۆژینەوە بەناوبانگەکەی ( کوردو تێبینی و سەرنج)ی بڵاو کردەوە وپاشان گەڕایەوە تاران و لە ( ١٩١٦ ) کرایە سکرتێری یەکەمی بالیۆزخانە لەوێ و لەساڵی ( ١٩١٧ )ش بوو بە هەڵسوڕێنەری کاری بالیۆزخانە[١٦١] ـ لەو ماوەیەشدا سەری لە ناوچە کوردەوارییەکان نەبڕی[١٦٢] ، لە تارانیش چاوی بە سەعید خانی کوردستانی[١٦٣] کەوت و

---

(١٥٨) م. جمیل ڕۆژبەیانی ، شێخ مەحمود حەفیدزادە ، وتارێکە لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ، (بەغدا: ١٩٨٧)، ژ١١٣، ل٦٢-٦٣ بڵاوبۆتەوە.

(١٥٩) شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان ، ( لەندەن : ١٩٩٠ ) ، ب ١ ، ل ١٨٤ – ١٨٧ .

(١٦٠) تقی زادە ، در رثای ، ل٤؛ Lang،The obituary, p.696.

(١٦١) رجب نیا ، استاد مینورسکی ، ل٨٢ ؛ Ibid.

(162) V.Minorsky،the Guran، B SOAS،1943، vol.xl.p.98.

(١٦٣) سعید خانی کوردستانی : لە ساڵی ( ١٨٦٣ ) لە بنەماڵەیەکی کورد لە سنە لەدایك بووە ، لە ساڵی ( ١٨٩٣ ) چۆتە ستۆکهۆڵم و لەوێ زانستی پزیشکی خوێندووەو پاشان چۆتە لەندەن. دوای دووساڵان گەڕاوەتەوە وڵاتەکەی و خەریکی کاری پزیشکی بووەو بەمەش ناوی کردو چەندین نووسینی هەیە و لە ساڵی ( ١٩٤٣ ) یش لە هەمەدان کۆچی دوایی کردووە . بۆ زانیاری پتر بڕوانە: سە گفتار تحقیقي در أیین أهل حق، ترجمە: مریم جانو رزازیان ، تقدیم وتعلیق محمد علی سلطاني، (تهران: ١٣٧٨ هـ.ش) ل٦٠٦٢.

دانوستانیان سەبارەت بە مەسەلە جیاجیاکان و بە تایبەتیش لەبارەی ئەدەبی تایفەی ئەهلی هەقەوە کردووە[١٦٤] .

هەرچی سەبارەت بە بڵاوکراوەکانی نێوان ساڵانی ( ١٩١٥ — ١٩١٧ )یە ئەوا رووکاری سیاسی تێدا زەقە ، چونکە تەواوی بڵاوکراوەکانی ئەو سەردەمەی بەری گەڕان و سوڕانە رەسمی و تایبەتییەکانیەتی . سەبارەت بە راپۆرتە رەسمییەکان دوو لێکۆلینەوەی پێشکەش کرد[١٦٥] : یەکەمیان راپۆرتێکی درێژە سەبارەت بە سنووری ئێران ( تورکیا ) بەری ئەو گەشتەی بوو کە لەگەڵ نوێنەری بەریتانیا شیبلی لەساڵی ( ١٩١١ ) کردبووی ، پاشانیش راپۆرتێکی دووروودرێژبوو سەبارەت بەدوا سنوور کێشان کە لە گەشتی دووەمی ساڵی (١٩١٤) گەیشتە ئەنجام .

هەرچی دیدارە تایبەتییەکانییەتی، ئەوا چەند تۆژینەوەیەکن کە گرنگترینیان کتێبە بەنرخەکەی ( کورد )ە[١٦٦] . لە گەشتی دواییشی بایەخی بە بوارێکی دیکە داوە کە پێشتر لێی نەدواوە، ئەویش بایەخدانیەتی بە شوێنەوار، لەو هەوارەشدا دوو لێکۆڵینەوەی نووسیوەو[١٦٧] یەکەمیان ( لەبارەی شوێنەوارەکانی ماکۆ ) و دووەمیشیان تاتە نووسەکانی (کێلەشین )[١٦٨] و (تۆبزاوە ) یە لەناوچەی دەریاچەی ورمێ .

---

(164) Minorsky، op.Cit.،p.90;saeed khan، The Sect of Ahl –Haqq، MW، 1927 ،vol.xv11،p.42.

(١٦٥) بڕوانە: پێرست .

(١٦٦) مارف خەزنەدار وەریگێراوە بۆ زمانی عەرەبی ( بەغداد — ١٩٦٨ ) لەویشەوە حەمە سەعید حەمە کەریم کردوویەتە کوردی ؛ بەناونیشانی کورد تێبینی و ورد بوونەوە ( بەغدا : ١٩٨٤ ).

(١٦٧) بڕوانە: پێرست .

(١٦٨) کێلەشین : پێنج رۆژ رێ لە هەولێرەوە؛ دوورە واتە دووسەد و پەنجا کیلومەتر لە هەولێر دوورە ، بڕوانە : الحموي، معجم البلدان؛ (بیروت.د.ت)؛ ج١،ص ص٢٠١ .

## دووەم : هەواری فەرەنسا ( ١٩١٩ – ١٩٣٢ )

### أ – چالاکی دبلۆماسی :

کە شۆرشی رووسیا لە ئۆکتۆبەری ساڵی ( ١٩١٧ ) بەرپا بوو ، مینۆرسکی فەرمانبەرێکی بەرز بوو لە تاران . بە پێی بارودۆخی تازە، بووە پیاوی سەردەمی دوابڕاو (قەیسەر ) وەك دبلۆماسییەکانی دیکە – سەروساختی لەگەل زێدی خۆی بڕا ، سەبارەت بەو شۆرشە بە جهانبهانی دەلێت : ((پێویستە چاوەرێ بکەین و زۆر لەسەرخۆ بین لە بەرانبەر ئەو گۆڕانکارییە گەورانە ، لە ولاتێکی بێ پارەو سامان و بەشەڕ دابێژراو .. ئەو شۆرشە کاریگەریی بەسەر دنیاوە لە دوارۆژدا دەردەکەوێت ))[١٦٩]. لەگەل پێشبینی راست و دروستی کەچی لەدژی شۆرش و دەسەلاتی تازەی وەستا[١٧٠].

دوای دووساڵ مانەوەی لە بالیوزخانەی ولاتەکەی لە تاران ، بە هاورێیەتی جهانبهانی برادەری رووی لە پاریس کرد تا بەشداری کۆنگرەی ئاشتی لەڤرسای بکات ، بەئامانجی دەربرینی راوبۆچوونی دروست و سەرکەوتوو، بەلام لەگەل بێ هیوایی لووت و بزووت بۆوە و ئەوەی بە خەیالی دانەدەهات بەچاوی خۆی بینی[١٧١]. چونکە ولاتانی زلهێز بەرژەوەندی خۆیان کردبووە بنەمای دانانی نەخشەی سیاسەتی خۆیان و نەخشەی پێش وەختیشیان بۆ دابەشکردنی ناوچەکە سازدابوو بێ ئەوەی بەرژەوەندی گەلانی ناوچەکە بەهەند هەلبگرن .

چوار سالان ( ١٩١٩ – ١٩٢٣ ) لە بالیۆزخانەی رووسیا لە پاریس مایەوە ، هەرکە هەستی بە بێ ئومێدی بارودۆخی نوێی کرد لە رووسیا ، بڕیاریدا واز لە سیاسەت بهێنیت و روو لە جیهانی تۆژینەوەی زانستی بکات . لەساڵی (١٩٢٣) لە ئامۆژگای نیشتمانی زمانە زیندووەکانی رۆژهەلات ( Ecole National Deslangues vivantes orientale ) لەپاریس، بووە مامۆستای زمانی فارسی و تورکی[١٧٢] .

---

(١٦٩) جهانبهان : بروفيسور مينورسكى ، لا ١٦٣ .

(١٧٠) مينورسكى ، الاكراد : مقدمة المترجم ، ص٨ .

(١٧١) جهانبهانى : لا١٦٢ : Lang., The obituary p.696

(١٧٢) تقى زاده : در رثاى : ل٤ : مينوى : ياد بروفسور ،لا١٠ .

ب – تۆژینەوەکانی :

لـەماوەی هەردووسـالّی ( ١٩٢٠ – ١٩٢٣ ) مینۆرسـکی دە تۆژینـەوەی نووسیوە[١٧٣] . هەشتیان لـە پـاریس بلاّوکراونەتـەوە و دووشـیان لـە ( بـراغ ) . شەشیان بە فەرەنسی و ئـەوانی دیکەشـی بەرووسـی نووسـیوون . ئـەوەی لـەو گۆڤـارە رووسـیانەی لـە پـاریس دەردەچـن ، بلاّوکردۆنەتـەوە، بەلّگـەی روونـی گەورەیی قەوارەی ڕەوەندی رووسیایە لـە فەرەنسا، هـەر ئـەوەش هـانی دا کـە لەتارانەوە روو لە پاریس بکات .

شەقلّی بلاّوکراوەکانی دەریدەخەن کە لەو ماوەیەدا رۆژهەلاّتناسی سیاسـی سیمای سەرەکی کارەکانی بووە ، جگە لە دوو تۆژینەوە لەبارەی تایفەی ئەهلی هەق – ئەو بابەتەی کە بەری چەندین سەرچاوەی بەرووبەت بوون تـا لەسـالّی ١٩١٩ تارانی بـەجێ هێشت – هەرچـی تۆژینـەوەکانی دیکەیـەتی لـەبارەی ئـەو گێروگرفتانــە دەخولێنــەوە کـە شۆڕشــی رووســیا لــە ولاّتەکــە و ناوچــەکانی دەوروبــەری و بــەر لــە هەمووشــیان ئێــران و تورکیــا بــەدەری دابــۆوە ، تۆژینەوەکانیش ئەمانەن :

١- ئازەربایجان و کارتێکەرەکانی دەرەوەی بە زمانی فەرەنسی سالّی ١٩٢٠ .
٢- تێبینی لەبارەی ئەودیوی قەفقاس : بارودۆخی جۆرجیـا بـە زمـانی رووسـی سالّی (١٩٢١).
٣- رووسیا و تورك ( بەزمانی فەرەنسی سالّی ١٩٢٢ ) .
٤- جۆرجیا ( بە فەرەنسی سالّی ١٩٢٣ ) .
٥- رووسیاو نەوت لەبراغ بە رووسی بلاّوکراوەتەوە .
٦- کوبینۆ لە ئێران بە فەرەنسی بلاّوبۆتەوە .
٧- تیوری ئە.کر ییبیدوڤ خوێنی سامان ، لە براغ بە رووسی بلاّوبۆتەوە .
٨- پێڕەوی قەوارە بچووکەکان ( بە رووسی بلاّوکراوەتەوە ) .

---

(١٧٣) بږوانە: پێرست.

### ج– وازهێنانی لە سیاسەت و خۆتەرخان کردنی بۆ کاری زانستی :

#### ١– وانە گوتنەوەو بەشداری کردنی لە کۆنگرە زانستییەکان .

دوای ئـەوەی مینۆرسـکی لەسـاڵی ( ١٩٢٣ ) چـووە ئامۆژگـای نیـشتمانی بەتەواوی خووی دایە وانە گوتنەوەو نووسین و دانان و بڕای بڕ لێیان دانـەبڕا ، ئەو بابەتانەی کـە بایـەخی پـێ دەدان هـەر ئەوانـەبوون کـە هەمیـشە لـەئاوەزی دابوون، ئەوانیش ئەدەب و مێژووی فارسی و تورکی بـوو . بەمانـەش خەسـڵەتە راستەقینەکانی خۆی دەرخست و روخساری سیاسـی لـەخۆی دامـاڵی . دەسـتی کرد بە دروست کردنی پێوەندی و بەندیواری پتەو لەگەڵ هەندێ کەسـایەتی کـە نەخشی زۆریان لە زێدەکردن و دەولەمەند کردنی زانیارییەکانی لە رەوتی ژیـانی دوارۆژی بینی . ناسیاوی لەگەڵ هەنـدێ کەسـایەتی نـاوداری ئێرانـی وەك زانـای پایە بەرز محەمـەد عەبـدولوەهاب ئەلقـەزوینی[١٧٤] پەیـداکرد . لەسـاڵی (١٩٢١ ) یەکتریان ناسی و لەپاریس هەمیشە بەیەکەوە بوون و مینۆرسکی زۆری کەڵك لێ وەرگرت . بەدرێژایی ژیانی مینۆرسکی خـۆی بـە منـەتباری دەزانـی، هـەر بۆیـە کتێبە بەهادارەکەی (سنووری جیهان)[١٧٥] . کەپێشکەشی ئەوی کردووە دەڵێـت:

---

(١٧٤) عەبدولوەهاب ئەلقەزوینی لەساڵی ( ١٨٧٥ ) لەتاران لەدایك بووە و لەساڵی ( ١٩٤٩ ) یش هەر لەوێ کۆچی دوایی کردوە ، زانایەکی هەرە ناوداری ئێرانە : لەتەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا سەردانی ئەوروپای کردووەو لە لەندەن و پاریس و ئەلمانیا ماوەتەوەو لەگەڵ گەورە رۆژهەڵاتناسەکانی ئەو وڵاتانە ناسیاری پەیداکردووە ، چەندین نووسراوی هەن . بۆ زانیاری پتر بڕوانە : علی اکبر دهخدا ، لغت نامه دهخدا، تحریر محمد معین وسعید جعفر شهیدی؛ (تهران:١٣٣٤ش)،ج١١ ، ل ١٥٤٩١ .

(١٧٥) چیرۆکی دۆزینەوەی ئەو دەستنووسەی بۆ سەرەتای بیستەکان دەگەڕێتەوە؛ لەو وەختەوەی کە چلەنامەیەکی بۆ عەباس ئەفەندی سەرۆکی تایفەی بەهایی لە ئێران لە ١٣ ی کانوونی یەکەمی ١٩٢١ نووسی ، تێیدا باسی نەخشی رۆژهەڵاتناسانی وەك براون و توماسکی لە چوونە نێو ناخی ئەو تایفەیەوە دەکات ؛ هەر کە بێوەژنی توماتسکی ئەو چلەنامەیەی خوێندبووەوە ، پێوەندی لەگەڵ مینۆرسکی دەگرێت و پێی رادەگەێنێت کە مێردەکەی لەم دواییانەدا مردووەو دەستنووسی ( سنووری جیهان ) یش لای ئەو پارێزراوە، کە پیاوەکەی بەدەستی کەوتبوو ؛ جا بەیەکەوە رێککەوتن بۆ رووسیای بنێرن . بۆ زانیاری پتر بڕوانە :
Hudud Al-Alam،Translated and Explined by V.Minorsky، (London: 1937)،pp.viii-xi.

(( دەستەواژەی پێشکێشی کتێبەکە، قەرزباریم بۆ زانای مەزنی فارس سەنگین تر دەکات کە بەدرێژایی پازدە ساڵی برادەرایەتیمان ، دڵاواو بەخشندە بوو، لەسەدان گرفتاری زانستی کە دەهاتە پێشم، دەستی یارمەتی بۆ درێژدەکردم، گفتوگۆی دوورودرێژو بەکەڵکی هەمیشەیمان یەکێکە لە خۆشترین بیرەوەرییەکانی ژیانم ))[(١٧٦)].

لەساڵی ( ١٩٢٩ ) و لەماڵی زانای ناودار ئەلقەزوینی کوڕە لاوی ئێرانی مجتبی مینویشی ناسی[(١٧٧)] کە لەهەمووان پتر کەوتبووە ژێر کاریگەریی مینۆرسکی و بووە هاوڕێ و برادەرو نزیکی و هەر لەگەڵ ئەویش سەردانی پاریس و لەندەن و روما و ئەلمانیا و رووسیا و تەنانەت ئەمریکاشی کرد[(١٧٨)].

وێرای چالاکییە زانستییەکانی، بە بەشدار بوون لە کۆڕو کۆنگرە رۆژهەڵاتناسییەکان ، لەساڵی ( ١٩٢٣ ) بەشداری گۆنگرەی زمانەوانی جیهانی لە لەندەن کرد[(١٧٩)] . باسێکی لەبارەی تایفەی هەقە ئامادەکردو دایە لێژنەی ئامادەکاری ئەو کۆنگرە رۆژهەڵاتناسییە جیهانییەی کە لە ساڵی ( ١٩٢٨ ) لە ئۆکسفۆرد بەسترا ، بەڵام بەبێ هیچ هۆیەك نەچووە کۆنگرەکە[(١٨٠)] .

لە ساڵی ( ١٩٣٠ ) مینۆرسکی کرا بە سکرتێری رۆژهەڵاتی پیشانگای هونەری فارسی کە لە لەندەن رێك خراو شەش مانگی خایاند ( ئابی ١٩٣٠ — کانوونی دووەمی ١٩٣١ ) بە چاودێری رەزاشای پەهلەوی خۆی[(١٨١)] ، هەلبژاردنی بۆ ئەو پایەو شوێنە بەڵگەی رێزلێنانی ئێرانییەکان بوو بۆی و

---

(176) Hudud AL-Alam، p.xix.

(١٧٧) مجتبی مینوی:( ١٩٠٤ — ١٩٧٧ ) توێژەرێکی گەورەی ئێرانی و مامۆستای زانکۆی تاران بوو، چەندین پلەوپایەی بەرزی لەناو ئێران و دەرەوەی وەرگرتبوو ، پاش مردنی خانووەکەی کراوەتە کتێبخانەیەکی گەورە و نووسەر سەردانی کردووە و بینوویەتی ؛ لەبارەی ژیانی بروانە: لغت نامە،ج١١٣ ، لا ١٩٤٥٤ .

(١٧٨) یاد بروفیسور ، لا ٩،١٠ .

(179) Minorsky، Iranica، P.xi.

(180) Proceeding of the xvii Intenational congress of orientalists of oxford، 1928،p.84.

(181) Lang، The obituary، P.696.

نەمانی هەستی رق و کینە تۆزی بەرانبەری ، هۆیەکەشی دڵنیا بوونیان بوو لەوەی کە بەراستی خۆشی دەوێن . هەروەك براونی رۆژهەڵاتناس جەختی لەسەر دەکاتەوە – باسەکەی سەبارەت بە کێشەی مووسڵ کە ساڵی ( ١٩٢٦ ) بڵاوبۆتەوە و سەرلەنوێ جەخت لەسەر هاوسۆزی بۆ ئێران کردەوە – دواتر دێینەوە سەری ، ئەوە سەرەڕای شارەزای قوولی لەبارەی ئێرانناسی لێهاتوویی خۆی بە راپەراندنی ئەو کارانەی کە پێی سپێردرابوون لە پیشانگاکە و گوتنەوەی وانەی بە نرخ ، سەلماند ، ئەمە سەرباری بەشداربوونی لە ئامادەکردنی رابەری پیشانگا(١٨٢) . وا دیاربوو نەخشی لە پیشانگاکە جێی سەرنج بوو ، تا ئەو ئاستەی کە سیر دینسونی رووسی رۆژهەڵاتناس داوای لێ کرد لە بەریتانیا نیشتەجێ ببی و خەریکی وانەبێژی بێت لە قوتابخانەی رۆژهەڵاتناسی ، توانی مینۆرسکی و خێزانەکەی رازی بکات و پاریس بەجێ بهێڵن و بچنە لەندەن(١٨٣) .

کە کۆنگرەی رۆژهەڵاتناسی جیهانی لە ساڵی ( ١٩٣١ ) لە لیدن بەسترا ، مینۆرسکی بە بابەتێك لەبارەی ( تۆژینەوەی مێژوویی و جوگرافیایی لەبارەی فارسەکانەوە تاوەکو ساڵی١٩٣١)(١٨٤) بەشداری تێداکرد ، ئەو بابەتەی نیشانەی بەدواداچوون و سەروسۆراخی وردی هەموو ئەو شتانەیە کە لەبارەی مێژوو و جوگرافیای فارسەکان دەرچوو بوو . هەر لەهەمان ساڵیش بەشداری لە کۆنگرەی زمانەوانی جیهانی لە جنێف کرد(١٨٥) .

**٢– دانراوەکانی** : سەرنجدان لە چالاکی دانان و نووسینی مینۆرسکی لەو هەوارەدا دەریدەخات کەوا تۆژەرێکی چەند پڕ کۆشش و بە برشت بووە ، لەو ماوەیەدا سێ کاری تۆژینەوەو وتاری جیاجیای نووسیوە ، سەرباری پێداچوونەوە بەو کتێبانەی پسپۆران لەبارەی رۆژهەڵاتناسی بڵاویان کردۆتەوە ، وێڕای بەشداری چالاکانەی لە ئینسکلوپیدیای ئیسلام .

---

(182) Ibid.
(183) Ibid. pp.696-697: Bosworth. Iran.p.vi.
(184) Minorsky. Iranica. P.xi.
(185) Ibid.

لە ساڵی ( ١٩٢٤ ) دوو تۆژینەوەی ئەکادیمی نووسیوە[١٨٦]، یەکەمیان بەناوی ( ئێرانناسی لە فەرەنسا ) ، دووەمیان لەبارەی ( ڕۆژهەڵاتناسی لە رووسیا ) . لە ساڵی ( ١٩٢٥ ) یش دووبابەت[١٨٧] ، یەکیان بەناوی (ئەفغانستان) و دووەمیان بەناوی ( هند ) بڵاوکردەوە . هەر لەهەمان ساڵیشدا دام و دەزگا ئەکادیمییە گەورەکانی ڕۆژهەڵاتناسی دانیان پێداناو لەلایەن ئامادەکارانی ئینسکلوپیدیای ئیسلام راسپێردرا وتاری ئەکادیمیی لەبوارەکانی کوردناسی و فارسیناسی و تورکناسی بنووسێت . لەو حەوت ساڵەی کە لە پاریسی بەسەربرد حەفتاوسێ وتاری نووسی ، بە سەرنجدان لەو وتارانەی[١٨٨] رەهەندە بنچینەکانی نووسەرمان بۆ دەردەکەوێت ، کە دەکرێت دابەشیان بکەینە سەر :

أ- **وتارە جوگرافیاییەکان** : لە هەرێم و شارو جێگاو مەڵبەندی جیاجیا دەدوێن.

لە ساڵی (١٩٢٥) وتاری لەبارەی ( سحنە و ساین قەلاو سەقز و سەلماس و سەرپیل زهاو و ساوە و سابلاخ و سنە) بڵاوکردۆتەوە .

لە ساڵی (١٩٢٦) یش دوو وتاری لەبارەی شارەزوورو شکی بڵاوکردۆتەوە. هەر لە ساڵی (١٩٢٧) یش وتاری لەبابەت شوغنان و شولستان و کوردستان و سیبسر و سیسر سۆمای بڵاوکردۆتەوە . هەروەها لە ساڵی (١٩٢٨ ) یش لەبابەت لاهیجان و لانکوران و لینکا و لورستان و سلێمانی و سولتان ئاوا و سولتانییەو سنقر و تەورێز و سلدوز بڵاوکردۆتەوە .

لەساڵی ( ١٩٢٩ ) یش سەبارەت بە میافارقین و ماکۆ و مەلاتییە ومندوماند و تاروم و تاسوج و تارانی نووسیوە . کەچی لەساڵی ( ١٩٣٠ ) لەبارەی مەنسییەو مەراغە و مەرەند و ماردین و تەفلیس نووسیوە . هەروەها لە ساڵی (١٩٣١ ) دوو وتاری لەبارەی مازندەران و تورکمانچای نووسیوە .

---

(١٨٦) بروانە: پێرست .

(١٨٧) بروانە: پێرست .

(١٨٨) نووسەر هەموو ئەو وتارانەی پەیداکردووە کە لە ئینسکلوپیدیای ئیسلام بڵاوبوونەتەوە، بۆ ئەوەی لە پەراوێزەکان بێزار نەبن؛ بروانە: پێرست.

بایەخی ئەو وتارانە لەوەدایە کە ئـەو ناوچـانە پێـشتر هـیچ رۆژهەڵاتناسـێك ئاوڕی لێ نەداونەتەوە — لای کەم لەو ئینسکلوپیدیایە — بە ئەندازەی یەکەمیش بایەخی داوە بە جوگرافیا و تۆپۆگراڤیای ئـەو هـەرێم و مەڵبەنـدو شـارانە و ئـەو گۆڕانە مێژووییانـەی کـە بەسـەریاندا هـاتوون ، بـەر لەمـەش، هـەر وتـارێکی بـە لێکۆڵینەوەیەکی ورد سەبارەت بە بنچینەی ناوی شوێنەکە دەست پێ کردووە .

ب- وتارە مێژووییەکان :

١- وتارەکانی لەبارەی هۆزو رەگەزی جۆراوجۆر :

لە ساڵی ( ١٩٢٥ ) لە بارەی شەبەك و شـکاك و شـقاقی نووسـیوە، لەسـاڵی (١٩٢٧) یش لەبارەی کوبان و کوبەو کورد و سنجاوی و لەسـاڵی ( ١٩٢٨ ) یـش لە بابەت لەك و بەنولام و لارولاز و لولی و لوڕی نووسیوە . لەسـاڵی (١٩٢٩) یـش وتارێکی لەبارەی تات نووسیوە .

جێی سەرنجە کە لەگەل ئەوەی تازەکارەبوو لـەو دەزگایـە، کەچـی هەرچـی نووسین لەبارەی کوردوکوردستانەوە بـوو بـەو سـپێردرابوو . رەنگـە هۆیەکـەی باش شارەزابوونی راستەوخۆ ناوچەکە بووبێت . یانیش بەپلـەی یەکـەم زانیـاری ناو وتارەکانی گرانبەهاو بە شێوازێکی زۆر جوان رێك خرابوون . ئەوە جگـە لـەو تۆژینەوانەی لەبارەی تایفەی ئەهلی هەقەن .

٢- ناودارانی مێژوو :

لەسـاڵی (١٩٢٥) لـەبارەی سەمـسام سـەلتەنەو لـە سـاڵی (١٩٢٧ )یـش سەبارەت بە خـەتائی و کوتولخـان و لەسـاڵی ( ١٩٢٨ ) یـش وتـارێکی لـەبارەی سوڵتان ئیسحاق و لە ( ١٩٢٩ ) یش لـەبارەی باباتـاهیر و تـەهمـورث و تـەوەکل کوڕی باز و لەسـاڵی ( ١٩٣٠ ) یـش لەبابـەت تیمورتـاش و تـەغاتیمور و لەسـاڵی (١٩٣١) یش دوو وتاری لەبارەی مەسمەغان و مازیار ، نووسیوە .

## ٣- بنەماڵە کوردە فەرمانڕەواکان :

مینۆرسکی دوو وتاری لەساڵی ( ١٩٢٨ ) سەبارەت بە لوڕی گەورەو لوڕی بچووك نووسیوە . هەنگاوی دووەمی سەقامگیر بوونی بەرزی پایەی مینۆرسکی لە دنیای تۆژینەوەی ئەکادیمی، کە هێشتا هەر لەسەرەتای کایەکەدا بوو، بۆ ئەرکێکی یەکجار گرنگ و دیار راسپێردرا بوو، ئەویش بەشداریکردنی بوو لە ئینسکلوپیدیای بەریتانی بە وتارێك لەبارەی زمانە ئێرانییەکان و ئەدەبی فارسی[١٨٩] .

ئەوەی تێبینی دەکرێت مانەوەی کاریگەریی پاشماوەی رۆژهەڵاتناسی سیاسییە بەسەر هەندێ لە نووسینەکانی لەو هەوارەدا کە دوو لێکۆڵینەوەی نووسی[١٩٠] ، یەکەمیان بەناوی (سیاسەتی دەرەوەی جۆرجیا ) بەزمانی رووسی و دووەمیان لێکۆڵینەوەیەك بووە بەزمانی ئینگلیزی کە تێیدا سەری کردبووە سەر کێشەیەکی گەرمی ئەو رۆژە ئەویش ( کێشەی مووسڵ) بوو . ئارنولد ویلسنی رۆژهەڵاتناسی بەریتانی لەئاست ئەو تۆژینەوە سەنگرایەوە بۆ شەن و کەوکردنی و لەبارەیەوە دەڵێت : (( نوێشکێکی سەرکەوتووانە و تۆژینەوەیەکی پڕ ئەرك و قووڵی بەڵگەنامە بڵاوکراوەکانە ))[١٩١] ، بەڵام بەوە تاوانباری دەکات کە بەلای ئێراندا دایشکاندووە[١٩٢] .

لەساڵی ( ١٩٢٨ ) جارێکی دیکە، گەڕاوەتە سەر تۆژینەوەی تایفەی ئەهلی هەق بۆ تەواوکردنی کارەکانی پێشووی ، باسێکی نوێی بە ناوونیشانی (لێکۆڵینەوە لەبارەی تایفەی ئەهلی هەق : توماری)[١٩٣] پێشکەش کرد. لەساڵی دواتریش بە لێکۆلینەوەیەکی ئەکادیمی لەبارەی ( وەسفی بەڵگەنامەکانی

---

(189) Iranian Languages ans Persian Literature، EB،14th Edition، vol،x11، pp.586-587، pp.607-610.

(١٩٠) بروانە: پێرست .

(191) Review of Minorskycs thc Mosul Qucstion،JRCAS،1926،vol.x111، pp.397.

(192) Ibid.

(193) Etudes sur les AHLi-HAQQ،Revue de Histoiro des Religions، Janvicr، 1928، tome.xcvll، No.I، pp.90-105.

پەهلەوی لە دەربەند)[194] لە گۆڤاری ئاسیایی ( Journal Asiatique ) دەستی بە بڵاوکردنەوە کردەوە . لەساڵی ( ١٩٣٠ ) یش بابەتێکی دیکەی بەناوی ( ناوی دوین لە ئەرمینیا)[195] نووسی، بەدواشیدا لەهەمان ساڵ لێکۆڵینەوەیەکی درێژی سەبارەت بە ئەودیوی قەفقاس نووسی[196] . هەرچی ئەو لێکۆلینەوانەی خوێندبێتەوە بۆی دەردەکەوێت کە نووسەرەکەی بایەخێکی زۆری بەناوی شارو شوێنە جوگرافیاییەکان داوە ، لەمەشدا سوودی زۆرچاکی لە زانینی زمانە رۆژهەڵاتییەکان و زارە جیاجیاکان وەرگرتووە، بەتایبەتیش زارەکانی ناوچەی قەفقاس .

لەو ماوەیەدا مینۆرسکی سێ کاری ئەکادیمی لەبواری کوردناسی نووسیوە، لەساڵی (١٩٣٠ ) دا وتارێکی بەناوی ( کتێبەکانی قوتابخانە بە کوردی )[197] بڵاوکردەوە ، ئەمەش بەڵگەی ئاگاداری مینۆرسکییە لەو پەرەسەندنانەی کە بەسەر بزاڤی خوێندن و رۆشنبیریدا هاتوون لە کوردستان . لەو وتارانەی کە لە رۆژانی پێشەنگای هونەری ئێراندا پێشکەشی کردووە ، وتارێك بووە لەژێر ناوونیشانی ( برونزی لوڕستان ) لەهەمان ساڵی ( ١٩٣١ )[198] دا بڵاوی کردەوە ، لێکۆلینەوەیەکی دیکەشی بەناوی ( قەرەجی لولی و لوڕ لە ئێران )[199] نووسیوە.

هەر لەو رۆژگارەدا چەندین لێکۆلینەوەی[200] لەبواری فارسیناسی نووسیوە، لەساڵی (١٩٢٩) یش باسێکی بەزمانی ئەلمانی بەناوی ( کاری وەرگێران بۆ فارسی ) بڵاوکردەوە . لەساڵی داهاتووش لەگەل ج. وێلسنی

---

(١٩٤) بڕوانە: پێرست.

(١٩٥) بڕوانە: پێرست .

(١٩٦) بڕوانە: پێرست .

(197) Livres Scolaires en kurde، Revuedes etudes Islamques، 1930-I، pp.157-160.

(١٩٨) بڕوانە: پێرست .

(١٩٩) بڕوانە: پێرست.

(٢٠٠) بڕوانە: پێرست.

ڕۆژهەڵاتناس باسێکی لەبارەی ( بیبلیوگرافیای ئێران) نووسیوە . هەر لەساڵی ( ١٩٣١ ) یش باسێکی لەبارەی دوو دەستنووسی فارسی نەناسراو نووسیوە . هەر لەو ساڵەدا وتارێکی بەناوی ( مزگەوتی فیرامین ) بڵاوکردەوە. دەستەی نووسەرانی ئینسکلوپیدیای کولیری نیشتمانی دانیان بە گیانی ئەکادیمی لێکۆلینەوەکانیدا نا، کاتێ کە داوایان لێ کرد وتارێك لەبابەت ( زمانە ئێرانییەکان ) بۆ ئینسکلوپیدیا بنووسێت . ئەو گفتەی کە لەساڵی (١٩٢٨ ) لەکاتی چلەی ج. مارکوارتی[٢٠١] ڕۆژهەڵاتناس دابووی، گەیاندە جێ و بیبلیوگرافیایەکی دووروودرێژی لەبارەی کارەکانی ئامادەکردو لەساڵی (١٩٣٠)دا[٢٠٢] بڵاوی کردەوە.

لە کۆتاییشدا هەر لەو ڕۆژگارەدا مینۆرسکی بە دوازدە[٢٠٣] کتێبدا چۆتەوە کە بەزمانەکانی ڕۆژئاوایی یان ڕۆژهەڵاتی نووسرابوون ، ئەوەش بەڵگەی ئاگاداری و شارەزایی و بەدواداچوونی مینۆرسکییە بۆ کاری خەڵکانی دی .

**سێیەم : هەواری بەریتانیا**

**(مینۆرسکی و خوێندنگای خوێندنی ڕۆژهەڵاتی) ( ١٩٣٢-١٩٤٤)**

**أ – کارە ئەکادیمییەکان :**

لە ساڵی (١٩٣٢) مینۆرسکی باروبارخانەی لە لەندەن خست و بووە مامۆستای زمانی فارسی لە خوێندنگای خوێندنی ڕۆژهەڵاتی[٢٠٤]، بەڵام وەك تۆژەرێکی سەرەتایی نا، بەڵکو وەك جوامێرێکی پەنجاوپێنج ساڵە ، ناوبانگی بەرلەخۆی گەیشتبووە ئەوێ، وەك کارگێری پێشووی فەرمانڕەوایی تزاری ڕووسی لەئێران و تورکیا و تۆژەری ئەکادیمیی تۆژینەوەکانی ئێرانی، بە کارە ڕەسەن و قووڵەکانی ئێرانناسی بە بڕشتتر کرد، ئەمەش ئاکامی ئەو پێوەندییە

---

(201) In collaboration with sir E.D. Ross): Professor J.Markwart، Bsos،vol.v/4.p.902.

(٢٠٢) بروانە: پێرست .

(٢٠٣) بروانە: پێرست .

(٢٠٤) مینوی ، یاد بروفیسور ، ل١٠ Lang, The obituary, p. 696-697

توندوتۆڵ و فراوانەی بوو لەگەڵ زانایانی ڕەگەز جۆراو جۆری ڕۆژهەلآت و ڕۆژئاوا. لەلایەکی دیکەشەوە بەریتانیا بۆ ئەو شوێنێکی نامۆ نەبوو ، چونکە وێرای ئەزمونی پێشووی وانە گووتنەوە، هاموشۆی کردبوو ، بۆیە ساڵ وەرنەسوڕایەوە، لە ساڵی ١٩٣٢ لە خوێندنگا کرایە مامۆستای یاریدەدەری مێژووی فارسی.(٢٠٥)

دوای ئەوەی لە ساڵی (١٩٣٧) پلەی مامۆستایەتی وەرگرت، نێوەندە ئەکادیمیەکانی بەریتانیا وەك سەرچاوەیەکی بەروومەتی زمان و ئەدەبی فارسی و مێژوو و جوگرافیایی ئێران دانیان پێدا نا – کاتێ کە مامۆستا سیردینسون روس خانەنشین بوو ، ئەنجوومەنی (خوێندنگا) مینۆرسکیان لە شوێنی ئەو بۆ مامۆستایەتی زمانی فارسی لە هەمان ساڵ هەڵبژارد(٢٠٦).

کە ئاگری شەڕی دووەمی جیهانی لە ساڵی (١٩٣٩) هەلگیرسا، شەڕی هەوایی لەندەن لە ساڵی (١٩٤٠) دەستی پێ کرد و فرۆکە ئەڵمانییەکان بەتووندی پەلاماری لەندەنی پایتەختی بەریتانیایان دا، خوێندنگاکەش وەك زۆربەی دەزگا گرنگەکان گوازرانەوە دەرەوەی لەندەن و چوونە کامبری جا مینۆرسکی و خێزانەکەی هەواریان بۆ ئەو شارە کرو بێدەنگە تێك نا، کە زۆری پێ خۆش بوو و کردییە دوا هەواری خۆی(٢٠٧).تاوەکو ساڵی (١٩٤٤) مینۆرسکی خەریکی وانە گوتنەوەو نووسین بوو . هەرکە تەمەنی گەیشتە شەست و حەفت – خۆی خانەنشین کرد و بە ئەندامی شانازی لە خوێندنگاکە بە پلەی مامۆستای کارامەوشارەزا (٢٠٨)دامەزرا .

خوێندنگاکە پایەکی زانستی بەرزی بە مینۆرسکی بەخشیبوو ، حکومەتی ئێران بۆ ئەو ئاهەنگە گەورەیە لە تاران بۆ بیرەوەری هەزارەی شاعیری گەورەی فارس فیردەوسی رێکی خستبوو، بانگی کردبوو، ئەویش بە وتارێك بەشداری

---

(205) Lang، The obituary، P.697.
(206) Ibid .

(٢٠٧) سیاقی ، مرگ مینورسکی ، لا٣٢٢ .

(208) Ibid .

تێدا کرد[٢٠٩] . هەر ئەو سەردانەی نەخشێکی باشی لەدەمە زەردکردنەوە و فروان کردنی بازنەی پەیوەندی لەگەڵ ئێرانییەکاندا هەبوو . لەمەش گرنگتر کاتێ ویستی بۆ ئێران بچێت بە عێراقدا هات و بە کوردستاندا تێپەڕی[٢١٠] . دەستنوسێکی تایفەی ئەهلی هەقەکانی لە ناوچەی کەرکووك پەیدا کرد[٢١١]، ماوەیەکی کورتیش لە شاری سلێمانی مایەوە ، چەندین رۆشنبیری بینی و وتووێژی ئەدەبی لەگەڵ کردن[٢١٢] . لەگەڵ حوسێن حوزنی موکریانی (١٩٤٧ کۆچی دوایی کردوە) مێژوونووسی کورد یەکتریان ناسی ، دواتریش بە نامە گۆرینەوە یەکترناسینەکەیان گەرمتر کرد[٢١٣] . هەر لەو گەشتەدا زانای گەورەی کورد تۆفیق وەهبی (١٩٨٤ کۆچی دوای کردوە) لە بەغدا بینی[٢١٤] و نامەیان لەگەڵ یەکدی گۆڕیوەتەوە و کتێبیان بە دیاری بۆ یەکتری ناردووە.[٢١٥]

لە ساڵی (١٩٣٥) لێکۆڵینەوەیەکی لەبارەی (توێژینەوەی مێژوویی و جوگرافیایی لەبارەی فارسەکان)[٢١٦] لەو کۆنگرە رۆژهەڵاتناسییە نێودەوڵەتییەی لە رۆما بەسترا، پێشکەش کرد ، هەوەها لە ساڵی (١٩٣٨) لەو

---

(٢٠٩) رجب ، نیا ، استاد مینورسکی ، ل٨٣ ؛ سیاقی ؛ مرگ مینورسکی ،ل ٣٢٢ .

(٢١٠) هاوار ، شێخ محمود، ب١، ل ١٨٧ .

(211) V. Minorsky، AhI-I-Haqq،EI$^{2}$.vol. I،p262.

(٢١٢) بۆ درێژی بڕوانە : هاوار ، سەرچاوەی پێشوو .

(٢١٣) تۆژەر نامەکانی مینۆرسکی بۆ موکریانی دەست کەوتووە ، یەکەمیان لە ٢٢ شوباتی ١٩٣٥ ، بۆ ئاشنابوون بە ناوەڕۆکی نامەکە بڕوانە : رەمزییە سابیر محەمەد ؛ حوزنی موکریانی نووسەر و رۆژنامەنووس ، نامەیەکی ماستەری بڵاونەکراوەیە ، ئەدەبیات ( زانکۆی سەلاحەدین / هەولێر : (١٩٩٣) پاشکۆی ژمارە ٢ ؛ نامەیەکیش لە ٥ تەموز ١٩٣٧ . بڕوانە : جەمال رشید ئەحمەد ، رێبازی ژیانی حوسێن حوزنی موکریانی لە سەرەتای سەدەی بیستەم دا وتارێکە لە گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ، (بەغدا : ١٩٩٠ ) ، ژ١٢٦ ، لا ١٢٥ — ١٢٦ ، بڵاوکراوەتەوە .

(٢١٤) بڕوانە : کەمال مەزهەر ، مێژوو ، لا ١٥٠ —١٥١ ، ب ١٢٠.

(٢١٥) نامەیەکی مینۆرسکی بۆ تۆفیق وەهبی ، محەمەد جەمیل رۆژبەیانی بڵاوی کردۆتەوە ؛ کاغەزێکی بڵاونەکراوەی مینۆرسکی بۆ تۆفیق وەهبی ، وتارەکە لە گۆڤاری رەنگین ، (بەغدا : ١٩٨٨) ، ژ ٧، لا ٢١ بڵاوکراوەتەوە .

(216) XIX congresso internationals Deglirientalisti، (Rome:1935):p.239.

کـۆنگرە رۆژھەڵاتناسـییە نێودەوڵەتییـەی لـە بروکـسل بەسـترا، بابـەتێکی گرنگی[217] سەبارەت بە (ڕێورەچەڵەکی کورد ) پێشکەش کرد .

دوای ئەوەی لە ساڵی (١٩٣٧) پلەی مامۆستایەتی وەرگرت، دەستی کرد بە سەرپەرشتی کردنی نامە ئەکادیمییەکانی خوێندکارانی خوێندنی باڵا [218] ؛ سەرپەرشـتی نامـەی عەبدولعـەزیز ئەلـدوری کـرد لـەبارەی (مێـژووی عێراقـی ئابووری لە سەدەی چوارەمی کۆچـی) [219] ، جێـی سـەرنجە ئـەو بابەتـەی کـە سەرپەرشـتی کـردووە مێـژووی ئیـسلام بـوو ، ئـەوەش بەڵگـەی پـسپۆری وردو شارەزایەتی لە بواری مێژوودا .

**ب- دانراوەکانی** : بەریتانیا شوێنێکی زۆر لە بار بوو بۆ ئەوەی مینۆرسکی توانای بەرزی توێژینـەوەی زانستی خۆی دەربخـات ، هـەڵی بـۆ ڕەخـسا لـەوێ چاکترین و گرنگترین داهێنانەکانی بنووسێت، لەگەڵ ئەوەی بـە ساڵیـشا دەچـوو هەر وەك (بوزورث)ی رۆژهەڵاتناس دەڵێت ( لە چلەپۆپەی هێزدابـوو و مێـشکی هەمیشە دەیتوانی زانیاری نوێ وەربگرێت و قەڵەمەکەی هەر لە بڕشت نەکـەوت تاکۆتایش لە فێربوون تێر نەدەبوو ) [220] دەتوانین نووسینەکانی نێـوان سـاڵانی (١٩٣٢ – ١٩٤٤)ی ئاوا دابەش بکەین : بە پێی ئەو زمانانەی کە توێژینـەوەکانی پێ بلاوکردوونەتەوە ، بۆمان دەردەکـەوێت، بەرلـەوەی پلـەی مامۆسـتایەتی لـە سـاڵی (١٩٣٧) وەربگرێـت، ئـەو توێژینەوانـەی بـە زمـانی ئینگلیـزی پێـشکەش کـردوون، قـووڵ نـین[221] جگـە لـە لێکۆڵینەوەیـەکی نـەبێت بـە نـاوی (تێبینـی

---

(217) Les origines des Kurdes، Actes Du xx e Congres. International des orietalistes. (Bruxell:1940) pp.143-152.

(٢١٨) مینۆرسکی سەرپەرشتی نامەیەك پتری کردووە . بەڵام تۆژەر هیچ بەڵگەیەکی زیندووی نییە لە تۆژینەوەکەیدا تۆماری بکات.

(٢١٩) لەوەش پتر ئەلدوری لە خوێندنی بەکالوریۆسیشدا هەندێ بابەتی لە لا خوێندووە . نامەی مامۆستا عەبدولعەزیز ئەلدوری لە ٢٤ نیسانی ٢٠٠٠ .

(220) Iran،p.vii.

(٢٢١) وتارەکانی بە ئینگلیزی دەنووسی بەڵام درێژ نەبوون ، سەبارەت بەو پێداچوونانەوەی کە هەر لەو ماوەیەدا بلاوی کردوونەتەوە دەردەکەوێت کە لە نووسینی پێداچوونەوەکانی بۆ

لەبارەی نووسینی ئەلفبای کوردی بە لاتینی ) [٢٢٢] هەرچی لەو ماوەیەدا نووسیویەتی بە فەرەنسی بوو ، وایێدەچێ ئەو لێکۆڵینەوانەی لە پاریس نووسیبن و لە لەندەن تەواوی کردبن یان بۆ بڵاوکردنەوەی ئامادە کردوون ، رەنگە بۆ بڵاوکردنەوەی ناردبن، بەڵام تا ئەو کاتە دوا کەوتبن و دەرنەچووبێ.

لە ساڵی (١٩٣٢) بە هاوکاری خێزانەکەی وەرگێرانی کتێبی (کورتەیەکی مێژووی رووسیا)ی[٢٢٣] لە رووسییەوە بۆ فەرەنسی بڵاوکردەوە ، هەروەها بابەتێکی دیکەی بە ناوی (دەسەڵاتداری دیلەمییەکان ) [٢٢٤] یشی بڵاوکردەوە ، قەشەیەکی رۆژهەڵاتناس سەبارەت بەو لێکۆڵینەوەیە دەڵێت ئەوەیان یەکەمین تۆژینەوەی رۆژهەڵاتناسی تەواو سەربەخۆیە لەبارەی بۆیهییەکان[٢٢٥] و لێکۆڵینەوەکەی سەرنجی رۆژهەڵاتناسانی راکێشا، بۆیە چەند رۆژهەڵاتناس پێیداچوونەتەوە.[٢٢٦] بەڵام لە ساڵی (١٩٣٣) لێکۆڵینەوەیەکی لە بارەی (ئێران لە سەدەی دەیەمی کۆچی لە نێوان تورکیا و ڤینسیا )[٢٢٧] بڵاوکردەوە . لە ساڵی (١٩٣٤) یش لێکۆڵینەوەیەکی بە ناوی (مێژووی نادرشاه)[٢٢٨] بڵاوکردەوە، لە بەر بایەخی ئەو لێکۆڵینەوەیە رۆژهەڵاتناسان [٢٢٩]

---

گۆڤاری ئاسیایی فەرەنسایی نەکەوتووە، بەڵام ئەوەی پێ سەرچاوەیەکی بنەرەتی نەبوو؛ بەڵکو گۆڤاری (خوێندنگا) بووە سەرچاوەی ئەو. لەنێوان ساڵانی (١٩٣٣-١٩٣٧) یشدا یەك پێداچوونەوەی تێدا بڵاوکردەوە . کەچی لە ساڵی (١٩٣٢) چوار پێداچوونەوەی نووسیوە و یەك پێداچوونەوەشی لە گۆڤاری (خوێندنگا) لە ساڵی (١٩٣٢) بڵاوکردۆتەوە ؛ بەڵام لە ساڵی (١٩٣٧) بۆ هەمان گۆڤار نۆزدە پێداچوونەوەی نووسیوە.

(222) Remarks on the Romanized Kurdish Alphabet، JRAS، July، 1933،pp.643-650.

(٢٢٣) بڕوانە: پێرست.

(٢٢٤) بڕوانە: پێرست.

(٢٢٥) بڕوانە : بنو بويه ، دائرة المعارف الاسلامية ، ط٢ ،ج٨ ، ص٤٧٨ .

(٢٢٦) بڕوانە: پێرست .

(٢٢٧) بڕوانە: پێرست .

(٢٢٨) بڕوانە: پێرست .

(٢٢٩) بڕوانە: پێرست .

بەسەریداچوونەوە و وەریشگێردرایە سەر زمانی فارسی.[230] ئەو نووسینانەی لەو ماوەیەدا بۆ ئینسکۆپیدیای ئیسلامی نووسیون ئەمانەن :

١- **شوێنی جوگرافی** : لە ساڵی (١٩٣٢) لەبارەی ( مەشهەدی مەسریان و توسان و توس و ورمێ و شنۆ )ی نووسیوە . لە ساڵی (١٩٣٣) لەبارەی (موکان و موغان و وان و وارامین)ی نووسیوە. لەساڵی (١٩٣٤) یشدا سەبارەت بە(نەخچەوان و نەخشاب و نرشاخی و ناسا و زنجان و ئورزون و باورد)ی نووسیوە. لە ساڵی (١٩٣٥) یش بە هەردوو وتاری (نەهاوەند و تەورێز) بەشداری کردووە. لە ساڵی (١٩٣٦)یش لەمەڕ (رەیی و رامهورمز و رویان )ی نووسیوە ، لە دواییشدا لە ساڵی (١٩٣٧) دووبارە وتاری (موکان)ی بۆ پاشکۆی ئینسکلوپیدیای ئیسلام نووسیوە .

٢- **ڕیوڕەچەلەك** : لەو سەرو بەندەدا وتاری دیکەی بۆ ئینسکلوپیدیا نووسیوە ، دەکرێ لە ژێر سەرناوی ڕێوڕەچەلەك تۆماریان بکەین. لە ساڵی (١٩٣٢) وتارێکی لەبارەی (ئۆزبەگك) نووسی و لە ساڵی (١٩٣٤) یش لەسەر (ئەرسترونی) لە (١٩٣٦) یش لەبارەی (رووس)ەوەی نووسیوە .

٣- **ناودارانی مێژوو** : لە ساڵی (١٩٣٢) لەبارەی (ئۆیس و ئوزون حەسەن)ی نووسی و لە ساڵی (١٩٣٣) یش لەبارەی (محەمەد حەسەن خان) و لە ساڵی (١٩٣٤)یش لەبارەی (نادر) و لەساڵی (١٩٣٥) یش لەسەر رنیزام شاه) و دواتریش لە ساڵی (١٩٣٧) وتارێکی لە پاشکۆی ئینسکلوپیدیادا سەبارەت بە (مشەعشەع) نووسی،،وێرای لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەل لەبارەی تایفەی ئەهلی (هەقە) لە ساڵی (١٩٣٤) لە پاشکۆدا بڵاویکردەوە . سەبارەت بە بنەماڵە فەرمانڕەواکانیش لە ساڵی (١٩٣٣) وتارێکی لە سەر بنەماڵەی (موسافرییە) نووسیوە . ئەو وتارانەی بە ئینگلیزیش بڵاوی کردوونەتەوە ئەمانەن : لە ساڵی (١٩٣٥)وتارێك بەناوی (جیابوونەوەی سونە و شیعە لە ئیسلام )[231] . لە سەروبەندی بەشداری کردنی لە هەزارەی فیردەوسی وتارێکی لە هەمان ساڵدا بە

---

(٢٣٠) بڕوانە : رشید یاسمی؛ بعنوان تأریخچە نادر شاه ؛ (تهران :١٣١٢ هـ . ش) ،لا ١٣٥ .

(٢٣١) بڕوانە: پێرست .

ناوی (پەردەلادان لەسەر پەیکەری فیردەوسی)[232] بڵاوکردەوە . سەرەڕای نووسینی پێداچونەوەکان بۆ گۆڤارە جۆراو جۆرەکانی ئەو سەردەمە . بەڵام ئەو پرۆژەیەی کە ئەرك و کاتێکی زۆری برد، کتێبی (سنووری جیهان) بوو ، کە هەر لە ساڵی (١٩٣٠) وە کاری تێداکردوە تا لە ساڵی (١٩٣٧) بڵاوی کردەوە کارەکەش وەرگێڕان و ساخکردنەوەی دەستنووسێکی فارسی نووسەرێکی نادیار بوو[233] کە تومانسکی رۆژهەڵاتناسی رووسی ئەوەی کە دەستنووسەکەی[234] دەست کەوتبوو ، هەروەها بارتولدی رۆژهەڵاتناسی گەورەش بە پێ لێنانی خۆی[235] نەیانتوانی بوو ساخی بکەنەوە. مینۆرسکی دەست و بازووی لێ هەڵماڵی و بە چوار ساڵ لێی بووەوە، بەڵام سێ ساڵ بڵاوکردنەوەی وەدرەنگ کەوت[236] ئەو کارەی کە خۆشی لەزاڵ بوون بەسەر هەموو ئاستەنگەکانیدا پێ بەخشیبوو ، چ لە وەرگێڕانی دەقێکی کۆن و پڕا و پڕی ناوی جوگرافی جۆراو جۆر ، چ لە ساخکردنەوەیان لە زۆر لای جیاواز ، ئەوەش یەکێکی کارامە و زمانزان و شارەزای تەواوی لە کتێبە جوگرافییەکانی فارسی و عەرەبی ئەو سەردەمەی گەرەك بوو، مینۆرسکی کارێکی وای کردووە کە بەری وی کەس نەیکردووە ، ئەوە بوو پرۆژەکەی تەواو کردو گەلێ دەرئەنجامی وردی بە دەست هێنا و پلەی مامۆستایەتی پێ وەرگرت[237] ئەوەش سەرنجی رۆژهەڵاتناسانی

---

(232) Ferdousis Monument unveiled، the school of Oriental studies History، February، 1935،vol.1/5، pp.5-8 .

(٢٣٣) مامۆستا ئیسماعیل شوکر لێی ئاڵۆز بووە، وای زانیوە نووسەرەوەی دەستنووسەکە دانەرەکەیەتی. بڕوانە: الشداديون في بلاد آران، ر. م . غ. ، الآداب، (جامعة صلاح الدين/أربيل: ١٩٩٠) ،ص١٢ ، چونکە مینورسکی ئاماژەی بەدیارنەبوونی دەستنووسەکە کردووە. بڕوانە: Hudud،.pp.xiv-xix

(234) Hudud، preface of V.Barthold، pp.30-31.

(235) Ibid، p.ix.

(236) Hudud، p.xx.

(٢٣٧) تقی زادە ، در رثای ، ٧٧ .

راكێشا گەلێ پێداچوونەوە و پەراوێزی بۆ کرا و ژمارەیان گەیشتە شازدە پێداچوونەوە،[٢٣٨] وێرای وەرگێڕانی بۆ زمانی فارسی.[٢٣٩]

لە نێوان وەرگرتنی پلەی مامۆستایەتی لە ساڵی (١٩٣٧)، تا خانەنشینی لە ساڵی (١٩٤٤)دا جموجۆڵی تۆژینەوەکانی دووچەندانە بوون و مەیدانی بایەخدانی فراوانتر بوو ،لە بوارو کات و شوێنی دوورتر ئەسپی خۆی تاودا، ئەوەی جێی سەرسوڕمانە شەڕی دووەمی جیهانی نەیتوانی لەرەوتی ئەکادیمیانەی لایبدات . وادیارە لە گەرمەی شەڕدا، خەریکی ساخکردنەوەی دەقی عەرەبی و فارسی و تورکی بووە . دەکرێ کارەکانی ئاوا دابەش بکەین:-

لەو ماوەیە دا زۆر لێکۆڵینەوەی جوگرافیایی نووسیوە : لە ساڵی (١٩٣٧) باسێکی بە ناوی (جوگرافی فارسی لە ساڵی ٩٨٢ز لەبارەی تۆپوگرافیای ئاسیای نێوەڕاست)[٢٤٠] و لە ساڵی (١٩٣٨)یش، لێکۆڵینەوەیەکی بە ناوی (هۆکاری جوگرافیایی لە ئەدەبی فارسی) دا [٢٤١] نووسیوە ، هەروەها لە ساڵی (١٩٤٢) شدا کارێکی گرنگی ساخکردنەوەی دەقێکی عەرەبی، بڵاوکردەوە . کە مینۆرسکی یەکەمجار بوو دۆزیبیەوە ،[٢٤٢] دوای وەرگێڕان و ساخکردنەوە بە کتێب بە ناوی (شرەف ئەلزمان تاهیر مروەزی لە چین ، تورك و هیند) [٢٤٣] بڵاوکردەوە و پێشکەشی کتێبخانەی ئەکادیمی زانستی لە مۆسکۆ کرد ، وەك هاوسۆزی لە سەروبەندی هێرشی نازییەکان بۆ سەر وڵاتەکەی [٢٤٤]

---

(٢٣٨) بڕوانە: پێرست .

(٢٣٩) ترجمة میر حسین شاه ؛ تعلیقات بر حدود العالم من المشرق الی المغرب ، تصحیح و حواشی مریم میر احمدی و غلام رضا ورهرام ، (تهران: ١٣٧٢ﻫ.ش) .

(٢٤٠) بڕوانە: پێرست

(241) Geographical factors in Persian art، BSOS،1938،vol.IX/3،pp.621-625.

(٢٤٢) ج. ئاربری رۆژهەڵاتناس لە ناوەڕاستی سییەکانی سەدەی بیستەم لە هیند دەستنووسەکەی دۆزییەوە ، کە گەڕایەوە بە دیاری دایە مینۆرسکی : ئەوەش بەڵگەی رێزی مینۆرسکییە لای ئاربری . بڕوانە: گروه مولفان و مترجمان ، فرهنگی خاورشناسان ؛ ج١. ل٤٣٧ .

(243) Sharaf AL-Zaman Tahir Marvazi: on China، The Turks and India (London: 1942)، 170+52 (Arabic).pp.

(244) Lang، The Obituary، p.697.

رۆژهەڵاتناسان بە کتێبەکەیدا چوونەوە[٢٤٥] ، رەخنەیان لە وەگرت کە وەرگێڕانە عەرەبییەکەی دەکرێ، راست بکرێتەوە.[٢٤٦] لە ساڵی (١٩٤٤)یش باسێکی لەبارەی (ئیبن فەزلانی گەڕیدە)[٢٤٧] بڵاوکردەوە ، هەرلەو ماوەیەشدا ئەو لێکۆڵینەوە مێژووییانەی بڵاوکردۆتەوە کە. هەروەك تۆژینەوەکانی پێشووی بە پێی هەوارە دیارەکانی مێژووی ئێرانی ( Iranian in termmizo ) لە دوری نێوان سەردەمی دەسەڵاتی عەرەب و تورك و هەروەها بەر لە هاتنی سەفەوییەکان و لە سەروبەندی فەرمانڕەوایەتیاندا دەخولایەوە. لە ساڵی (١٩٣٧) یش ئەو بابەتەی لە کۆنگرەی رۆژهەڵاتناسی لە رۆما لە ساڵی (١٩٣٥) خوێندبووەوە بەناوی (لێکۆڵینەوەی مێژوویی و جوگرافیایی لەبارەی فارسەکانەوە)[٢٤٨] ، بڵاوکردەوە کە تەواوکەری ئەو وتارەی بوو، کە لە کۆنگرەی رۆژهەڵاتناسی ساڵی (١٩٣١) خوێندبوویەوە. لە ساڵی (١٩٣٩) یش لێکۆڵینەوەیەکی لەبارەی (نمایشی مەدەنی و سەربازی لە فارس ساڵی ( ٨٨١ ك/ ١٤٧٤ز )[٢٤٩] بڵاوکردەوە . لە ساڵی (١٩٤٠) یش باسێکی هاوبەشی لەبارەی ( ناسرەدین تووسی لە کاروباری دارایی )دا [٢٥٠] بڵاوکردەوە. لە ساڵی (١٩٤٢) یش بابەتێکی بەناوی (هەندێ بەڵگەی سەرەتایی لە بارەی فارسەکان)ەوە[٢٥١] و دوای ئەویش بابەتێکی دیکەی لە ساڵی (١٩٤٤)[٢٥٢] بڵاوکردەوە . لە ساڵی (١٩٤٣) لەو کاتەی کە خەریکی سەردەمی

(245) R.Burn، Review of Minorskys Sharaf Al- Zaman Tahir Marvazi، JRCAS،1943، Vol.xxx،pp.221-223.

(246) Bosworth، Iran،p.viii.

(٢٤٧) بڕوانە: پێرست .

(٢٤٨) بڕوانە: پێرست .

(249) A civil and Military Review in Fars in 881/1474، BSOAS،1939، Vol.X/3، pp.141-178.

(250) (In Collaboration with M.Minov) Nasiral-Din Tusi on Finance، BSOAS، 1940،Vol.X/3، pp.775-789.

(251) Some Early Documents in Persian(I)، JRAS،1942،Part3،pp.181-194.

(252) Some Early Documents in Persian(II)، JRAS،1944،Part1،pp.86-99.

فەرمانڕەوایەتی سەفەوییەکان و پێشی ئەوانیش بوو ، کتێبێکی فارسی بە ناوی (تذکرة الملوك – بیرەوەری پاشایان)[253] ساخکردەوە کە شرۆڤەکردنێکی کورتە لەبارەی کارگێڕی لە سەردەمی دەوڵەتی سەفەوی، دوای بڵاوکردنەوەی پێشکەشی ((ڕۆژهەڵاتناسە سۆڤێتییەکانی کرد لە ڕۆژە ناخۆشییەکانیاندا))[254] ، بە پێشکەش کردنی ئەو کتێبە[255] کتێبەکەی مروەزی دەریخست، کە تاچەند نیشتمانەکەی خۆی خۆش دەوێت. لە ساڵی (١٩٤٤)، گەڕاوەتەوە سەر بابەتەکەو بە لێکۆڵینەوەیەکەوە بڵاوی کردۆتەوە.[256] سەبارەت بە ئەدەبی فارسیش لەو ماوەیەدا دوو لێکۆڵینەوەی نووسیوە ، یەکیان (شیعرەکانی شاه ئیسماعیل سەفەوی )[257] یە و ئەوی دیکەش (داستانی فارسی و ئەدەبی میللی ڕووسی) بوو.[258] لە بواری تورکناسیشدا باسێکی بەناوی (خەزەرو تورك لە کتێبی ئەحکامی مەرجان)[259] نووسیوە ، هەروەها باسێکی دیکەشی بە ناوی زاراوەی تورك لەخەلج بڵاوکردۆتەوە [260] . بابەتێکیشی لە بارەی بنەماڵەی

---

(253) Persian text Tadhkirat al-Muluk Amanual of Safavid Administration (circa 1137-1725)، Translated and Explained By V.Minorsky،(London:1943)، 218+130pp.

(٢٥٤) مینورسکی ، الاکراد ، مقدمة المترجم . ص٩.

(٢٥٥) ئەو کتێبە بە ئاگاداری مینۆرسکی لەلایەن مەسعود رجب نیاوە کراوەتە فارسی. بڕوانە : نامەی مینۆرسکی بۆ دبیر سیاقی و رجب نیا لە ١٧ی تەمووزی ١٩٥٦؛ لە نێو کتێبی (تذکرة الملوك) بکوشش محمد دبیر سیاقی ؛ و سازمان اداری حکومە صفوی بە پەراوێزی مینۆرسکییەوە . ترجمة مسعود رجب نیا (تهران : ١٣٦٨ هـ . ش) ٢٣٧ – ٢٤

(256) A manual of Safavid Administration، JRAS،January،1944، pp.93-97.

(257) The Peotrcy of Shah Ismail، BSOAS، 1942، Vol.X/4، pp.1006-1053.

(٢٥٨) بڕوانە: پێڕست .

(259)The Khazars and the Turks in the Akam Al-Marjan،BSOS،1937، Vol،1X/1، pp.141-150.

(260) The Turkhsh dialect of the Khalaj، BSOAS،1940، Vol،X/2، pp.417-437.

تورکمانـــەکان بـــەناوی (قاســـم کـــوڕی جیهـــانگیر ئـــاق قـــۆینلر ٩٠٣ ه/١٤٩٨ز)بلاوکردۆتەوە .[٢٦١]

**لێکۆڵینەوانەکانی لە بواری کوردناسیدا:**

لە ساڵی (١٩٤٠) دا ئەو وتارەی بلاوکردەوە کە لەبارەی (ڕێوڕەچەلەکی کورد) لە بروکسل خوێندبوویەوە و بابەتێکیشی لە بارەی هۆزی گۆران و ئەدەبەکەیان بەناوی (گۆران) [٢٦٢] نووسی . لە ساڵی (١٩٤٤) ش لە لایەنێکی مێژووی دێرینی ناوچەی کوردەواری تۆژییەوە، ئەویش (هێرشە رۆمانی و بێزەنتینییەکان لە ئەترۆپاترین — واتە کوردستانی خۆرهەلات)[٢٦٣] وەك هاوسۆزی لەگەڵ ولاتەکەی بە تایبەتی لەو ماوەیەدا بە هاوکاری ج . ف . فیرنادسکی بە ناوی (تۆژینەوەی رووسی و مێژووی رۆژهەلات)ی[٢٦٤] لە ساڵی (١٩٣٩) بلاوکردەوە. لە ساڵی (١٩٤٣) ش باسێکی بە ناوی (لێکۆڵینەوە رۆژهەلاتییەکان لە کۆمارەکانی رووسیای سۆڤێتی)[٢٦٥] و هەر لە هەمان ساڵدا باسێکیشی بەناوی (تۆژینەوە عەرەبییەکان لە رووسیای سۆڤێتی) [٢٦٦] بلاوکردەوە، ئەوەی ئەو دوو لێکۆڵینەوەی خوێندبێتەوە بۆی دەردەکەوێت کە نووسەرەکەی هەمیشە لە سەروسۆراخی کاروانی رۆشنبیری ولاتەکەی دابووە، بە تایبەتیش لە بواری تۆژینەوە رۆژهەلاتناسییەکاندا.

سەبارەت بە مێژووی ئاسیای ناوەڕاستیش مینۆرسکی لە ساڵی (١٩٣٧) بابەتێکی بە ناوی (سەرچاوەیەکی ئیسلامی نوێ لە بارەی ئاسیای ناوەڕاست لە

(261) A Soyurgrhal of Qasim B.Jahangir Aq-Qoyunlu (903/1498). BSOAS،1938، Vol،1X/4، pp.927-960.

(2620 The Gurun، BSOAS،1943، Vol،XI/1، pp.75-103.

(263) Roman ans Byzantine Campagns in Atropatene، BSOAS،1944، Vol،XI/2، pp.243-265.

(٢٦٤) بڕوانە: پێرست .

(265) Oriental Studies in the U.S.S.R.،JRCAS،1944،Vol.XXX،pp.81-101.

(٢٦٦) بڕوانە: پێرست.

سەدەی یازدەی زایینی) یەوە[٢٦٧] بلاوکردەوە ، هەر لە هەمان سالدا باسێکی بە ناوی (کتێبێکی فارسی نوێ لەبارەی هەنکار لە سەدەی دەیەمی زایینی)[٢٦٨] یەوە بلاوکردەوە ، هەر لەو ماوەیەدا باسێکی بە ناوی (سیاسەتەکانی رۆژئاوا[٢٦٨] لە رۆژهەلاتی ناوەراست)[٢٦٩] دا نووسی، کە لە سێ تەوەر پێك هاتووە : جموجۆلی مەغۆلەکان ، بارودۆخی بنەمالە تورکمانییەکان ، دەولەتی سەفەوی بوو. لە ئاکامی سەرو سۆراخی بەردەوامی نووسراوەکانی بواری ئێرانناسی، لەو ماوەیەدا بیست و شەش کتێبی لە کتێبی رۆژهەلاتناسان سەرو بەر کردەوە،[٢٧٠] سەرلەبەریانی لە گۆڤاری (خوێندنگا) دا بلاوکردۆتەوە، ئەوەی پێویستە لێرەدا ئاماژەی بۆ بکەین ئەوەیە کە وێنەی راستەقینەی هیچ رۆژهەلاتناسێك تەواو نابێت، ئەگەر لەو پێداچوونەوە سەروبەرکردە و نووسینە جۆراو جۆرانەی کە لە رەوتی ژیانی زانستی خۆیدا بلاوی کردوونەتەوە، ئاگادار نەبین .

### چوارەم : هەواری خانەنشینی ( ١٩٤٤ – ١٩٦٦)

**أ– کارە ئەکادیمییەکان** : مینۆرسکی بیست سالی تەمەنی لە نێو دالانی دەزگا ئەکادیمییەکان بەسەربرد . لە سالی (١٩٤٤)، تەمەنی بووە شەست و حەوت سالّ خانەنشین بوو . بە تەواوی خۆی بۆ لێکۆلینەوە و توژینەوەی زانستی تەرخانکرد و لە مالەکەی لە کمبریج جێنشین بوو؛ خەریکی چالاکی نواندن بوو، لەسەردان و بەشداری لە کۆر و کۆنگرەکان ، لە سەر بانگهێشتی ئەوان ، بووە مامۆستای میوان لە زانکۆی فۆئادی یەکەم لە میسر لە سالی

(٢٦٧) بروانە: پێرست.

(٢٦٨) بروانە: پێرست.

(269) The Middle East in Westren politics in the 13th،15th، 16th، Centuries، JRCAS، october 1940، Vol.XXVII،pp.427-461.

(٢٧٠) بروانە: پێرست.

(١٩٤٨-١٩٤٩).[٢٧١] هەرلەوێـشدا بەشـداری کۆڕەکـانی دەکـردو پێوەنـدی هاوڕێیـەتی لەگـەڵ زانایـانی وەك تـەها حوسـێن بەست ، کـە زۆری پـێ داخبـار بوو.[٢٧٢]

لـە هـەواری خانەنـشیندا بەشـداری لـە زۆر گـۆنکرە و کـۆڕ ودیـدارە نێودەوڵەتییـەکان دەکـرد . ئـەوە بـوو بەشـداری کـۆنگرەی ڕۆژهەڵاتناسـی نێودەوڵەتی پاریسی کرد لە ساڵی (١٩٤٨) بە بابەتی (لێکۆڵینەوە مێژوویییـەکان لـەبارەی ئێـران تـاکو سـاڵی ١٩٣٥)[٢٧٣] ، هـەروەها بەشـداری کـۆنگرەی ڕۆژهەڵاتناسی ئەستەنبوڵی لە ساڵی(١٩٥١) کـرد و وتـارێکی لـە بـارەی (نامـەی دووەمی ئەبی دەلەف)[٢٧٤] خوێندوە ، هەروەها بەشداری لەو کۆنگرەیە کرد کـە دواتر لە ساڵی (١٩٥٤) لە کامبرج بەسترا ، بـە سـەرلە نـوێ بەسەرداچوونەوەی ئەو نووسراوانەی کە لـە کۆنگرەی پـاریس سـاڵی (١٩٤٨) [٢٧٥] خوێندبوویـەوە، دواتریش بەشداری کۆنگرەی ڕۆژهەڵاتناسی مۆسکۆی لە ساڵی (١٩٦٠) کرد[٢٧٦].

وێرای بەشداری کردنی لە کۆنگرە جیهانییەکان ، لە سـاڵی(١٩٥٤) یـش بـۆ ئاهەنگی هەزارەی ئیبن سینای زانای ناودار کـە لـە تـاران بەسـترا ، بـانگ کـرا و وتارێکی بە ناوی (ئیبن سـینا ئـەو پیـاوە کـێ بـوو) خوێنـدەوە[٢٧٧] وێـرای کـۆڕ گێرانـەکانی،[٢٧٨] لـەو سـەردانەیدا بـۆ تـاران پەیوەنـدی بـە بـرادەرە ئێرانییەکانییـەوە خۆشـترو فـراوانتر کـرد. لـە سـاڵی(١٩٥٨) یـش بەشـداری کۆنگرەی لاهوری کرد کە لە بـارەی لێکۆڵینـەوە مێژوویییـەکان[٢٧٩] بەسـترا ، لـە

---

(271) Minorsky،Iranica،P.xi; Lang، The Obituary، p.698.

(٢٧٢) نامەی مینۆرسکی بۆ تەقی زادە لە ١٢ی کانوونی یەکەم ١٩٥٦.

(273) Proceeding of the XXI Congress of Orietalists، (Paris:1948)p.169.

(274) La Deuxiemc Risala Abu-Dulaf،Oriens،1952،Vol.V/1،p.23.

(275) Minorsky، Iranica،p.xi.

(276) Minorsky، Iranica،p.xi.

(٢٧٧) مینورسکی ، ابن سینا چگونه مردی بود ، ترجمة شیجاع الدین شفا ، وتارێکە لە گۆڤاری دانیشکده ادبیات (تهران : ١٣٣٣ هـ . ش) ش٤ ، لا ٦-٧٩ ، بڵاوکراوەتەوە .

(٢٧٨) بڕوانە: پێڕست .

(279) Minorsky، OP.Cit.

ساڵی داهاتووشدا لە ئەستەنبوڵ، بەشداری کۆنگرەی هونەری تورکی کرد.[٢٨٠] لە ساڵی(١٩٦١) یش لە ئەستەنبوڵ باسێکی لەبارەی (ئەو دەستنووسە تورکیانەی لە کتێبخانەی جستربیتی لە دبلن پارێزراون)[٢٨١] پێشکەش کرد کە خۆی پێرستی بۆ کردبوون. لە ساڵانی (١٩٤٨ و ١٩٥٤)[٢٨٢] زانکۆ ئازادەکانی بەلجیکا و لە ساڵی(١٩٥٦) یش[٢٨٣] زانکۆی رۆما بانگهێشتیان کردووە .

ب – دانراوەکان .

سەبارەت بە دانراوەکانی، ئەوا لەو ماوەیەدا حەوت کتێب و دەوروبەری سەد وتاری بڵاو کردۆتەوە، کە بەری رەنج و کۆششی بەردەوامی رۆژانە دەسەعات کارکردن بوو.[٢٨٤] لێکۆڵینەوە جوگرافیاییەکانی : یەکەمیان بە ناوی (گەڕیدەی عەرەبی تمیم کوڕی بحر بۆ شانشینی ئوغور)[٢٨٥] لە ساڵی(١٩٤٨) بڵاوی کردەوە . هەر لە هەمان ساڵدا باسێکی لەبارەی ( گوردیزی لە هیند)[٢٨٦] بڵاوکردەوە ، باسێکی دیکەشی بە ناوی (قفقاس لە کتێبی مێژووی میافارقین)[٢٨٧] بڵاوکردەوە ، لەو لێکۆڵینەوانەدا مینۆرسکی سەر لە نوێ جەخت لە سەر بەرنامەی خۆی دەکاتەوە ئەویش تێکبردنەوەی بابەتە جۆراو جۆرەکان بوو . لە ساڵی (١٩٥٠) یش باسێکی لە بارەی ئەوەی کە لە باسی (مروەزی)دا لە بیر کرابوو بە ناوی (مروەزی و بێزەنتییەکان)[٢٨٨] بڵاوکردەوە ، لە ساڵی

---

(280) Ibid.
(281) Ibid،P.XXVi.

(٢٨٢) نامەی مینورسکی بۆ تەقی زادە لە ٥ ی مارسی ١٩٤٨ .

(٢٨٣) نامەی مینورسکی بۆ ئەفشار لە ٢٤ ی حوزەیرانی ١٩٥٦ .

(٢٨٤) نامەی مینورسکی بۆ تەقی زادە لە ٢٠ ی مارسی ١٩٥١ .

(285) Tamim Ibnbahrs Journey to the Uyghurs،BSOAS،1948 ،Vol. XII/2 ، pp.275-305.

(286) Gardizi on India، BSOAS،1948،Vol.XII/3.pp.625-640.

(287) Causcasica in the History of Mayyafariqin، BSOAS،1948،Vol.XII/4 ،pp.27-35.

(٢٨٨) بڕوانە: پێرست .

(١٩٥١) یش باسێکی لە مەڕ جوگرافیاناس و گەڕیدە موسڵمانەکان)[٢٨٩] بڵاوکردەوە ، لەساڵی (١٩٥٢) یش لێکۆڵینەوەیەکی بە ناوی (نامەی دووەمی گەڕیدەی عەرەب ئەبو دەلەف و گەشتەکەی بۆ ئێران)[٢٩٠] بڵاوکردەوە ،بەدوایدا باسێکی بە ناوی (دوو ئەفسانەی ئێرانی لە نامەی ئەبی دەلەف)[٢٩١] بڵاوکردەوە، دوا بە دوای پێناسەکردنی (ئەبادەلەف) لە ئینسکلوپیدیای ئیسلام لە ساڵی (١٩٥٤)[٢٩٢] دەقەکەی ئەبی دەلەفی بە پەراوێز لێدانەوە بە زمانی ئینگلیزیی لە ساڵی (١٩٥٥)[٢٩٣] بڵاوکردەوە . ڕەنگە سەردانەکەی بۆ میسر لە نێوان ساڵانی (١٩٤٨–١٩٤٩) ڕێ خۆشکەر بوو بێت بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو لێکۆڵینەوەیە لەوێ، لەبەر بایەخی پەراوێز و سەرنجەکان و دەقەکە خۆی، دواتر بۆ زمانی فارسی وەرگێڕدرا[٢٩٤].

هەروەك خووی پێوە گرتبوو، هەمیشە لە جارێك پتر دەگەڕایەوە سەر کارەکانی پێشووی ، بۆیە دوو باسی لەبارەی کتێبەکەی (سنووری جیهان) — دوای ئەوەی تەندروستی لەبار نەبوو سەرلە نوێ کتێبەکە بڵاوبکاتەوە)[٢٩٥] ، بڵاوکردەوە ، ئەوانیش : (یاداشتێك بۆ سنووری جیهان)[٢٩٦] ، بۆ بە سەر ڕاگەیشتنی هەندێ لەو سەرنجانەی لە بیرکرا بوون و بۆ وەڵامدانەوەی هەندێ لەو پێداچوونەوەی کە لە بارەی کتێبەکە (سنووری جیهان) نووسرا بوون ،

---

(٢٨٩) بڕوانە: پێرست .

(290) La Deuxieme Risala D. Abu-Dulaf،Oriens،1952.Vol.V/1pp23-27.

(٢٩١) بڕوانە: پێرست .

(٢٩٢) بڕوانە : چ، ب ١ ، ل ٤٧٤ — ٤٧٥

(٢٩٣) بڕوانە: پێرست .

(٢٩٤) سەید ئەبولفەزل تەباتەبایی ، بەناوی سفرنامه ابودلف در ایران در٣٤١ هجری ، (تهران : ١٣٥٤ هـ.ش) ، ١٩٢ ل ، وەریگێڕاوە.

(٢٩٥) نامەی مینورسکی بۆ ئەفشار لە١ی حوزەیرانی ١٩٦٤؛ عبدلعلی کارنك، ملاقات با مینورسکی، وتارێکە لە گۆڤاری کتابخانه ملی تبریز، (١٣٤٥ هـ .ش) ، ش١٠، ل١٠٤ .

(296) Addenda to the Hudud al Alam.BSOAS،1955،Vol.XVII/2،pp.250-270.

تۆژینەوەیەکی دیکەشی بە ناوی (ابن فرعون و سنووری جیهان) بوو[٢٩٧]. ئەوەیان یەکێك لەو وتارە هەڵبژاردانەی کتێبی ئیرانیکا بوو[٢٩٨].

بەڵام سەبارەت بە بواری مێژوو دیسان هاتەوە سەر هەوارە دیارەکانی مێژووی ئێران – وەك لە پێشەوە باس کرا – لێکۆڵینەوەی جۆراو جۆری نووسی کە زۆربەیان بە هەرێمی ئازەربایجان و قەفقاسەوە بەند بوون، بابەتەکانیش ئەمانەن: لە ساڵی (١٩٤٩) بە هاوکاری کلود کاهینی رۆژهەلاتناس (ئەو نووسینانەی لە بارەی ئەودیو قەفقاسی مەسعود کوڕی نامدار لە سەدەی دوازدەی زایینی)[٢٩٩] بلاوکردەوە . لە ساڵی (١٩٥١) یش باسێکی لەبارەی (پاشاکانی ئەهاری جۆرجییەکان . میر ئۆربیلی لە ئێران)[٣٠٠] بلاوکردەوە ؛ لە ساڵی (١٩٥٢) یش بابەتێکی بەناوی (پایتەختی لان و هێرشی مەغولەکان)[٣٠١] بلاوکردەوە، لە ساڵی (١٩٥٣) یش لێکۆڵینەوەیەکی لە بارەی (سهل کوڕی سمبات و والییەکانی مەرزەبان لە قەفقاس)[٣٠٢] بلاوکردەوە. لە بەرئەوەی بایەخی تایبەتی بە ناوچەی قەفقاس دەدا، ئەوە کتێبێکی بە ناوی (مێژووی شێروان و دەربەند)[٣٠٣] بلاوکردەوەو رۆژهەلاتناسەکان زۆری بە سەردا چوونەوە[٣٠٤] و وەرگێرایە سەر زمانی رووسی[٣٠٥] و هەروەها فارسیش.[٣٠٦]

---

(٢٩٧) بڕوانە: پێرست .

(298) Iranica،pp.327-332.

(299) Le Recueil Trascaucasien de Musud b.Namdar (126 siecle)، J.A،1949، tome، CCXXXVII، No.I،pp.93-143.

(300) The Georgian Maliks of Ahar. The Prince Orbelli in Persis، BSOAS، 1951، Vol.XIII/4 ،pp.868-877.

(301) The Alan Capital Magas and the Mongol Campaigns، BSOAS،1952، Vol.XVI/2، pp.221-238.

(302) Sahl b. Sumbat. The Caucasian vassals of Marzubau in 344/955، BSOAS ،1953،Vol.XV/3،pp.504-529.

(303) A History of Sharvan and Darband in the 10th -11th century، (Cambridge: 1958)، 187+32(Arabic)pp.

(٣٠٤) بڕوانە: پێرست .

(305) Minorsky، Iranica، p.xxvi.

(٣٠٦) موحسین خادم وەریگێراوە و عەبدول حسێن ئازەرنك پێدا چۆتەوەو بە ناوی ؛ مێژووی شێروان و دەربەند ؛ (تهران : ١٣٧٥ هـ . ش .

گورگیس عەواد دەڵێت گوایە بۆ عەرەبیش وەرگێڕاوە[٣٠٧]، بەڵام بەڵگەیەکی بابەتیانەی سەلماندنی قسەکەی پێ نییە.

هەوارێکی دیکەی بەبرشتی مێژوویی لای مینۆرسکی سەدەی پازدەمە ، (بوزورث)ی رۆژهەڵاتناس گوتەنی ((مێژووی بنەماڵە تورکمانییەکان لە سەدەی پازدە سیحرێکی "جاذبیة"کی تایبەتی بۆ ئەو هەیە – واتە بۆ مینورسکی))[٣٠٨]، لەو ماوەیەدا ئەو لێکۆڵینەوانەی بڵاوکردوونەتەوە : لە ساڵی (١٩٥٣) بابەتێکی بە ناوی (فەرمانڕەوایانی عەشیرەتی قەرە قوینلو)[٣٠٩] بڵاوکردۆتەوە؛ لە ساڵی (١٩٥٤)یش باسێکی لە بارەی (سەردەمی مەغول ٧٢٠ ك/١٣٢٠ ز و خێزانی شێخ زاهید)[٣١٠] بڵاوکردەوە، لە ساڵی (١٩٥٥) یش لێکۆلینەوەی زۆری بڵاوکردەوە: (قەرە قۆنیلو و قوتب شاه)[٣١١] و (ئاق قۆینلو و چاکسازی زەوی)[٣١٢] و (تۆماس مەثنەوی لە شەڕەکانی تەیموریە تورکمانییەکان)[٣١٣]. لە ساڵی (١٩٥٧) یش بابەتێکی لەبارەی (ئێران لە نێوان ساڵانی ١٤٧٨-١٤٩٠ز)[٣١٤] بڵاوکردەوە ، هەروەها لێکۆڵینەوەیەکیشی بە ناوی (بالی ئەفەندی لە فەرمانڕەوایەتی سەفەوی)[٣١٥]بڵاوکردەوە، لە ساڵی(١٩٥٨) یش لێکۆڵینەوەیەکی بە ناوی ئێران لە سەدەی پازدە) [٣١٦] بڵاوکردەوە و هەر

---

(٣٠٧)بڕوانە: ماضی الاکراد وحاضرهم فی المصادر العربیة القدیمة و الحدیثة، (بغداد:١٩٩١)، ص٣٤.

(308) Iran، p. vii.

(٣٠٩) بڕوانە: پێرست .

(٣١٠) بڕوانە: پێرست .

(311) The Qara-qoyunlu and the Qutb shahs، BSOAS،1955،VolXVII/1، pp.50-73.

(312) The Aq-qoyunlu and Land reforms، BSOAS،1955، Vol،XVII/3، pp.449-462.

(٣١٣) بڕوانە: پێرست .

(٣١٤) بڕوانە: پێرست .

(315) Bali-efendi on the Safavids، BSOAS،1957، Vol،XX، pp. 437-540.

(٣١٦) بڕوانە: پێریست . Iranica.pp317-326

لە هەمان ساڵیشدا بابەتێکی بە ناوی (کتێبێکی نوێی لەبارەی خەزەر)[٣١٧] بڵاوکردەوە .

لە لایەکی دیکەوە مینۆرسکی بایەخی بە مەڵبەندی ئاسیای نێوەڕاست دەدا کە یەکێ لەو ناوچانە بوو، لێکۆڵینەوەی لە بارەیەوە نووسیوە ، لەو هەوارەدا وەرگێڕانی کارەکانی بارتولد گەورەترین بەشدارییە لەو بابەتە، بە هاوکاری خێزانەکەی چوار کتێبی ئەو ڕۆژهەڵاتناسە ناودارەی بڵاوکردەوە . لە ساڵی (١٩٥٦) هەردوو کتێبی (پوختەی مێژووی تورکستان) و (مێژووی سمیرجی)[٣١٨] وەرگێڕا ، لە ساڵی (١٩٥٨) یش کتێبی (ئۆلوغ بەگ و سەردەمەکەی)[٣١٩] وەرگێرا و لە ساڵی (١٩٦١) یش وەرگێرانی (میرعەلی شیر و مێژووی گەلی تورکمان)ی[٣٢٠] بڵاوکردەوە .

ئەو کتێبە وەرگێڕاوانەی بارتولد کە لە ڕووسییەوە کراونەتە ئینگلیزی لە لیدن بڵاوکراونەتەوە، وادیارە هاوسەری مینۆرسکی نەخشی سەرەکی لەو کارانەی لە ڕووسییەوە وەرگێڕدراون هەبێت ، هەروەك لە نامەکانی مینۆرسکیشدا دیارە[٣٢١].

لەگەڵ ئەوەی مینۆرسکی حەزی لەو لێکۆڵینەوانە نییە کە شەقڵی گشتیان پێوە دیارە وەك خۆی لێکی داوەتەوە — بەرای خۆی — ئەرکی سەرەکی ئەو ئامادەکردنی ئەو جۆرە لێکۆڵینەوانەیە کە لە دواڕۆژدا بتوانێ لێکۆڵینەوەی درێژ و تەواو و بەسەروبەر بنووسێت.[٣٢٢] کەچی چەندین لێکۆلینەوەی لەو جۆرەی

---

(317) Anew book on the Khazars، Oriens، 1958، Vol.XI/2،pp.122-145.

(318) Ashort History of Turkestan and A History of Semirechye، (Brill، Leiden:1956)، 183pp.

(319) Ulugh-beg and his time، (Brill، Leiden:1958).

(320) Mir Ali Shir and An outline of the History of the Turkman People،(Brill، Leiden:1961)، 180pp.

(٣٢١) نامە بۆ تەقی زادە لە١٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٦و نامەیەکی دیکەش لە ڕۆژی ١٣ی تشرینی دووەمی ١٩٥٦ .

(322) Iranica، pp.vii.

نووسیوە[٣٢٣] لە ساڵی (١٩٥٥)دا باسێکی بە ناوی (ئێران ئایین و مێژوو) لە نێو کتێبی (یەکیەتی و هەمەڕەنگ)ی بڵاوکردەوە، کە فۆن کرونیباومی ڕۆژهەڵاتناسی نەمساوی سەرپەرشتی دەرچوونی کرد بوو ، لە ساڵی (١٩٥٦) یش باسێکی بە ناوی (ئێرانی ئیسلامی) بڵاوکردەوە ؛ هەر لەو ماوەیەدا بایەخی بە مێژووی کۆنیش دەدا، ئەوە بوو لە ساڵی (١٩٦٧) باسێکی بە ناوی (پەڕینەوەی گریکەکان لە رووباری سیحون)[٣٢٤] بڵاوکردەوە، ئەوەیان یەکێکە لەو کارانەی هاوسەری مینۆرسکی دوای مردنی مێردەکەی بڵاوی کردەوە .

ئەو هەموو ساڵانەی کە خەریکی گوتنەوەی ئەدەبی فارسی بوو وای لێ کرد لەو ماوەیەدا لێکۆڵینەوەی جۆراو جۆر لەبارەی ئەو بابەتە بنووسێت ، ئەوە بوو بایەخێکی زۆر زۆری بە داستانی (وەیس و وارمین)– ناودارترین داستانی فارسی لەو ماوەیە دەدا ، چوار لێکۆڵینەوەی لە ساڵانی (١٩٤٦ ، ١٩٤٧ ، ١٩٥٤، ١٩٦٢)[٣٢٥] نووسی ، هەر بە ئەوەندەشەوە نەوەستا کاتێ کە زانکۆی تاران بواری بۆ رەخساند هەندێ لە لێکۆڵینەوەکانی کۆبکاتەوە. بابەتی (وەیس و وارمین) یەکێ لەو لێکۆڵینەوانەی بوو ؛[٣٢٦] بەڵام سەر لە نوێ هەر چوار باسی بە شێوەیەکی تەواو جیا نووسییەوە . سەرباری بایەخدانی بە ئەدیبە ناودارەکانی ئێرانی وەك خاقانی کە باسێکی بە ناوی (خاقانی و ئیمپراتۆری بێزەنتی ئەندرونیکوس)[٣٢٧] لەبارەیەوە نووسی .

---

(٣٢٣) بروانە: پێرست .

(324) A Greek Gossing on the Oxus. BSOAS،1967، Vol.XXX/I، pp.45-53.

(325) Vis –u- Ramin، a Parthian romance(I)، BSOAS،1946،_ Vol،XI/4، pp.741-763;Vis-u- Ramin(II)، BSOAS،1947، Vol، Xii/1، pp.20-35; Vis-u-Ramin(IV)، BSOAS، 1962، Vol،XXV/2، pp.275-286.

(326) Iranica، pp.151-199.

(327) Khaqani and Andronicus Comnenus، BSOAS،1945، Vol، XI، pp.550-578.

هەرچەندە لە- ئینسکلوپیدیای بەریتانی[٣٢٨]- لەبارەی هەردوو شاعیری ناوداری فارس (سەعدی) و (عومەر خەیام)ی نووسیوە ، بەڵام هەربەوەندە وازی نەهێنا لە دوو تۆژینەوەدا دەستی کرد بە تۆژینەوە لە دەقە هەرە کۆنەکانیان،[٣٢٩] یەکیان : (دەقێکی بەرایی بۆ پێشەکی شانامە) و تۆژینەوەیەکی دیکەش بە ناوی (کۆمەڵە شیعرەکانی بەرایی عومەر خەیام). لەبارەی ئەدەبی تورکیش چەندین لێکۆڵینەوەی نووسیوە . لە ساڵی (١٩٥٤) باسێکی بە ناوی (سوڵتان جیهان شاە ، قەرەقوینلو و شیعرەکانی) [٣٣٠] و لە هەمان ساڵیشدا بۆ تەواو کردنی ئەو بابەتەی کە لە بارەی (هەقەکان)ەوەی نووسیبوو، باسێکی بە ناوی (شیعرە تورکییەکانی لە بارەی ئەهلی هەق)ەوە[٣٣١]. هەروەها لە ساڵی (١٩٥٦)یش دوو لێکۆڵینەوەی شاعیرێکی مەغولی بڵاوکردەوە (بوریهای مەغولی)[٣٣٢] و (بوربها و شیعرەکانی)[٣٣٣].

لە بواری بایەخدانی بە زمان و هونەریشەوە : دوو تۆژینەوەی[٣٣٤] لە سەر هەندێ بابەتی زمانەوانی دیاریکراو لەو ماوەیەدا نووسیوە : (عینەلو) کە لە ساڵی (١٩٥٣) و (تابور) لە ساڵی (١٩٦٠) بڵاوکراونەتەوە .

مینورسکی بایەخی بە هونەریش داوە . هەروەك چۆن ژیانی پڕ کاری زانستی بە بەشداربوون لە کۆنگرەی فارسی ساڵی (١٩٣٠) دەست پێ کرد ، ئەوا دەبینین لە دوا دوایی ژیانیدا بەشداری لە کۆنگرەی هونەری تورکی ئەنقەرە دەکات، کە لە ساڵی ١٩٦١ بەسترا ، باسێکی لەبارەی (دەستنووسە تورکییەکان لە کتێبخانەی جستربیتی) پێشکەش کرد ، ئەویش بەری رەنجی کاری

---

(328) Sadi، EB، 15ed، Vol.X، p.293; Omur Khiam، EB، 15ed، Vol. VIII ، pp.945-946.

(٣٢٩) بڕوانە: پێرست .

(330) Jihan–shah Qra-qoyunlu and his Poetry،BSOAS،1954،Vol،XVI/2، pp.

(٣٣١) بڕوانە: پێرست .

(332) Pur-iBahas Mongolode، BSOAS،1956، Vol. XVIII/2، pp. 261-278.

(٣٣٣) بڕوانە: پێرست .

(٣٣٤) بڕوانە : پێرست .

بەردەوامی چەند ساڵەی بوو لە دبلن بۆ یەکەمین جار لە ساڵی (١٩٥٨) لێکۆڵینەوەیەکی بە ناوی (پێرستی دەستنووسە تورکییەکان لە کتێبخانەی جستربیتی)[٣٣٥] بلاوکردەوە، رۆژهەلاتناسان ئەوکارەیان زۆر هەڵگێرو وەرگێڕ و سەروسۆرخ کرد.[٣٣٦] تا سالانی دوا دوای تەمەنیشی هەست کردنی بە جوانی لە دەست نەدا بوو، کاتێ کە لە تەمەنی هەشتاو دوو ساڵی باسێکی بە ناوی (لێکۆڵینەوە لە نامەی قازی ئەحمەدی کوڕی میرمنشی (١٠١٥ ك/١٦٠٦ز )[٣٣٧] نووسی .

لە ئاکامی سەروسۆراخ کردنی رەوتی رۆشنبیری ولاتەکەی و ئاگادار بوون لێی؛ بەردەوام خەریکی نووسین بوو لەبارەیەوە . لە ساڵی (١٩٤٧) یش باسێکی بە ناوی (لێکۆڵینەوە مام ناوەندیەکان لە رووسیای سۆڤێتی)[٣٣٨] نووسی. هەر لەو ماوەیەدا لەبارەی ناودارانی مێژووی نووسیوە یان بەشداری چلەی برادەرەکانی کردووە . لە ساڵی (١٩٤٥) وتارێکی تایبەتی بۆ چلەی سیرپرسی کوکسی رۆژهەلاتناس و دبلوماسی بەریتانی نووسی[٣٣٩] . لە ساڵی (١٩٤٨) یش لێکۆڵینەوەیەکی لە بارەی جوگرافیاناسی فارسی (جیهانی) خاوەنی کتێبی (المسالك و الممالك) بەناوی جیهانی ساختە)[٣٤٠] نووسی و پەردەی لە رووی زۆر راستی دەگمەن هەڵماڵی و لە بەر گرنگی بابەتەکە بۆ فارسی وەرگێڕدرا.[٣٤١] لە

---

(٣٣٥) بروانە : پێرست .

(336) Sir G.Clauson، Review of Minorskys the chester Beatty library، JRAS.1959، Parts 1-2، pp.54-55.

(٣٣٧) بروانە: پێرست .

(٣٣٨) بروانە : پێرست .

(٣٣٩) بروانە : پێرست .

(340) Afalse Jayhani، BSOAS،1948، Vol. XII/4.pp. 89-96.

(٣٤١) میرحوسێن شاە بەناوی جیهانیێ کە جیهانی نەبوو، وەریگێراوە و لە گۆڤاری أریانا، (تهران: ١٣٤٦ هـ. ش) ، ش٦ ، لا ٢٨ — ٢٧ . بلاوکراوەتەوە .

ساڵی (١٩٥١)یش باسێکی بە ناوی (هەندێ هەواڵدەر لە بارەی بیرونییەوە)[٣٤٢] بڵاوکردەوە.

لە ساڵی (١٩٥٢) و بە هاوکاری هاوسەرەکەی کتێبی ئە. کراجکوفسکی. ڕۆژهەڵاتناسی ڕووسی بە ناوی (لە نێو دەستنووسە عەرەبیەکاندا )ی[٣٤٣] وەرگێڕا. لە ساڵی (١٩٥٤) و لە بیرەوەری پێنجەمین ساڵەی کۆچی دوایی محەمەد قەزوینی زانا، وتارێکی بە ناوی (بە یادی قەزوینی) [٣٤٤] بڵاوکردەوە. لە دوایشدا لە ساڵی (١٩٦٠) وتارێکی لەبارەی (بلیکزی ئەمیرفینس )[٣٤٥] بڵاوکردەوە.

لەو ماوەیەدا لێکۆڵینەوەی جوانی لە بواری کوردناسی نووسی وەك : لە ساڵی (١٩٤٩) لێکۆڵینەوەیەکی بە ناوی (هۆزەکانی ڕۆژئاوای ئێران) [٣٤٦] بڵاوکردەوە ، لە ساڵی (١٩٥٠) یش باسێکی لەبارەی (کۆنترین دەق بە کوردی) [٣٤٧] بڵاوکردەوە ، لە ساڵی (١٩٥٣) یش باشترین لێکۆڵینەوەی خۆی لە مێژووی کورد لە سەردەمی ئیسلامەتی بەناوی. (تۆژینەوە لە مێژووی قەفقاس)[٣٤٨] بڵاوکردەوە ، لە ساڵی (١٩٥٧)) یش باسێکی لەبارەی کوردستانی ڕۆژهەڵات بە ناوی (ناوی مەغولی هەندێ شوێن لە کوردستانی موکریان)[٣٤٩]. هەرکە دەستەی ئامادەکارانی ئینسکلوپیدیای ئیسلامی دەستیان بە دەرکردنی چاپێکی تازە

---

(٣٤٢) بڕوانە : پێرست .

(٣٤٣) بڕوانە : پێرست .

(٣٤٤) بیاد قزوینی ، وتارەکە لە گۆڤاری یغما، (تهران : ١٣٣٣ هـ ، ش) ؛ ج٨ ٧ ٢٠ – ٢٢ . بڵاوکراوەتەوە .

(٣٤٥) بڕوانە : پێرست .

(346) The Tribes of Western Iran، JRAI، 1949، Vol، 75/1-2، pp.73-80.

(347) Le Plus Ancien Texte En Kurde، Bulletin Mensuel Du Center D etudes Kurdes. (Paris:1950)، no. 10،pp.8-10.

(348) Studies in Caucasian History، (London:1953)، 178+18(Arabic)pp.

(349) Mongol place-name in Mukri Kurdistan، BSOAS،1957، Vol. XIX/1، pp. 58-81.

کرد، مینۆرسکی به بیست و سێ وتار[٣٥٠] له نێوان سالانی ١٩٥٤ – ١٩٦٢ ) بەشداری کرد . هەروەك چۆن له چاپی یەکەمدا بابەتبەندی کرابوو لە بارەی هەرێم و شارەکانی : له ساڵی (١٩٥٤) لەبارەی (ئابادان و ئەبرقوە و ئابسکون و عەباس ئاوا و ئەبهەر و ئازەربایجان) ی نووسیوە . له ساڵی (١٩٥٦) یش وتاری لەبارەی (ئەخلاتیسك و ئەخلات و ئەلینجك و ئامێدی) نووسیوە . لە ساڵی (١٩٥٧) یش ئەو وتارانەی نووسیوە : (ئەندراب) و (ئەنابا) و (ئانی) . لەبارەی هۆزو رەگەزەکان : له ساڵی (١٩٥٤) وتارێکی لە بارەی (ئەبخاز) و لە ساڵی (١٩٥٦) یش وتارێکی له بارەی (لان) وله ساڵی (١٩٥٨)یش وتارێکی لە بارەی (بهارلو) بڵاوکردەوە ، دوامین وتاریشی کە له ئینسکلوپیدیای بڵاوکردبێتەوە لە ساڵی (١٩٦٢) له سەر ( دەیلەم)ە کان بوو ، لەبارەی ناودارانی مێژووش ، لە ساڵی (١٩٥٤) وتارێکی لە بارەی (ئەبو دەلەف) و لە ساڵی (١٩٥٨) یش وتارێکی لەبارەی (بابە تاهیر) بڵاوکردەوە. جارێکی دیکەش هاتەوە سەر نووسین له بارەی (تایفەی ئەهلی هەق) .لەبارەی بنەماڵە فەرمانڕەواییەکانیش لە ساڵی (١٩٥٤) دوو وتاری بەناوی (ئەحمەدیلی و ئاق قۆینلو) لە ساڵی (١٩٥٧) یش وتارێکی لە سەر میرنشینی (عەنازی) بڵاوکردەوە . هەرلەو ماوەیەدا مینۆرسکی نزیکەی بیست کتێب و لێکۆڵینەوەی رۆژهەڵاتناسانی بەسەر کردۆتەوە و لیێان دواوە و سێزدەیان لە گۆڤاری (خوێندنگا) بڵاوبوونەتەوە .

### ح – رێزلێنانی :

بێ گومان کاروانێکی وابە بڕشتی زانست و تۆژینەوەی رۆژهەڵاتناسی زۆر به بەرزی و بەرێزی به سەر مینۆرسکیدا شکایەوە . بڕوانامە و پایەی شانازی زۆریان پێ بەخشی و خەڵاتی جۆراو جۆریشی پێ وەرگرت[٣٥١]، لە ساڵی

(٣٥٠) تۆژەر ئەو وتارانەی بینیوە ، بۆ ئاگاداری بڕوانە: پێرست .

(٣٥١) بۆ درێژەی بڕوانە: نامەی مینورسکی بۆ ئەفشار له ٢٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٦١؛ میر حسین شاه بەیاد استاد مینورسکی، وتارەکە له گۆڤاری آریانا، (تهران: ١٣٤٥ هـ .ش) ش٢٦٣، ل ٣٤٠،

(١٩٤٣) بووه ئەندامی شانازی ئەکادیمیای زانستی بەریتانیا ، تا دوای خانەنشین بوونیشی هەر بە ئەندامی شانازی خوێندنگا مایەوە . لە ساڵی (١٩٤٦) بە ئەندامی شانازی کۆمەڵەی ئاسیایی لە پاریس، دانرا ، لە ساڵی (١٩٤٨) یش بە مامۆستای شانازی زانکۆی بروکسل دامەزرا ، لە ساڵی (١٩٥٧) یش بووە ئەندامی شانازی کۆمەڵەی رۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی و لە ساڵی (١٩٦١) ئەندامی شانازی ئامۆژگای لێکۆڵینەوەی ئیسلامی. لە ١٠ ی مایسی ساڵی (١٩٦٢) یشدا مەدالیای زێرینی کۆمەڵەی ئاسیای بەریتانیایی وەرگرت کە ئەوەی زانایەکی بەرز نەبێت وەری ناگرێت . وێرای هەموو ئەمانە لە ساڵی (١٩٦١) بە مامۆستای شانازی زانکۆی کمبریج هەڵبژێردرا بوو .

لە لایەکی دیکەوە چەندین کاری رێزلێنانی لە بارەوە چاپکران، یەکەمیان دەرکردنی ژمارەیەکی بیرەوەری گۆڤاری (خوێندنگا)یە لە ساڵی (١٩٥٢) بە بۆنەی حەفتاو پێنجەمین ساڵەی تەمەنی[٣٥٢]؛ لە جەژنی لە دایك بوونی هەشتا ساڵەی زانکۆی مۆسکۆش بروسکەی پیرۆزبایی بەو بۆنەیەوە بۆ لێدرا[٣٥٣]، ئەمە سەرەڕای ئەو رێزلێنان و پێشوازییە گەرم و گوڕەی کە رۆڵەکانی وڵاتەکەی لێیان کرد، کاتێ کە بۆ کۆنگرەی رۆژهەڵاتناسی لە مۆسکۆ ساڵی (١٩٦٠) میوانداری کرابوو[٣٥٤] .

زانکۆی تارانیش ئارەزوویەکی خۆشەویستی مینۆرسکی بە جێ گەیاند کاتی کە هەڵبژاردەیەکی لێکۆڵینەوەکانی بە کتێبێکی سەربەخۆ بە ناوی (ئێرانیکا Iranica) لە ساڵی(١٩٦٤) بڵاوکردەوە. جێی سەرنجە کە هەرئاوا وەك خۆی بڵاوی نەکردنەوە ، بەڵکو دەستێکی باشی پێدا هێناون، کاتێ کە ج.

---

بڵاوکراوەتەوە" مینورسکی؛ الاکراد؛ مقدمة المترجم ، Minorsky, Iranica, P.xi, Lang. The obituary, pp.697-698.

(352) BSOAS,1952, Vol. XIV,pp. 670-682.

(٣٥٣) نامەی مینۆرسکی بۆ تەقی زادە لە ٢٢ ی مارسی ١٩٥٧ .

(٣٥٤) بۆ درێژەی بروانە : نامەی مینۆرسکی بۆ تەقی زادە لە ٨ ی ئابی ١٩٦٠ ؛ نامەی مینۆرسکی بۆ جهانبهانی لە ساڵی ١٩٦١ . بروانە : جیهانبهانی ، برفیسور ولادیمیر لا ١٦٥ -- ١٦٦ ، کارنك ، ملاقات ، ل١ ، ١ : تقی زاده ، در رثای ؛ لا ٦-٧ .

بویلی رۆژهەڵاتناسی ئەمریکی ئەو کتێبەی خوێندەوە و زۆر ئامانجی پێکاوە دوای کۆکردنەوەی هەموو لێکۆڵینەوەکانی لە کتێبێکدا بلاّوکردەوە، وەك ئەمەکدارییەك بۆ ئەو زانایە[٣٥٥].

**د . کۆچی دوایی**

مینۆرسکی دواساڵەکانی ژیانی لە ماڵەکەی لە کمبریج بە سەربرد ، بەو تەمەنە و لە هەرەمەی پیریدا، ناوە ناوە نەخۆشی بە سەری دەکردەوە[٣٥٦]، بەڵام ئەوەیان لە تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی نەخست ،لە لایەکی دیکەشەوە پێوەندی بە برادەرەکانییەوە نەبڕی بوو، چوار رۆژ بەر لە مردنی نامەی پیرۆزبایی بە بۆنەی جەژنی نەورۆز بۆ برادەرە ئێرانییەکانی ناردبوو[٣٥٧]، لە بیست و پێنجی مانگی مارتی ساڵی (١٩٦٦)[٣٥٨]، دوای هەشتاو نۆ ساڵ و پەنجا رۆژ تەمەن ، کۆچی یەکجارەکی کرد . بە بلاّوبوونەوەی هەواڵی کۆچی دوایی مینۆرسکی ناودارترین رۆژنامە و گۆڤارە زانستییەکانی بەریتانیا و فەرەنسا و ئێرانی لە سەریان نووسی[٣٥٩]. (محەمەد رەزاشای پەهلەوی) خۆی نامەیەکی پرسە و سەرەخۆشی بۆ هاوسەرەکەی نارد، سۆز و پەژارەی خۆی سەبارەت بە مردنی مێردەکەی دەربڕی [٣٦٠]، کۆڕێکی پرسەی لە زانکۆی تاران بە ئامادەبوونی سەرۆکی ئەو کاتەی زانکۆ بۆ گێرا و هاوڕێکانی وتاری بیرەوەرییان تێدا خوێندەوە[٣٦١].

ئێرانییەکان مینۆرسکیان لە بیر نەچوو، زانکۆی تاران لە ساڵی (١٩٦٩) کتێبێکیان بە ناوی (بیرەوەری مینۆرسکی لە ئێران) چاپ کرد کە وتاری

---

(355) Review of Minorskys Iranica، BSOAS،1966، Vol. XXIX/2.p.624.

(٣٥٦) نامەی مینۆرسکی بۆ تەقی زادە لە ١٥ ی مارتی ١٩٦١ .

(٣٥٧) نامەکانی بۆ تەقی زادە و کارنك و سیاقی .

(٣٥٨) جهانبهانی . برفیسور ولادیمیر ، لا ١٦٥ -- ١٦٦

(٣٥٩) مینورسکی ، الاکراد ، مقدمة المترجم ، ص ص١٠ –١١ ؛ The Times, 28 mar 1966.

(٣٦٠) نامەی خانمی مینۆرسکی بۆ جهانبهانی دوای مردنی مێردەکەی. بڕوانە: جهانبهانی، پرفیسور ولادیمیر ، لا١٦٥ – ١٦٦ .

(٣٦١) بۆدرێژەی بڕوانە : مینوی ؛ یادنامە ؛ لا أ – م.

سەرۆکی زانکۆ و هاورێکانی مینۆرسکی و تۆژینەوەی جۆرا و جۆر و پێرستی تەواوی کارەکانی مینۆرسکی گرتبووە خۆ[٣٦٢]. پێنج ساڵ دوای مردنی زانایانی جۆرا و جۆری رۆژهەلات و رۆژئاوا کۆبوونەوە و کتێبێکی بیرەوەریان بە ناوی (ئیران و ئیسلام) دەرکرد و حکومەتی ئێران خەرجی چاپکردنی گرتە ئەستۆ[٣٦٣] هەروەها رووسەکانیش رۆڵەی ئازیزی خۆیان فەرامۆش نەکرد و تا ساڵی١٩٨٠[٣٦٤] چەندین بیرەوەرییان بۆ کرد . هەرچی خانمی مینۆرسکی بوو راسپاردەکانی مێردەکەی بە دڵسۆزی راپەراند ، لە ساڵی(١٩٦٧) بەشێکی هەرە گرنگی کتێبخانەکەی بە دیاری دا کتێبخانەی ئامۆزگای رۆژهەلاتناسی لە لینینگراد[٣٦٥]. سەرباری ئەوە ئێسك و پروسکی مێردەکەی گواستەوە بۆ دێری نوفودفیجی لە مۆسکۆ . وێرای ئەمانەش دووکاری مێردەکەی بلاوکردەوە ،هەر لەو خانووەی کمبریجیش مایەوە و تەنانەت ئەو ولاتەشی بەجێ نەهێشت کە مێردەکەی لە ژیانیدا هەڵیبژارد بوو[٣٦٦] .

---

(٣٦٢) مینوی ، یادنامه ، لا أ – م

(363) Bosworth، Iran and Islam (Edinburgh:1971).

(٣٦٤) بۆ درێژەی بروانە : موسیلیان ، بیبلیوغرافیا ؛ ج٢ . لا ٧٩٠ – ٧٩١

(٣٦٥) مینورسکی ، الاکراد ، مقدمة المترجم؛ ص١١ ؛ Bosworth. OP.cit, p.viii.

(366) Ibid.

## بەشی دووەم

### نووسینەکانی مینۆرسکی لەبارەی کوردەوە هەر
### لە سەردەمی ئیسلامەتی تا دامەزراندنی خەلافەتی عوسمانی

یەکەم : مەڵبەند و شارەکانی کوردەواری .
دووەم : تایفەی ئەهلی هەق ( کاکەیی )
سێیەم : هۆزە کوردەکان
چوارەم : بنەماڵە کوردە فەرمانڕەواکان

## بەشی دووەم

### نووسینەکانی مینۆرسکی لەبارەی کوردەوە لە سەردەمی ئیسلامەتیدا

### یەکەم : مەڵبەند و شارەکانی کوردەواری .

بەگشتی بایەخدانی مینۆرسکی بە جوگرافیاوە لە جموجۆڵە سیاسییەکانییەوە سەرچاوەیان دەگرت ، هەرکە کارە دبلوماسییەکەی گرتە دەست، ئیدی هەلی بۆ رەخسا بە سەرتاپای وڵاتی ئێران و (تورکیا) بە کوردستانیشەوە بگەڕێت ، خوێندنی لە ئامۆژگای لازاریفی زمانە رۆژهەڵاتییەکان بواری بۆ رەخساند، لەگەڵ خەڵکی ئەو هەرێمانە پێوەندی بگرێت . کارەکەی خستە خزمەت شارەزا بوون و ناسینی لە نزیکەوەی هەموو لایەنەکانی ئەو ناوچانەی کە سەردانی دەکردن ، بۆیە کاتێ بۆ ئەورووپای رۆژئاوا لە کۆچێی نا لە دوو خاڵەوە لە رۆژهەڵاتناسە رۆژئاواییەکان باڵا دەست تر بوو :

أ – زانین و شارەزایی لە زمان و زاراوەی جۆراو جۆر .

ب – شارەزای وردی جوگرافیایی ئەو مەڵبەندانە بەگشتی و بایەخدانی بە مێژوویان .

زانای ئەکادیمی رۆژئاوا ئەو باڵا دەستییەیان بۆ سەلماند ، کاتێ کە رایان دەسپارد نووسین و وتاری جۆراو جۆریان لە بارەی هەرێم و شارە رۆژهەڵاتییەکان بۆ ئینسکلوپیدیای ئیسلامی بۆ بنووسێت .لە چاپی یەکەمی ئینسکلوپیدیادا دەوروبەری چل وتاری لەبارەی ئەو ناوچانە نووسیوە، زۆربەی شوێنەکان، کوردەواری بوون ، لە چاپی دووەمیشدا هەمان ئەرکیان پێ سپاردەوە و پتر لە دە وتاریان لەبارەی شوێنەکانی رۆژهەڵات پێ نووسی کە سێیانیان (کوردەواری بوون) (٣٦٧) .

هەموو ئەو وتارانەی مینۆرسکی شەقڵی زانیاری و شارەزای تایبەتی خۆی سەبارەت بەو هەرێم و شارانە بە سەردا زاڵە بە گوتە و بیروڕای مێژوونووس و وڵاتناسە موسڵمانەکان، دوڵەمەندی دەکردن . هەروا ئاسۆی وتارەکانی بە سەرچاوە رۆژهەڵاتناسییەکانیش فراوان کردووە ، چ رووسی یان ئەوانی دیکە .

---

(٣٦٧) بڕوانە: پێڕست .

لەلایەکی دیکەشەوە مینۆرسکی وتاری دوورو درێژی بۆ هەندێ مەڵبەند و شار تەرخان کردووە. بۆ هەندێکی کەشیان لاپەڕەیەك یان پتری بە گوێرەی بایەخیان نووسیوە .

بایەخدانی زووی مینۆرسکی بە جوگرافیاوە لەو راپۆرتە رەسمیانە دەردەکەوێت کە لە بارەی هەرێمی ئازەربایجان و هەردوو شاری مەراغە و ماکۆ و ئەوانی دیکەی نووسیوە و لە رۆژانی کاری دیبلوماسی داویەتیە وڵاتەکەی(٣٦٨) ، بەڵام جیاوازی نێوان راپۆرتە سیاسییەکان و وتارە ئەکادیمییەکانی ئەوەیە، کە لە یەکەمیان تەنیا پشتی بە دیتنە تایبەتییەکانی بەستووە، هەرچی لە دووەمینیاندا ئەوە سەرچاوەی جۆراو جۆری پشکنیوە — وەك پێشتر ئاماژەمان پێ کرد — لەگەڵ کردنەوەی خستنە رووی گەڵ لایەنی جۆراو جۆر بۆ گفتوگۆ لە سەرکردنی ، بە تەواویش جەختی لە سەر جوگرافیای مێژوویی دەکردەوە . لەو پێودانگەوە کارەکانی ئەو بوارەی لەم تەوەرانە دەدوێن:

### أ — جوگرافیای کوردستان :

یەکەمین کاری مینۆرسکی لەبارەی جوگرافیای کوردستان کتێبی (کورد)ە(٣٦٩) کە ساڵی (١٩١٥) نووسیوویەتی ، زانیاری گشتی و سەرتاسەری لەبارەی شوێنی کوردستان و وەسفی جوگرافیایی وەك خۆی گووتەنی: ((ئەگەر بەشەکانی سەرووی رووباری فورات و ناوچەکانی گۆمی وان (ئەرمینیای کۆن) لانە یان ((خاکی)) کۆنی پەیدابوونی کورد بێت ، ئەوا بەشەکانی خوارووی لە تۆرس و کەنارەکانی چەپی دیجلە (بۆتان ، خەرپوت ، زێی گەورە بە بڕوای من زێدی گەلی کوردن لە رۆژگارە مێژووییەکاندا))(٣٧٠) .

پاشان بەرنامەیەك بۆ چۆنیەتی تۆژینەوە لە وڵاتی کوردان دیار دەکات و دەڵێت ! ((ئەگەر بمانەوێ لە زێدی کورد هەر لە بەرەبەیانی مێژووە و بتۆژینەوە ئەوە پێویستە بچینە بەشەکانی رۆژهەڵاتی دوور و خواروو؛ ئەو سێ

---

(٣٦٨) بڕوانە: بەشی یەکەم .

(٣٦٩) بڕوانە : الاکراد ؛ ص ص١٢ — ٢٠

(٣٧٠) نفسە؛ ص١٤ .

ناوچانە زێدو وڵاتی کوردانن : زنجیرە چیا بەرزەکان لە ئەرمینیا ، کوردستانی تورکیا و چیای رۆژئاوای فارس ))(٣٧١) . تێڕوانینیشی لەبارەی جوگرافیای کوردستان ئاوا پوخت دەکاتەوە : ((بەگشتی دەتوانین بڵێین ، کوردو چیا لێك جیا نابنەوە ، هەر کە دەشتایی دەست پێ دەکات ئەوا کورد زەوییەکە بۆ عەرەب و تورك و لە دەوروبەری گۆمی وانیش بۆ ئەرمەنەکان ، بەجێ دەهێڵێت)) (٣٧٢) .

جێی سەرنجە کەوا مینۆرسکی لە کرۆکی تۆژینەوەکەیدا پشتی بە شارەزایی ئەزمونی تایبەتی خۆی و سەرچاوە رۆژهەڵاتناسییەکان بەستووە ، لەبەر بایەخ و زانیاری تازەی تۆژینەوەکەشی، بەر لە بڵاوکردنەوەی لە کۆڕی (کۆمەڵەی رۆژهەڵاتناسانی رووسی) لە مۆسکۆ، خوێندییەوە(٣٧٣) . هەرکە دەستەی نووسەرانی ئینسکلوپیدیای ئیسلام رایانسپارد باسێکی تێرو پڕ لە سەر کورد و کوردستان بنووسێ ، لە نووسینەکەیدا بە وردی پێناسەی کوردستانی لە لایەنی جوگرافی و مێژوویی کردووە و لە سەرەتای تۆژینەوەکەیدا، مێژووی بە کارهێنانی یەکەمین جاری زاراوەی (کوردستان) ی نووسیوە. قسەی حەمەدوڵلا مستوفی(٣٧٤) لە(٧٥٠ ك/ ١٣٤٩ ز کۆچی دوایی کردووە) هێناوەتەوە کە دەڵێت زاراوەی کوردستان لە لایەن سەلجوقییەکانەوە وەك ناوێکی کارگێڕی مەڵبەندی وڵاتی کوردانی نێوان ئەزەربایجان و لورستان، داهێنراوە ، پایتەختەکەشی (بەهار) ی باکووری خۆرئاوای هەمەدانە . ئەو مەڵبەندە لە شازدە شار پێك دێت . پاشان بە پاڵپشتی سەرچاوەی جۆراو جۆر ئەو گۆڕانانەی بەسەر زاراوەی کوردستاندا هاتووە لەگەڵ ئەو سەردەمە مێژووییانەی دواتر دەگاتە سەدەی بیستەم بەسەر دەکاتەوە .(٣٧٥)

---

(٣٧١) نفسه.

(٣٧٢) نفسه، ص١٥ .

(٣٧٣) نفسه، ص ١٢ .

(٣٧٤) نزهە القلوب : تحقیق محمد دبیرسیاقی؛ (تهران:١٣٣٦ هـ.ش) ؛ل ١١٧ بەدواوە.

(375) Kurdistan. EI[1].Vol.IV،pp.1130-1132.

هەر لە هەمان وتاردا بە پشت بەستن بە قسەی ولاتناسانی ئیسلامی وەك ئیستەخری (لە دوای سالٚ ٣٤٠ ك/٩٥١ ز مردووە) و مەسعودی (لە ٣٤٦ ك/ ٩٥٧ ز مردووە) و مەقدەسی (لە٣٧٨ ك/٩٧٨ ز مردووە) و مسکویە (لە ٤٢١ ك/ ١٠٣٠ ز مردووە)(٣٧٦)، ئامارژە بە هەردوو ناوچەی هەرێمی فارس و خوراسان دەکات کە کوردیان تێدا نیشتەجێن . کاتیٚ کە ئەو لاپەڕانەی مینۆرسکی لە بارەی هەرێم و شارە کوردەوارییەکان لە ئینسکلوپیدیای ئیسلامی نووسیوە، هەلّدەدینەوە، دەردەکەویٚ کە کرۆك و ناوەرۆکی نووسینەکانی لەو بارەیەوە لەم تەوەرە سەرەکیانە دەدوێت .

سەرەتا مینۆرسکی پێناسەیەکی زۆر کورتی هەرێم یان شارەکە دەکات ... ئینجا ناوەکەی بە پالّپشتی زانیاری و شارەزایی زمانەوانی خۆی شی دەکاتەوە ، پاشان تخووبەکەی بە پالّپشتی زانیاری تایبەتی خۆی و گەواهی سەرچاوە ئیسلامی و ڕۆژهەلاّتناسییەکان بەیەکەوە ، دیاردەکات، ئینجا بەسەر لەبەری مێژووەکەیدا دەچێتەوە، هەر لە چاخەکۆنەکانەوە بگرە تاکو دەگاتە مێژووی هاوچەرخ، هەروەها ئامارژە بە پاشماوەی شوێنەوارەکانیش دەکات، تیشکی زۆریش دەخاتە سەر بارودۆخی مەسیحییەکانی شارەکە، لە کۆتاییشدا بیبلیوگرافیایەك بۆ ئەو سەرچاوانەی بە کاری هێناون، ساز دەکات .(٣٧٧)

لەبەر ئەوەی توێژینەوەکەی ئێمە لە چوارچێوەی مێژووی ئیسلامەتیدایە، بۆیە هەرێم و شارەکان لەلایەنی کارگێڕی هەر لە سەردەمی ئیسلامەتی بەسەر دەکەینەوە، چونکە وەك دەزانین ولاّتی کوردەواری لە نێوان ئەو هەرێمانەدا دابەش بووە: چیا، جەزیرەی فوراتی، ئازەربایجان، ئەرمینیا، فارس و

(376) Ibid،p.1135.

(٣٧٧) بۆیە کەدێینە سەر باسی هەر هەرێم و شارێك، ئامارژە بەو تەوەرانە ناکەین ، تەنیا لە کاتی پێویستی نەبێت ، بۆ ئەوەی دووبارە نەبێتەوە .

خوزستان[٢٧٨]. مینۆرسکیش لەسەر هەموو ئەو شارو شوێنانەی ئەو ناوچانای نووسیوە، بەڵام وەك یەك نا، ئێستاکەش گرنگترین ئەو قسانەی لەبارەی ئەو شارو هەرێمانەی کردوون بەسەر دەکەینەوە :

**ب / هەرێمی چیا** [٢٧٩]. :

سەبارەت بەو هەرێم و شارانەی دەکەونە ئەو هەرێمە ، لەساڵی ( ١٩٢٦ ) وتارێکی دوورو درێژی لەبارەی هەرێمی شارەزوور نووسیوە و دەڵێت : ((شارەزوور هەرێمێکە لە کوردستان ... پێدەشتێکی جوان و بەپیتە ))[٢٨٠]، مێژووی ئەو هەرێمە لە سەردەمە جیاجیاکان بەسەردەکاتەوەو دەنووسێ : ((شارەزوور لەسەردەمی ئیبن مهلهل (٣٣٠ ك / ٩٤٢ ز). ٦٠هەزار؟ (**فسطاطا**)ی کوردان هەبووە[٢٨١]))[٢٨٢] هەروەها ئاماژە بە فەرمانڕەوایەتی کورد لەناوچەکە دەکات و دەڵێت: ((بنەماڵەی حەسەنوەیهی کورد لەنێوان ساڵانی ٤٠٠ و ٤٣٤

---

(٢٧٨) سەبارەت بەسەردەمی ئیسلامەتی تاکو کۆتایی سەردەمی بویهییەکان. بۆ زانیاری پتر بڕوانە: زرار صديق توفيق ، الكرد في العصر العباسي حتى مجئ البويهيين، ر. م. غ. الآداب، (جامعة صلاح الدين / اربيل : ١٩٩٤ )، لا ١٥ – ٤٣ . وەك دەزانین گۆڕانکاری کارگێڕی زۆر بەسەر ئەو هەرێمەدا هاتووە. بۆ درێژەی بڕوانە: زرار صديق توفيق، كردستان في القرن الثامن الهجري، ر.د.غ. الأدب، ( جامعة صلاح الدين / اربيل: ٢٠٠٠)، لا ١٢–٣٠. هەر ئەو دابەشبوونە کارگێڕیانەیان پەیڕەو کردوە، چونکە مینۆرسکی خۆشی هەر ئەو دابەشبوونەی گرتۆتە بەر، بەپێی شارەزایی و ئاگاداری لەسەر سەردەمی بویهیدا. بۆ درێژە بڕوانە :
Hudud, pp.382-397.

(٢٧٩) کەوتۆتە نێوان بەشی باکووری خۆرئاوای ئێران یان وڵاتی فارس ، بەچیا ناسراوە، چونکە چیای هەزار بەهەزاری لێیە ، هەروەها ناوی دیکەشی لێنراوە، وەك : میدیا ، کوهستان . هەر لەکۆنەوە کوردی لێ نیشتەجێ بوونە . بڕوانە : ابن حوقل ؛ صورة الأرض، (بيروت : ١٩٧٩)، ص٣١٥ ؛ ياقوت ، معجم البلدان ؛ ج٤ ، ص١٢١ .

(٢٨٠) دائرة المعارف الأسلامية . ط١، ج١، ص٤١٨ .

(٢٨١) دەقی دەستەواژەکە لای ئیبن مهلهل ئەوەیە (( وڵاتەکەیان زستانەهەواری شەست هەزار ماڵی کوردی جۆراوجۆرە ... )). بڕوانە: نامەی دووەم ؛ پەترۆس بولغاکۆڤ ئەنەس خالدوف وەریان گێڕاوە و پەراوێزیان لێداوە و بڵاویان کردۆتەوە ، ( موسکۆ : ١٩٩٠ ) ل ١٨ .

(٢٨٢) شهرزور ، ص٤٢٠ .

فەرمانڕەوایەتی شارەزووریان دەکرد))[٣٨٣] ئینجا دەکەوێتە سۆراخی مێژووی کوردی شارەزوور و ئاماژە بە نیشتەجێ بوونی تایفەیەك بەناوی حوسەنە[٣٨٤] دەکات و دەڵێت : (( ئەوانە کوردی تەواو نینە. رەنگە ئەو ئاماژەیە بۆ ئەو هەورامییانە بێت کە هێشتا لەقەدپاڵی رۆژئاوای ئەو چیایانە دەژین))[٣٨٥] .

ئەوەی پێویستە ئاماژەی بۆ بکەین ئەوەیە مینۆرسکی لەکاتی دوان لەبارەی هەرێمی چیا لە کتێبی سنووری جیهان[٣٨٦]، باسی جوگرافیای ئەو هەرێمەشی کردووە . دوای نزیکەی بیست ساڵ کە خەریکی ساخکردنەوەی سەفەرنامەی ئەبی دلف ( مسعر بن مهلهل ) بووە هەمان قسەکانی پێشووی لەبارەی هەرێمی شارەزوور و مێژووەکەی گوتووتەوە[٣٨٧].

لەساڵی ( ١٩٢٧ ) لەبارەی شاری سیسری[٣٨٨] نووسیوە و دەڵێت شارەکە لەسەردەمی خەلیفەی عەباسی مەهدی ( ١٥٨ – ١٦٩ ك / ٧٧٤ – ٧٨٩ ز ) بۆ مەبەستی سیاسی دروست کراوە، چونکە ناوچەکە بۆتە پەناگەی چەتەو رێگران، لەمەشدا پشتی بەقسەی بەلازەری ( لە ٢٧٩ ك / ٨٩٢ ز کۆچی کردووە) و یاقوت حەمەوی (لە ٦٢٦ ك / ١٢٢٩ ز مردووە)[٣٨٩] بەستووە.

کاتێ کە مینۆرسکی بینی حەمەدوڵڵای کوڕی مستەوفی لەسەدەی هەشتەمی کۆچی / چواردەی زایینی، ناوی سیسر ناهێنێت و باسی چیای سینا دەکات ، هاتەسەر ئەو دەرەنجامەی کە لەسەدەی هەشتەمی کۆچییەوە ناوی سیسر بۆتە ( سینا ، سنە )، قسەی هەردوو رۆژهەڵاتناس فون هامرو تافرنییە دەکاتە بەڵگە[٣٩٠].

---

(٣٨٣) نفسه

(٣٨٤) ئەسڵەکەی حەوسەیە. بڕوانە: محمد مردوخ ، تأريخ مردوخ، ( تهران: د. ت) ج١ ، ل ٨٨.

(٣٨٥) شهرزور ، ص٤٢٠.

(386) Hudud, p.383.

(٣٨٧) سفر نامه ، ابودلف ، ل ١١٢ – ١١٨

(٣٨٨) بڕوانە: نەخشە لە پاشکۆ .

(٣٨٩) سيسر ، دائرة المعارف الاسلامية ، ط١ ، ج١٢ ، ص٤٧٥ .

(٣٩٠) نفسه

لەساڵی ( ۱۹۲۸ ) یشدا وتارێکی لە هەمان ئینسکلوپیدیا لەبارەی هەرێمی لوڕستان[۳۹۱] بڵاوکردەوەو دەڵێت کەوا: (( وڵاتی لوڕ ناوچەیەکە لە خوارووی ڕۆژئاوای ئێران، لە سەردەمی مەغۆلەکان بە لوڕی گەورە و لوڕی بچووك دەناسران ))[۳۹۲]. دوای شەنوکەوکردنی کتێبی وڵاتناسە موسڵمانەکان لەبارەی هەرێمەکە دەڵێت : (( زانیاری وڵاتناسەعەرەبەکان لەبارەی وڵاتی لوڕ یەکجار کورتە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش وەسفی ئەو ڕێگایانەی بەنێوان ئەهوازو فارسدا دەڕۆن زۆر روونن ))[۳۹۳] .

لەساڵی (۱۹۳۵)دا وتارێکی لەبارەی شاری نەهاوەند[۳۹٤] بڵاوکردەوە و مێژووی ئیسلامی ئەوشارە بەسەر دەکاتەوە و سەروسۆراخی لایەنی ئابووری شارەکە لەسەرچاوە ئیسلامییەکان رادەگوێزێت و دەڵێت : (( داری شەنگە بی بۆ داری قاشویانی بەکاردەهێنرا و .... بەداری زەرتکیش بەناوبانگە ، کە بۆدەرەوە دەناردران ))[۳۹٥] .

---

(۳۹۱) هەرێمی لوڕستان لە ناو سنووری هەرێمی خوزستان دابوو، بەڵام دواتر خرایە سەر هەرێمی چیا. بڕوانە: الأصطخری مسالك الممالك (لیدن : ۱۹۳۷) ، ص۱۹٤ ؛ ابن حوقل ، صورة الأرض، ص۲۳۲.

(392) Luristan،EI[1]، Vol.V ،p.50.

(393) Luristan، p.51.

(۳۹٤) نەهاوەند: شارێکی مەزنە لەلای قیبلەی هەمەدان سێ ڕۆژیان نێوانە . یاقوت ، معجم البلدان ؛ ج٥ ، ص ص۳۱۳ ــ ۳۱٤ ؛ کی لسترنج ، بلدان الخلافة الشرقیة، ترجمة: بشیر فرنسیس و کورکیس عواد ، (بغداد : ۱۹٥٤) ؛ ص۸۳ .

(395) Nihawand EI[1]، Vol.vi،pp.911-912.

### ج / هەرێمی جەزیرەی فوراتی[٣٩٦]

سەبارەت بەو هەرێمەش لە ساڵی ( ١٩٢٩ )، وتارێکی درێژی لەبارەی شاری میافارقینی (باکووری رۆژهەڵاتی دیاربکر ))[٣٩٧] بڵاوکردەوە ، تەوەرەکانی مێژووی شارەکەی بەقسەی وڵاتناسانی موسلمان لەباری کارگێڕی و بارودۆخی لەسەرەتای ئیسلامدا و باسی دەسەڵاتی حەمدانییەکانی[٣٩٨]. لەوێ کردووەو تەوەرێکیشی بۆ فەرمانڕەوای مەڕوانییەکان[٣٩٩] لەشارەکە تەرخان کردووە ، هەروەها ئاماژەی بە نیازو سەرنجی ئەیوبییەکانیش[٤٠٠] بۆ ئەو شارە کردووەو پەسنی خەڵکەکەی دەکات و لە بەگژداچوونەوەی مەغۆلەکان لەساڵی ( ٦٣٩ ك / ١٢٤١ ز )ە هەروەها باسی هێرشی تیموریشی رووەو شار لەنێوان ساڵانی ( ٧٧١ – ٨٠٧ ك / ١٣٦٩ – ١٤٠٥ ز )[٤٠١] دەکات .

---

(٣٩٦) هەرێمی جەزیرەی فورات: ناوچەی نێوان دیجلەو فوراتە ( سەرووی وڵاتی نێوان دووڕووباران) ، ناوی دیکەی وەك ئەقور و ئەبوریشی ، هەبوو ؛ کورد لەبەشی باکور و باکووری رۆژهەڵاتی نیشتەجێ بوون . بۆ زانیاری پتر بڕوانە : یاقوت : المصدر السابق، ج٢ ، ص ص١٣٤ – ١٣٦؛ Hudud, pp. 392 – 393 ، ؛ فائزة محمد عزت، الكرد في اقليم الجزيرة و شهرزور في صدر الأسلام ؛ ر. م. غ. الاداب ، ( جامعة صلاح الدين / اربيل : ١٩٩١ ) ص ص١٦ – ٥٠ .

(397) Maiyafraikin، EI[1];Vol. V.p.157.

(٣٩٨) حەمدانییەکان: بنەماڵەیەکی فەرمانڕەوا بوون لەنێوان ساڵانی ( ٣١٧ – ٣٩٤ ك / ٩٢٩ – ١٠٠٣ ز ) فەرمانڕەوای مووسڵ و حەلەبیان کردووە . بۆ درێژەی بڕوانە : فيصل السامر ؛ الدولة الحمدانية ، ( بغداد : ١٩٧٣ ) .

(٣٩٩) مەڕوانییەکان: بنەماڵەیەکی کوردن لە نێوان ساڵانی ( ٣٧٣ – ٤٨٩ ك / ٩٨٣ – ١٠٩٦ ز ) لە دیاربەکر و جەزیرەی فوراتی فەرمانڕەوایان کردووە . بۆ درێژەی بڕوانە : عبد الرقيب يوسف ؛ الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى ؛ ( بغداد ١٩٧٢ ) .

(٤٠٠) ئەیوبییەکان: بنەماڵەیەکی کوردن میرنشینێکیان لە میسرو وڵاتی شام و جەزیرەی فوراتی لە نێوان ساڵانی ( ٥٦٤ – ٦٤٨ ك / ١١٦٨ – ١٢٥٠ ز ) دامەزراند . بۆ درێژەی بڕوانە : ابن واصل، مفرج الكروب في اخبار بني أيوب، تحقيق جمال الديان شيال، ( القاهرة : ١٩٥٣ ) ؛ ج١، ص ص١٦٠ بەدواوە ؛ محمود ياسين التكريتي ، الأيوبيون في شمال الشام و الجزيرة، (بغداد:١٩٨١).

(401) Maiyafraikin ;Vol. V.p.159-161.

لەساڵی ( ١٩٣٠ ) وتارێکی لەبارەی شاری ماردینی کوردەواری باکووری هەرێمی جەزیرە(٤٠٢)، بڵاوکردەوە ، دوای گێڕانەوەی مێژووی شارەکە لەسەرەتای ئیسلامدا دەڵێت : ((وڵاتناسانی عەرەب زانیاری کەمیان لەبارەی ماردینەوە نووسیوە ، بەڵام جەخت لەسەر بایەخی دەکەنەوە))(٤٠٣) پاشان قسەی وڵاتناسان لەبارەی شارەکە بەسەردەکاتەوە و تیشك دەخاتە سەر مەروانییەکان و سەرنجی ئەیوبییەکان بۆ شارەکە(٤٠٤) ، تەوەرێکیشی بۆ مێژووی مەسیحیەت لەشارەکە تەرخان کردووە و دەڵێت : (( ناوچەی ماردین نەخشی لە بڵاوکردنەوەی مەسیحیەتی رۆژهەڵاتی هەبووە ))(٤٠٥). کە دێتە سەر باسی شوێنەوارەکانی شارەکە دەڵێت، هەموو شوێنەوارەکانی، مێژووی سەردەمی ئیسلامەتیین(٤٠٦) .

دوا وتاری بڵاوکراوەی مینۆرسکی سەبارەت شارەکانی کوردەواری لە ئینسکلوپیدیــای ئیسـلام لەبــارەی شــاری ئامێدییــەوەیە، لە سـاڵی(١٩٥٦)، سەبارەت بەو شارە دەڵێت ((شارێکە لە کوردستان سەد کیلومەتر لە باکووری مووسڵەوە دوورە))(٤٠٧). لەگەل بیروبۆچوونی ئیبن ئەثیرە(٤٠٨) (لە٦٣٠ ك/ ١٢٣١ز مردووە)، کەناوی شارەکە دەباتەوە سەر عیمادەدین زەنگی(٤٠٩) نۆژەنکەرەوەی

---

(٤٠٢) بڕوانە : یاقوت ، معجم البلدان ، ج٥ ، ص٣٩ .

(403) Mardin،EI[1]،Vol.V،p.274.
(404) Ibid، pp.274-275.
(405) Ibid،p.276.
(406) Ibid.
(407) Amadiya، EI[2]; Vol.1،p.426.

(٤٠٨) الكامل في التأريخ ، ( بيروت : ١٩٧٨ ) ؛ ج٩ ، ص٦ .

(٤٠٩) عیمادەدین زەنگی: کوڕی ئاق سەنقەری کوڕی عەبدوڵڵایە ، ئەتابکییەی مووسڵی لەساڵی (٥٢١ ك / ١١٢٧ ز) ، دامەزراند و لەساڵی ( ٥٣٧ ك / ١١٤٢ ز ) ئەو شارەی دروست کردووەو لە ساڵی ( ٥٤١ ك / ١١٤٦ ز ) شەهید بووە . بۆ درێژەی بڕوانە : ابن الاثير ، التأريخ الباهر في الدولة الاتابكية بالموصل ؛ تحقيق عبد القادر طليمات ، ( القاهره : ١٩٦٣ ) ص ص١٥ – ٨٤؛ عماد الدين خليل ، عماد الدين زنكي ، ( الموصل : ١٩٨٥ ) .

شارەکە، لەبارەی مێژووی شارەکەش دەڵێت: ((میرە کوردەکانی بنەماڵەی بادینان فەرمانڕەوای ئامێدی بوونە))[410].

### د / هەرێمی ئازەربایجان[411]

مینۆرسکی باسی ئەو هەرێمە و هەندێ لەشارەکانی کردووە ، بەپێی مێژووی زنجیرەی نووسینەکانی، لەساڵی ( ١٩٢٥ ) وتارێکی لەبارەی شاری کوردەواری سەلماس[412]. بڵاوکردەوەو قسەی مەقدەسی سەبارەت بەو شارە دەنووسێ (( شارێکی جوانە و بازێرەکانی ئاوەدانن و مزگەوتێکی لێیە لە بەرد درووست کراوە ، دانیشتوانەکەی لەسەدەی چوارەمی کۆچی / دەیەمی زایینی بەرەچەڵەك کوردن[413] ))[414] .

وتارێکی دیکەشی لەهەمان ساڵ بۆ ئینسکلوپێدیا لەبارەی شاری ساوج بولاق بووە و لەبارەی مێژووی شارەکە دەڵێت : (( لە مێژووی ماربیلای پەتریاکی نەستوورییەکان ( ١٢٨١ – ١٣١٧ ز ) ەوە بۆمان دەردەکەوێ لە سەردەمی مەغۆلەکان بازرگانییەکی وا بە هەرێمی ساوج بولاق تێناپەڕێت))[415] لە ئەنجامی شارەزایی زۆری زمانەوانی رایەگەیاند کەوا زۆربەی ناوی شوێنەکانی

---

(410) Amadiya p.427.

(٤١١) هەرێمی ئازەربایجان: هەرێمێکی فراوانە و رووباری ئاراس لە باکوورەوە و وڵاتی دەیلەم لە رۆژهەڵاتەوە و وڵاتی چیا لەباشوورەوە ؛ لە خۆرئاواوە هەندێ لە هەرێمی جەزیرەی فوراتی دەوریان داوە ، ئازەربایجان دارشتەی عەرەبی زاراوەی ئەتروپاتکانە کە لەلایەن مێژوونووسە ئەرمەنەکان بەکاردەهێنرا . بۆ زانیاری پتر بڕوانە: یاقوت ، معجم البلدان ، ج١ ، ص ص١٢٨– ١٢٩؛ حسام الدین علی غالب النقشبندی ، آذربیجان دراسة سیاسیة حضریة، ر. د. غ. ( جامعة بغداد : ١٩٨٤ ) ص ص٢٤ – ٣٧ ؛ Hudud . pp. 396 – 395

(٤١٢) سەلماس : شارێکی بەناوبانگی ئازربایجانە، نێوانی لەگەڵ ورمێ دوو رۆژە. یاقوت ؛ المصدر السابق ، ج٣ ؛ ص ص٢٣٨ – ٢٣٩ .

(٤١٣) مەقدەسی دەقەکەی بەودەستەواژەیە نەنووسیوە . بڕوانە : أحسن التقاسیم في معرفة الأقالیم؛ ( لیدن : ١٩٠٩ ) ، ص٣٧٧ .

(٤١٤) دائرة المعارف الاسلامیة، ط١ ، ج١٢ ، ص١٠٣ .

(٤١٥) نفسه. ج١١ ، ص١٥٧ .

ناوچەکە ناوی تورکی و مەغۆلین و هەندێ نموونە بۆ سەلماندنی رایەکەی خستۆتە روو[٤١٦].

لەساڵی ( ١٩٢٩ ) وتارێکی لەسەر شاری ماکۆ نووسی و لەبارەیەوە دەڵێت: (( خانێکە لە هەرێمی ئازەربایجانی فارسی ))[٤١٧] ، کە دێتە سەر باسی دانیشتووانی شار دەڵێت، دوو رەگەزی سەرەکی لێنە ، تورك ئەوانەی کە بنەماڵە فەرمانڕەوای وەك قەرە قۆینلو ( ٧٨١ – ٨٧٣ ك / ١٣٧٩ – ١٤٦٨ ز ) و ئاق قۆینلو ( ٨٠٦ – ٩٠٨ ك / ١٤٠٣ – ١٥٠٢ ز ) یان دامەزراند ، کوردیش رەگەزی دووەمن لە ناوچەکە[٤١٨] . کەباسی مێژووی شارەکەش دەکات دەڵێت : (( حەمەدوڵڵای ئیبن مستەوفی ... یەکەمین کەسە ناوی ماکۆی لە نێو شارەکانی نەخچەوان هێناوە[٤١٩] ))[٤٢٠] .

بەهۆی ئاگاداری و شارەزایی لە مێژووی شارەکە،قسەی گەڕیدەی ئەسپانی کلافیجو دەنووسێت ، کە لە حوزەیرانی ساڵی ( ١٤٠٤ ) سەردانی ماکۆی کردووە، ئەوەی لە بارودۆخی شارەکەی بینیوە ، هەروەها قسەی بەدلیسی خاوەنی ( شەرەفنامە ) شی کردۆتە بەڵگە کە بەشێك بووە لەو رووداوانەی ئەو کاتە لەشارەکە روویانداوە[٤٢١]. .

لەساڵی ( ١٩٣٠ ) یش وتارێکی درێژی لەبارەی شاری ورمێ نووسیوە و ئاوا پێناسەی دەکات (( مەڵبەندو شارێکە لە ولایەتی ئازەربایجان ))[٤٢٢]، بۆ مێژووی شارەکەش لەسەردەمی ئیسلامەتی سەیری کتێبی ولاتناسە موسڵمانەکانی کردووە و دەڵێت : (( جوگرافیاناسانی سەدەی نۆیەمی (زایینی) ... شاری ورمێ لەدوای ئەردەبیل و مەراغە لە نێوان شارەکانی ئازەربایجان بە پلەی

---

(٤١٦) نفسه.

(417) Maku، EI[1]، VolV،p.180.

(418) Ibid.

(٤١٩) نزهة القلوب ، ص١٠٢ .

(420) Ibid، p.181.

(421) Ibid.

(٤٢٢) دائرة المعارف الاسلامية ، ط١ ، ج١ ، ص٦٧١ .

سێیەم دادەنێن ... ))[٤٢٣] ، پاشان دەڵێت : (( هەرێمی ورمێ کوردو عیسایی تێدا نیشتەجێ بوون، بەڵام لە مێژووی ئیسلامەتی پایەکی وا گەورەی نەبووە بەو حالەیەوە شوێنێکی چەپەکە بۆ خۆ پەنادانی ئەوانەی کەلە بنەماڵە فەرمانڕەواکانی ئازەربایجان هەڵدێن[٤٢٤]. هەروەها ئاماژە بە کوردە هەزەبانییەکانیش دەکات[٤٢٥] لەوێ لە سەدەی چوارەم و پێنجەمی کۆچی ، دەیەم و یازدەیەمی زایینی[٤٢٦] .

لەساڵی (١٩٥٦)یش باسێکی لەبارەی هەرێمی ئازەربایجان خۆی نووسی، لەگەل ئەوەی کە وتاری ئازەربایجان لەچاپی یەکەمدا لەلایەن سترکی[٤٢٧] رۆژهەلاتناس نووسرابوو و بلاوکرابۆوە، بەڵام دەستەی نووسەرانی ئینسکلوپیدیا نووسینەکەی مینۆرسکیان فەرامۆش نەکرد، چونکە نووسەری وتارەکە بە وردی لەسەرچاوە جۆراوجۆرەکان گەڕابوو و زانیاری تایبەتی خۆشی لەبابەت هەرێمەکەوە هەبوو .

کە باسی مێژووی هەرێمەکە لەسەردەمی ئیسلامەتی دەکات ، دەقێك تۆماردەکات بێ ئەوەی ئاماژە بەو سەرچاوەیە[٤٢٨] بکات کە لێی وەرگرتووە، ئەوەش بەڵگەی روونە کەکورد لە رۆژگاری فەتحی ئیسلامی لە هەرێمەکەدا هەبوونە ، دەقەکەش پەیماننامەیەکە لە نێوان فەتحکاران و خەڵکی هەرێمەکە

---

(٤٢٣) نفسه ، ص٦٧٤ .

(٤٢٤) أرمية ، ص٦٧٤ .

(٤٢٥) هەزەبانیەکان: هۆزێکی کوردن لە نێوان ساڵانی ( ٤٣٧ — ٥٣٤ ك / ١٠٤٦ — ١١٣٩ ز ) فەرمانڕەوای هەولێریان کردووە ، هەندێکیان بۆ ئازەربایجان کۆچیان کرد . بۆ زانیاری پتر بڕوانە: احمد عبد العزيز محمد ، الهذبانيون في أذربايجان و أربيل و الجزيرة الفراتية ، ر. م. غ. الآداب : (جامعة صلاح الدين/أربيل : ١٩٩٠ ) ؛ ص٤٤ ؛ توفيق ، الكرد في العصر العباسي، ص١٤٢ .

(٤٢٦) المرجع السابق ، ص ص٦٧٤ — ٦٧٥ .

(٤٢٧) بڕوانە : ج١ ، ص ص٥٦٢ — ٥٦٣ .

(٤٢٨) بۆ ئاگاداربوون لە دەقەکە بڕوانە : البلاذري ، فتوح البلدان ؛ سەلاحەدین المنجد پاشکۆ و پێرستی بۆ کردووەو بلاوی کردۆتەوە ، ( القاهرة : د.ت ) مج١ ؛ ق٢ ، ص٤٠٠ ؛ ياقوت ، معجم البلدان ، ج١ ، ص١٢٩ .

بەستراوە (( ............ دانیشتوانە کوردەکانی وڵاتی بلاشکان ( بلاشجان ) و سبلان و شاتروزان ( ئاوی روذان ) بپارێزن ))[٤٢٩] .

پاشان باسی هاتنی هۆزگەلی عەرەب بۆ هەرێمەکە دەکات، کەلەم لاو لەولای نیشتەجێ بوونە، لەوانە (( روادئەزدی کەلە تەورێز نیشتەجێ بوون ، دوایێ هێدی هێدی لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە تێکەڵ بوونە ، تەنانەت لە دەوروبەری نێوەڕاستی سەدەی چوارەمی کۆچی ( دەیەمی زایینی ) رۆڵەکانی رواد بوونەتە کورد))[٤٣٠]. ئاوایی کۆتایی بە وتارەکەی دەهێنێت و دەڵێت : (( بەدرێژایی سنووری رۆژئاوا و لەناوچەکانی خواروو بەرەو رۆژئاوای رووباری تەتاو بە زاری کوردی دەدوێن))[٤٣١].

## هـ / هەرێمی ئەرمینیا [٤٣٢]

لەشارەکانی ئەو هەرێمەدا، مینۆرسکی باسێکی سەربەخۆی لەبارەی شاری دوین نووسیوە ، لەساڵی ( ١٩٣٠ )دا باسێکی لە گۆڤارێکی فەرەنسی بەناوی (ناوی دوین لە ئەرمینیا) بڵاوکردەوە ،جێی سەرنجە ئەو باسەی ئەوەندە پێ گرنگ بووە ، بۆیە جارێکی دیکەش لە کتێبی ئێرانییەکاندا بڵاوی کردۆتەوە[٤٣٣] .

باسەکە هەشت تەوەرە ، حەوتەمی لەبارەی دوینی کوردستانە ، ئەوەی لەقسەکانی جێی ئاماژە پێکردنە (( شوێنی دوین لەدوو ناوچە لە کوردستاندا هەیە، بەپێی نەخشە ئینگلیزییەکان دوین قەڵایەکە لە دووری چل کیلومەتر لە

---

(٤٢٩) بروانە : مینورسکی ، اذربیجان ، ج١ ، ص٢٩ .

(٤٣٠) نفسه.

(٤٣١) نفسه.

(٤٣٢) هەرێمی ئەرمینیا: دەکەوێتە باشووری چیای قەفقاس ، لەباکووری رۆژهەڵاتی بانی ئەنادۆل ، مێژووی کورد لەناوچەکانی باشووری خۆرئاوای هەرێمەکە یەکجار کۆنە. بۆ زانیاری پتر بروانە: المقدسي ، احسن التقاسيم ، لا ٣٧٤ – ٣٧٨ ؛ صلاح الدين أمين طه ، الحياة العامة في ارمينية، ر. م. غ. ، الآداب ، ( جامعة بغداد : ١٩٧٩ ) ، ص ص٢١ – ٣٧ ؛ توفيق ، الكورد في العصر العباسي ، ص ص٢٧ – ٤٠ ؛ Hudu, pp. 359-397.

(433) Iranica،pp.I-II.

باكووری هەولێر، رووبارێکی بچووکیش بەناوی دەرە دوین لەلای راستی رووباری دیالە(سیروان ) لەو ناوچەیەی کە لکی دیجلە بەرەو باشوور پێچ دەکاتەوە))[٤٣٤]

ئەوەش بە قسەی رۆژهەڵاتناسی بەریتانی س. ج. ئەدموندز پشت ئەستوور دەکات کە لە رۆژنامەی (رێبوار– المسافر – Voyage) ساڵی (١٩٢٦ ) بڵاوبۆتەوە : قەلای دوین هێمایەکی دیاری محەمەد پاشای رواندزییە، کورد دەڵێن دوین شاری بەشکۆو زێدی رەسەنی بنەماڵەی سەلاحەددینە ، تا هەنووکە شوێنەواری ساختمانەکان لەو ناوچەیەدا هەرماوە))[٤٣٥] .

لەساڵی (١٩٥٣)، کە باسەکەی لەمەڕ قەفقاسەکان بڵاوکردەوە بەچەندین بەڵگەوە سەلماندی کە دوین دەکەوێتە ئەرمینیا و گوتی: ((دوین یەکێ لە پایتەختەکانی ئەرمینیایە ... لە زووەوە کورد لە دەوروبەری دوین دەژین ... ئەو هۆزەی باوباپیرانی سەلاحەددینی لێ کەوتوونەتەوە هاتوونەتە دوین ... بارتولدی رۆژهەڵاتناسیش دەڵێت، باوکی سەڵاحەددین خەڵکی دوین بووە))[٤٣٦].

دوای ئەوە شوێنی شارەکە بەوردی دیار دەکات و دەڵێت: ((دەبێ لەکەناری رۆژئاوای رووباری جارنی (ئەزتی کۆن) کە دەرژێتە رووباری رەس (ئاراس) بۆ رۆژهەڵات ... لە رووباری زنجا (هەرزدان) کە شاری یەریڤانی دەکەوێتە سەر، لە شوێنی شاری دوین بگەڕێین))[٤٣٧]وا دەردەکەوێت کە ئەدمۆندزی رۆژهەڵاتناس لە لێکۆلینەوەکانی دواتریدا لە رای خۆی پاشگەز بوویێتەوە، بەبەڵگەی ئەوەی ئاماژە بە رای مینۆرسکی دەکات لەبارەی دیاریکردنی شوێنی شارەکە[٤٣٨]، جێی وەبیر هێنانەوەیە سەرچاوە مێژووییەکان لە بارەی ئەو شارەوە، پاڵپشتی رای مینۆرسکی دەکەن[٤٣٩].

---

(434) Studies، p.116.
(435) Ibid.
(436) Ibid، p.8.
(437) Ibid.

(٤٣٨) بڕوانە : کرد و ترك و عرب ، ص١٢ ، پەراوێزی ژمارە ( ١٠ ) .

(٤٣٩) البلاذري ، فتوح ، مج١ ، ق١ ، ص٢٣٧ ؛ ابن خرداذبة ، المسالك و الممالك ( بريل : ١٨٨٩ )، ص ص١٢٢ – ١٢٣ ؛ المقدسي ، احسن التقاسيم ، ص ص٣٧٤ – ٣٧٧ .

لەساڵی (١٩٥٦) و لەچاپی دووەمی ئینسکلوپیدیای ئیسلامدا، وتارێکی لەبارەی شاری ئەخلات بڵاوکردەوە، کە لێرەدا جێی سترکی ڕۆژهەڵاتناس دەگرێتەوە، کە لە چاپی یەکەمدا لەسەر ئەو شارەی نووسیوە[٤٤٠]، بەڵام ئەوەی مینۆرسکی نووسیوویەتی زۆر فراوانترو ڕوونترە و پشتی بە زۆر سەرچاوەی ئیسلامی جۆراوجۆر و سەرچاوەی ڕۆژهەڵاتناسی بەستووە ، کەچی لە وتارەکەی سترکدا هیچ ئاماژەیەك بۆ سەرچاوەی ئیسلامی نابینیین .

شوێنی شارەکە دیاردەکات و دەڵێت : (( شارو قەڵایەکە لە گۆشەی باکووری خۆرئاوای گۆمی وان ))[٤٤١]، بەکورتی مێژووی شارەکە دەخاتە ڕوو هەر لە ڕۆژگاری فەتح کردنی لەسەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب ( ١٣ – ٢٣ ك / ٦٣٤ – ٦٤٣ ز ) تا کۆتایی سەردەمی عەباسییەکان ( ٦٥٦ ك / ١٢٥٨ز) ، تێیدا ئاماژە بە هەردوو بنەماڵەی کوردی مەڕوانی و ئەیوبی و چالاکییەکانیان لە شارەکەدا دەکات[٤٤٢] .

### و / هەردوو هەرێمی فارس[٤٤٣] و خوزستان[٤٤٤]

سەبارەت بە هەرێمی فارس لەساڵی ( ١٩٢٧ ) وتارێکی لەبارەی شولستان نووسی کە ((ناوچەیەکە لە ولایەتی فارس ))[٤٤٥] ، ئینجا مێژووی ناوچەکە

---

(٤٤٠) بڕوانە : ج١ ، ص ص٥٢٠ – ٥٢١ .

(٤٤١) بڕوانە : ج١ ، ص٤٣٣ .

(٤٤٢) نفسە ، ص ص٤٣٣ – ٤٣٤ .

(٤٤٣) هەرێمی فارس: هەرێمێکە لە ڕۆژهەڵاتەوە هەرێمی کرمان و لە ڕۆژئاواوە هەرێمی ئەهوازو لە باکوورەوە هەرێمی ئەسفەهان و لە باشووریشەوە کەنداو دەوریان داوە ، شارە گرنگەکانیشی ، شیرازو ئەردەشێرو ئەستەخرو هی دیکەن . بڕوانە : ابن حوقل ، صورة الأرض ، ص٢٣٤ ؛ المقدس ، احسن التقاسيم ، ص٤٢٠ .

(٤٤٤) فارسەکان پێی دەڵێن خوزستان ، هەرێمێکی بچوکە لە ڕۆژهەڵاتەوە هەرێمی فارس و ئەسفەهان و لە ڕۆژئاواشەوە کورەی واسیتی سەربە هەرێمی عێراق و لە باکووریشەوە ناوچەکانی سەر بە هەرێمی چیاو لە باشووریشەوە کەنداو دەوریان داوە ، شارە گرنگەکانیشی ئەهوازو جندبسابور و پیروزو رامهرمزن . بڕوانە: ابن حوقل ، نفسە ، ص٢٢٥ ؛ القزويني ، اثار البلاد واخبار العباد ، ( بيروت : د. ت ) ، ص١٢٥ .

(٤٤٥) دائرة المعارف الاسلامية ، ط١ ، ج١٣ ، ص٤٤٣ .

هەڵدەداتەوە و دەڵێت : (( پێویستە جیاوازی لە نێوان سێ سەردەم بکەین لە مێژووی ئەو ناوچەیەدا : سەردەمی پێش هاتنی شول[٤٤٦]، سەردەمی فەرمانڕەوایەتیان ( لە سەدەی حەوتەمەوە سەدەی سێزدەیەمی زایینی ) ، سەردەمی داگیرکردنی لوڕی مامەسانی، نزیکەی لەسەرەتای سەدەی دوازدەیەمەوە تاکو سەدەی هەژدەیەم))[٤٤٧] . لە بەسەرکردنەوەی مێژووەکەشیدا هەر لە فەتح کردنییەوە لە ساڵی ( ٢٣ ك / ٦٤٣ ز ) باسی سەردەمە لاواز و گەشەکانی خەڵکی ناوچەکە دەکات ، کاتێ کە لەسەردەمی بویهییەکان لە گەشەسەندندا بوونەو شێخی شۆل ناوی سیفەدین ماکان رۆژبەیانی بووە ، مینۆرسکی دەڵێت : رۆژبەیانییەکان لە هۆزەکانی لوڕ بوونە))[٤٤٨] ، ئینجا باسی سەردەمی سێیەمی مێژووی شولستان دەکات، ئەویش داگیرکردنی لەلایەن لوڕی مامەسانییەوە[٤٤٩] .

سەبارەت بە هەرێمی خوزستانیش لەساڵی (١٩٣٦) وتارێکی لەسەر رامهرمز[٤٥٠] بڵاوکردەوە، بەڵام بەتەنیا بایەخی ئابووری شارەکەی لە سەردەمە جیاجیاکاندا بەسەرکردبۆوە و ئاماژەی بە سەرچاوە ئیسلامییەکان کردووە[٤٥١] .

دوا لێکۆڵینەوەی مینۆرسکی لەبارەی جوگرافیای کوردستانەوە لەساڵی (١٩٥٧) بەناوی (ناوە مەغۆلییەکانی هەندێ شوێن لە کوردستانی موکریان)[٤٥٢]، کە بەدرێژەی ئەو باسەی دادەنرێت لەسەر شاری ساوج بولاق نووسیوە ، بۆیە

---

(٤٤٦) شول: هۆزێکە لە ئوستانی فارس .

(٤٤٧) نفسه.

(٤٤٨) شولستان ؛ ص٤٤٤ .

(٤٤٩) نفسه ؛ ص٤٤٦ .

(٤٥٠) بڕوانە: نەخشە لە پاشکۆ .

(٤٥١) رامهرمز ، دائرة المعارف الأسلامية ، ط١ ؛ ج٩ ، ص ص٤٧٧ ؛ ٤٧٨ .

(٤٥٢) کوردستانی موکریان: مەبەست ئەو ناوچە کوردەوارییانەن کە کەوتوونەتە باشووری باشووری خۆرهەڵاتی گۆمی ورمێ ؛ لەشارە دیارەکانی ساوج بولاق – مهابادی ئێستایە . بۆ زانیاری پتر بڕوانە: حوسێن حوزنی موکریانی؛ کوردستانی موکریان؛ ( رواندز : ١٩٣٨ ) ، ص ص١ – ٥٠.

تەوەرێکی بۆ جوگرافیای کوردستانی موکریان[٤٥٣] تەرخان کردووە . لە تەوەرێکی دیکەشدا باسی مێژووی ناوچەکەی بەکورتی لە هەموو سەردەمەکاندا کردووەو دەڵێت : (( لەژێر سایەی ئەو بارودۆخەدا کورد چۆن توانیان پارێزگاری ناوچە تایبەتییەکەی خۆیان بکەن ))[٤٥٤] .

پاشان تەوەرێك بۆ وەسفی وڵاتی مەغۆل[٤٥٥] تەرخان دەکات ، بە مەبەستی بەراوردکرنی لەگەڵ ناوی هەندێ شوێنی کوردستانی موکریان، کەچۆن کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ناوی مەغۆلی ، ئەو راستییەش بە نموونەو بەڵگەی زۆرەوە دەسەلمێنێ ، دوو پاشکۆشی سازداوە و تێیدا ناوی ئەو شوێنانە و بەراورد کردنیان لەگەڵ ناوە رەسەنە مەغۆلییەکانی خستۆتە روو[٤٥٦] .

**دووەم : تایفەی ( ئەهلی هەق )، (کاکەیی)**

بایەخدانی مینۆرسکی بە ژیانی ئایینی لای کوردان و بایەخی پتریش بە (ئەهلی هەق) بۆ گەشتی یەکەمی ئەو بۆ ئێران دەگەڕێتەوە لە ساڵی ( ١٩٠٢ ) . رەنگە رەگی ئەو بایەخدانەی لە هاندانی مامۆستاکانی ئامۆژگای لازاریف سەرچاوەی گرتبێت ، سەرباری کەمی لێکۆڵینەوە لەبارەی ئەو تایفە ، بەڵام ئەو بەختی یار بووە زانیاری باش و دەستنووسی دەگمەنی بکەوێتە دەست — لەئاکامی پێوەندی و ناسینی سەرۆکەکانی ئەو تایفە لە تاران — لەبارەی ئەدەبی ئەو تایفەیە و بەناوبانگترین دەستنووس کە ( سەرئەنجام ) بوو ، بکەوێتە دەستی[٤٥٧] .

لەگەڵ مانەوەی لە ئێران هەر لە ساڵی( ١٩٠٤ ) و سەردانە یەك لەدوا یەکەکانی بۆ ئەو ناوچانەی کە ئەو تایفەی تێدا نیشتەجێن سەرچاوەی پتری وەگیر کەوتن و توانای ئەوەی لەخۆی دیت کە یەکەم لێکۆڵینەوەی

---

(453) Mongol place-name،pp.59-62.
(454) Ibid. p. 64.
(455) Idid. P. 65-75
(456) Ibid، pp. 76-81.

(٤٥٧) بڕوانە : بەشی یەکەم .

دەربارەیانەوە لە ( ١٩١١ ) بنووسێت . ئەوەبوو دەسنووسی سەرئەنجامی وەرگێڕاو پێشەکییەکیشی لەبارەی ئەو تایفەیەوە نووسی و بڵاوی کردەوە .

ئەوەی جێی ئاماژە پێکردنە مینۆرسکی بەکەڵك وەرگرتن لە پلەو پایە دبلۆماسییەکەی و پێوەندی پتەوی لەگەڵ زۆر خەڵکی دیار درێخی لە بەدەست خستن و پەیداکردنی زانیاری و سەرچاوەی دیکە لەبارەی ئەو ئایینزایە نەکرد. لەساڵی ( ١٩١٤ ) و لەسەروبەندی راکێشانی هێڵی سنووری ئێران و عوسمانی بە ناوجەرگەی کوردستاندا گەڕاو و توانی بگاتە شوێنە پیرۆزەکانیان — هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێ کرد — دوای گەشتەکەی دەنووسێ و دەڵێت: ((گەشتەکەم زۆر خۆش بوو، سەرنج و تێبینی خۆشی لەدەروونم چاندووە ، تابمێنم لەبیری ناکەم))[٤٥٨].

سەبارەت بەناوی تایفەکەش مینۆرسکی ناوی ( عەلی ئیلاهی ) لە ( ئەهلی حەق ) پێ باشتر بوو . لەساڵی ( ١٩١٥ ) دەڵێت : (( عەلی ئیلاهی ئایینێکی کوردییە وەك پێویستە لێی نەکۆڵراوەتەوە ))[٤٥٩] قسەی لەقسەی ئەوانەدا گێرنابێت کە ئەو تایفەیە بە یەکێ لەو کۆمەڵانەبن کە خەلیفەی راشدی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ( لە ٤٠ ك / ٦٥٠ ز کۆچی دوایی کردووە ) بەخوا دەزانن، پاشان کورتەیەك لەمەڕ رواڵەتی ئەو ئایینزایە و داب و نەریتی خەڵکەکەی و دابەشبوونی جوگرافیان بە پاڵپشتی تێبینییە تایبەتییەکانی خۆی و سەرچاوە رۆژهەڵاتناسییە رووسییە دیاریکراوەکان، دەنووسێت[٤٦٠] .

بەداخەوە نە ئەو لێکۆڵینەوەیەو نە ئەو کتێبەی ساڵی ( ١٩١١ ) بڵاوی کردۆتەوە لەدەرەوەی رووسیا بایەخێکی وای پێ نەدرا ، چونکە هەردووکیان بەزمانی رووسی نووسرابوون ، بە پێچەوانەی ئەو لێکۆڵینەوەی لەمەڕ ئەو تایفەیەی کە لە ساڵی ( ١٩٢٠ ) بە زمانی فەرەنسی بەناوی ( تێبینی لەبارەی

---

(٤٥٨) بروانە : الأكراد ؛ ص ٥٩ .

(٤٥٩) نفسه ، ص ٥٦ .

(٤٦٠) نفسه ؛ ص ص٥٧ — ٥٩ .

تایفەی ئەهلی هەقە )[٤٦١] بڵاوی کردۆتەوە ، زنجیرەیەك پێداچوونەوەی[٤٦٢] لەبارەیەوە نووسرا ، بۆ مینۆرسکی دەروازەیەك بوو لێیەوە چووە ناو دنیای رۆژهەڵاتناسیی رۆژئاوا .

لەو لێکۆڵینەوەیدا پوختەیەکی ئەوەی لە رووسیا لە ساڵانی ( ١٩١١ و ١٩١٥ ) بڵاوی کردبۆوەو سەرنجەکانی خۆی تێدا تۆمارکردبوو کە لەو سەرچاوە نوێیانەی دوای ساڵی (١٩١٥) بەدەستی کەوتبوون، کە دیارترینییان دەستنووسی ( فرقان الاخبار )[٤٦٣] بوو، لەگەڵ ئەو زانیارییە وردانەی کەلە سەعیدخانی کوردستانی هاورێی وەرگرتبوو — هەر وەك پێشتر ئاماژەی بۆ کراوە .

باسەکەی بەفەرەنسی[٤٦٤] دابەش کردبووە سەر پێش بارێك کە تێیدا باس لە جیاوازی ناوە جۆراوجۆرەکانی ئەو تایفەیە وەك ( عەلی ئیلاهی ، ئەهلی هەق، نەسیریە ، ئەهلی سلسلە ... ) دەکات، ئەو ئەهلی هەقی بۆ هەڵبژاردوون و لە لێکۆلینەوەکانی داهاتووشیدا هەر لەسەر ئەو ناوە رۆیشتووە . لەگەڵ ئاماژەکردن بۆ ئەو نووسینانەی لەبارەیانەو نووسراون ئەوەی کەڵکی لێ وەرگرتووە ئاماژەیە بە قەرزارباری خۆی، بە تایبەتیش بۆ ئەو رۆژهەڵاتناسانە راولنسون و دی کوبینوو جولکوفسکی، نیشان دەدات .

---

(٤٦١) توژەر کۆششی کرد ئەو لێکۆڵینەوەیە پەیدابکات ؛ برادەرێکم لە پاریس بەناوی بەرێز نەجات عەبدوڵلا — خوێندکاری دوکتۆرایە — بەدڵ کۆششی کردوە بۆ پەیداکردنی، بەڵام دەستی نەکەوتووە . لەو دوو نامەیەی کە لە ١٠ ی تەمووزو ٧ ی ئەیلوولی ٢٠٠٠ بۆی نووسیووم . ئەوەندەی باش بوو توژەر توانی پێداچوونەوەی ئەو رۆژهەڵاتناسانەی لە بارەیانەوە نووسیووە دەست بخات . دوای ئەو لێکۆڵینەوەش ؛ چەند جاری دیکە مینۆرسکی بەبابەتەکەدا چۆتەوە.

(462) F. Cumont، Review of minorskys Notes sur la secte،Syria،1922، Vol.III ،p.262.

(٤٦٣) فرقان الاخبار: حاجی نیعمەتوڵلا (١٨٧١ — ١٩٢٠) دایناوە . کتێبەکە چوار بەشە، بۆزانیاری پتر بڕوانە: مینۆرسکی، أهل الحق، دائرة المعارف الاسلامیة، ط١، ج٣، ص ص٩٩ —١٠١.

(٤٦٤) بەپشت بەستن بەو پێداچوونەوەی زویمر بە لێکۆڵینەوەکە .

لەبەشی یەکەمدا لە مێژووی ئەهلی هەق و ئاینزا نامۆکەیەوە دەدوێت، کە لەسەر حەوت خواوەندی بەرجەستە دامەزراوە و قسەکانی بەو دەقانەی کە لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەوانی وەرگرتوون، پشت ئەستوور دەکات و پاشان باسی بەشەکانی ئاینزاکە دەکات و لایەنگرانی لە دیاربەکر و تەوریز و تاران و تورکستان و وڵاتی ئەودیو رووبار، دابەش دەکات لەگەڵ، نەخشەیەك لە مەڵبەندە سەرەکییەکانی چالاکییەکانیان لە ئێران دەردەخات . هەرچی بەشی دووەمە مێژوویی و رەخنەییە و تێیدا لە دروشمەکانی ئەهلی هەق و قوربانییەکانیان و رێورەسمە جۆراوجۆرە و داب و نەریت و ئاکاریان دەدوێت . لەپاشکۆشدا باسێکی یەکێ لە ئەندامانی تایفەکەی بڵاوکردۆتەوە و هێرش دەباتە سەر ئاینزای بەهایی ، لەکۆتاییشدا وێنەی مەزاری پێشەواکانی ئەو تایفەیە بڵاو دەکاتەوە(٤٦٥) .

لە وەرگێڕانی وتارێکی زانای ئەرمەن بەناوی ئەجاریان بۆ فەرەنسی و لەساڵی (١٩٢٦) بەناوی ئاینی نوێ (Une religion nouvelle les Thoumaris) تێیدا باسی کۆمەڵێك لە کۆمەڵەکانی تایفەی ئەهلی هەق دەکات کە ( تۆمار )ە، جا مینۆرسکی بە ئەرکی خۆی زانی کە سۆراخی ئەوکارە بکات، بۆیە لێکۆلینەوەیەکی بەناوی ( تۆژینەوەیەك لەبارەی ئەهلی هەق )ەوەی نووسی و ساڵی ( ١٩٢٨ ) بە فەرەنسی بڵاوکرایەوە ، تێیدا پتر بەناخی بابەتەکە دا دەچێت ، دوای خستنەرووی خشتەکانی ئەجاریانی زانای ئەرمەنی، دێتە سەر تەوەرەی بیروباوەڕی ئەهلی هەق ، پاشان هەرچوار هەوارە مێژووییەکانی لای تایفەی ئەهلی هەق خاوەندکار ، عەلی ، بابەخۆشین ، سوڵتان ئیسحاق(٤٦٦) .

لە لێکۆلینەوەکەدا رەخنە لەو قسەیەی ئەجاریانی زانای ئەرمەنی دەگرێت، سەبارەت بە ریۆڕەچەڵەك و سەروکاری کۆمەڵەی تومار بەو شوێنانەی کە تێیدا

---

(465) Zwemer، Review of Minorskys Notes sur la Secte. MW, 1921،Vol. XVI ،p.104.

(466) Etudes Sur Les.pp.93-99.

ژیاون[٤٦٧] . دوایی لێکۆڵینەوەکەی بە پێوەندی ئەو مەزهەبە بە مەزهەبەکانی دیکەوە دەهێنێت[٤٦٨] .

ئەوەی دەبێ ئاماژەی پێ بکرێت ئەوەیە کە تا ئەو مێژووە خوێنەری ئینگلیز ئاگایان لە نووسینەکانی مینۆرسکی نەبوو ، تا نووسینی وتاری سوڵتان ئیسحاق[٤٦٩] بۆ ئینسکلوپیدیای ئیسلام دامەزرێنەری تایفەکە – بەپێی بیروباوەڕی خەڵکەکەی . لەساڵی ( ١٩٢٨ )[٤٧٠] تێیدا دەڵێت سوڵتان ئیسحاق کەسایەتێکی مێژووییە لەسەدەی چواردەیەمی زایینی ژیاوە ، مەزارەکەی کەوتۆتە سەر کەناری راستی رووباری سیروان[٤٧١] لەناو مەزاری (بەردیوەر)[٤٧٢] و پوختەیەکیش لەبارەی ئەو تایفەیە دەنووسێ، بەڵام بەدرێژی لە وتارێکی سەربەخۆدا کە دواتر لەساڵی ( ١٩٣٤)[٤٧٣] لە پاشکۆی ئینسکلوپیدیای ئیسلام بڵاوی کردۆتەوە و بۆتە تۆژینەوەیەکی تێروتەسەڵ و باشتریش لەوەی کلیمان هواری رۆژهەڵاتناسی فەرەنسی لەساڵی ( ١٩١٣ )[٤٧٤] لەبارەی ئەو تایفەیەی بۆ ئەو ئینسکلوپیدیایە نووسیبوو .

تۆژینەوەکەی بە پێناسەکردنی ( ئەهلی هەق ) دەست پێ دەکات و دەڵێت: (( خاوەن بیروباوەرێکی پەنامەکین ( باطنیة ) بە تایبەتی لە رۆژئاوای فارسدا هەن ))[٤٧٥] . رای خۆی سەبارەت بە ناونانیان بە ( ئەهلی هەق ) دەسەلمێنێ . ئەگەرچی دڵیشی پێی ئاوی نەدەخواردەوە، چونکە پێی وابوو

---

(467) Ibid،p.101.
(468) Ibid،pp101-103.

(٤٦٩) سوڵتان ئیسحاق: دەنووسرێ یان پێی دەڵێن سولتان سەهاك ؛ کە لە ناوە رەسەنەکەوە داڕێژراوە .

(٤٧٠) بروانە : سلطان اسحاق ، دائرة المعارف الإسلامية ، ط١ ؛ ج١٢ ؛ ص ص٩١ – ٩٢ .

(٤٧١) بروانە : نەخشەکە لە پاشکۆ .

(٤٧٢) بروانە: وێنەی مەزارەکە لە پاشکۆ .

(٤٧٣) بروانە : اهل الحق ، ص ص٩٣ -- ١٠٥ .

(474) Ali- llahi، $EI^2$،Vol. I.،pp.292-293.

(٤٧٥) نفسه ، ص٩٣ .

ناوەکە کەم و کورتی هەیە ، چونکە لای هەندێ ڕێبازی سۆفیگەری بۆ واتایەکی دی بەکار دەهات[٤٧٦] .

هەروەها تەوەرێکی بۆ گرنگترین ئەو نووسراوانەی ڕۆژهەڵاتناسان لەبارەی ئەهلی هەقیان نووسیوە تەرخان کردووە ، پاشان چۆنیەتی گەیشتن بەو ڕاستییە دیاردەکات و دەڵێت : (( تاکە ڕێگا بۆ ئەوەی هەڵنەخلیسکێن لە چارەسەرکردنی ئەو تۆژینەوەیە، ئەوەیە (( ئەهلی هەق )) بەپاڵپشتی بەڵگەنامە ڕاست و دروستەکان وەسف بکەین . ئەوەی لە کتێبی گەڕیدان نووسراوە بۆ گەواهی دان نەبێت لە بەرچاوی نەگرین))[٤٧٧] .

تەوەرێکی تایبەتیشی بۆ باسی بیروباوەڕیان تەرخان کردووە، تێیدا دەڵێت: ((کۆمەڵەی ((ئەهلی هەق )) لەسەردەمی سولتان سەهاك کە ( ئەهلی هەق ) هەموویان بە دامەزرێنەری ئایینەکەیان دەزانی ، گەیشتە ئەوپەڕی))[٤٧٨] دوای دوان لە هەندێ بابەتی دیکە لەبارەی ئەو تایفەیەوە ، مێژووی ئایینیان دەخاتەڕوو و ئاماژە بەو هەرچوار هەوارەی کە پێشتر باسکران ، دەکات و دەڵێت بابەخوشین لە لوڕستان بووەو هاوچەرخی بابەتاهیری شاعیر بووە[٤٧٩]، سولتان ئیسحاق لە وڵاتی گۆرانی نزیك ڕووباری سیروان بووە ، پاشان جموجۆڵی ئەو تایفەیە دەپەڕێتەوە بۆ ئازەربایجان، بەتایبەتیش لەسەردەمانی دواییدا ، لەوەشەوە دەگەیتە ئەو دەرەنجامەی کە (( هەوارەکانی بڵاوبوونەوەی تایفەی ئەهلی هەق و گەشەکردنیان لە لوڕستان و — وڵاتی گۆران — و ئینجا ئازەربایجاندا بووە ))[٤٨٠]. لە لێکۆڵینەوەکەشیدا پشتی بە زانیاری تایبەتی خۆی و هەردوو کتێبی ( سەرئەنجام ) و ( فرقان الاخبار ) بەستووە .

---

(٤٧٦) نفسه.

(٤٧٧) نفسه ، ص ٩٤ .

(٤٧٨) نفسه ، ص ٩٥ .

(٤٧٩) بابە تاهیر: شاعیرو سۆفییەکی کوردە لەسەدەی پێنجەمی کۆچی / یازدەی زایینی ژیاوە بە بابەتاهیری هەمەدانی ناسراوە . بڕوانە : محمد علی سلطان ، قیام نهضت علویان زاکرس یا تاریخی تحلیلی اهل حق ( تهران : ١٣٧٦ هـ. ش ) ، ج١ ، ص ص٤٧ — ٥١ .

(٤٨٠) أهل الحق ، ص١٠٢ .

که دێته سەر دیاریکردنی مێژووی سەرۆکەکانی ئەو تایفەیە ، دەڵێت : ((ئەو خشتە سەرجەلە زانراوەی بەدەستەوەیە، بوار نادات سوڵتان سەهاك بخەینە پێش سەدەی پازدەیەم هەروەك س. ج. ئەدموندزیش پێی گوتم))[٤٨١] ، مێژووی ژیانی بابە خوشینیشی بەوردی دیارنەکردووە ، جگە لەو ئاماژەیەی کە دەڵێت لەسەدەی یازدەیەمی زاییندا بابە تاهیری شاعیری بینیوە و سەروساختیان بەیەکەوە هەبووە ، بەڵام رەخنەش لەو قسانەی لەوبارەوە کراون، دەگرێت و دەڵێت : (( بەڵام ئەو هەواڵانەی دەگێردرێنەوە، بنەمایەکی پتەویان لەو مەسەلەیەدا نییە ))[٤٨٢] . هەروەك لە ساڵی ( ١٩٥٨ )[٤٨٣] یش جەختی لەسەر دەکاتەوە .

لە کۆتاییشدا مینۆرسکی وتارەکەی بە تەوەرێك سەبارەت بە رێورەچەڵەکی ئەو تایفەیە بە کۆتا دەهێنێت، پێی وایە بیروباوەڕ و ئایینی جۆراوجۆری هەڕەمەن[٤٨٤] .

مینۆرسکی ئەو بابەتەی دواتریشی هەر لاگرنگ بووە، بە بەڵگەی ئەوەی کە کتێبی (کاکەییەکان لە مێژوودا )ی عەباس عەزاوی لەساڵی (١٩٥٣) خستە بەرچاوو لێدوان، رووبەرێکی تارادەیەك فراوانی بۆ تەرخان کرد. لەو پێداچوونەوەیەدا مینۆرسکی دووبارە جەخت لەسەر بیروڕاکانی پێشووی لە کاتی بەسەرکردنەوەی راکانی عەزاوی[٤٨٥] دەکاتەوە، بەڵام رەخنە لە بیرورای نووسەرەکەی، سەبارەت بە رێورەچەلەکی ئەو تایفەیە و سەرجەلەی سوڵتان ئیسحاق دەگرێت و دەڵێت (( لە س. ج. ئەدموندزی برادەرم بیست، کەوا سەیدەکانی بەرزنجە. دەوروبەری ساڵی ١١٣٠ز، بە مێژووی مردنی سوڵتان ئیسحاق دادەنێن، کە مێژووییەکی زۆر زووە و من دەتوانم بوونی ئەو ئاینزایە بۆ

---

(٤٨١) نفسە ، ص١٠٣ .

(٤٨٢) نفسە.

(٤٨٣) بڕوانە : بابا طاهر ، دائرة المعارف الإسلامية ، ط١ ، ج٣ ، ص٢٢٨ .

(٤٨٤) المرجع السابق، ص ص١٠٣ – ١٠٤ .

(485) Review of A-Azzawis al-Kakiyya. Oriens. 1953. Vol. vi. P.408.

سەردەمی قەرەقۆینلۆ نزیك ساڵی ١٤٠٠ ز ببەمەوە))[٤٨٦]. هەروەها رەخنەی لەو شتانەی دیکەش گرت کە عەزاوی لە بارەی ئەو تایفە نووسیوونی[٤٨٧].

جارێکی دیکەش لەساڵی ( ١٩٥٦ ) بابەتەکەی سەروبەر کردەوە و ئەوەش لەسەروبەندی نووسینی وتارێك بوو لەبارەی ئەو تایفەیە بۆ چاپی دووەمی ئینسکلوپیدیای ئیسلام[٤٨٨]، وەکو هەمان وتارەکەی چاپی یەکەم بوو ، بەڵام ئـەوەیان کورتتر بوو و مینۆرسـکی هـەندێ پـاژی لێ فـرێ دابـوو، بـەڵام بیبیلیوگرافیایەکی بۆ ئەو تۆژینەوە و کتێبانەی کە لەنێوان ساڵانی ( ١٩٣٤ — ١٩٥٦ ) بڵاوکرابوونەوە کردبووە پاشکۆی وتارەکە، سەرباری ئەو سەرچاوە ئامـاژە پێکـراوانەی کـە لـە لێکۆڵینەوەکـانی پێشـووی، کـەچی لەبارەی ئەو تایفەیەوە هەر لەسەر هەمان بیروڕاکانی پێشووی خۆی مایەوە .

لەساڵی ( ١٩٦٤ ) ئەو وتارەی کە لەبارەی ئەهلی هەقی لەساڵی ( ١٩٥٦ ) بڵاوکردبۆوە ، لەنێو ئەو وتارانەبوون کە بۆ کتێبی ئێرانیکای[٤٨٩] هەڵبژاردرابوون ، جـا وتـارێکی دیکـەی نووسـی، دڵی بـەو کورتەیەی پێشتر نووسیبووی ئاوی نەخواردەوە، بەڵکو سەرلەنوێ بیروراکانی داڕشتەوەو درێژەی بە بابەتەکە داو ئەو زانیارییە نوێیانەی دەستی کەوتبوو خستنە سەر .

بـۆ ئـەو تـۆژینەوەش سـەرچاوەی رۆژهەڵاتی نـوێی وەك کـتێبی ( برهان الحـق)[٤٩٠] و (الکـاکـائیة في التأریخ) بەکـارهێنا ، هـەروا زانیـاری لەسەرچاوەی رۆژهەڵاتنـاسی دیـاری وەك (عـەلی ئیـلاهی) ، ف. ئیفـانـۆفی رۆژهـەڵاتـناس،

---

(486) Ibid، pp. 408-409.
(487) Ibid، p.410.
(488) Ahl-al-Haqq، Vol. I،pp.260-263.
(489) Iranica، pp.306-316.

(٤٩٠) (برهان الحق): لەم دواییانەدا یەکێ لە پەیرەوانی ئەو تایفەیە بەناوی نورعەلی ئیلاهی کوڕی حاجی نعمەتوڵلای دانەری کتێبی ( فرقان الاخبار) نووسیویە . بڕوانە: برهان الحق ، (تهران : ١٣٦٦ ك . هـ . ) ، ص١ — ٢ .

هەڵێنجـاوە و کـەڵکی لـە تۆژینـەوە بڵاوکـراوەکـانی محەمەد موکری بەزمانی فەرەنسی وەرگرتووە[491].

ئەوەی تایبەتە بە تۆژینەوەکە ، تەوەرەی مێژوویی تایفەکەیە ، هەرچەندە زانیاری و مێژووی دیارکراوی تێداهاتووە، لەگەڵ بە بەردەوامی دانان بە بەوەی کە ((دانانـی پاشـخانێکی مێژوویی بـۆ ئەهـلی هـەق ئـەرکێکی وا ئاسان نییە لەسەر بنـەمای ئـەو سـەرەقەڵەمـانەی لە کتێبەکـانی ئەو تایفەیەدا هەن ))[492] ، کاتێ باس لەسەردەمەکانی دوایی مێژووی ئەو تایفەیە دەکات، دەڵێت : ((خاڵی گەش ئەوەیـە، بگوترێت کەوا شاخوشین بە ٣٦٠ ( ٣٠٠ ) ساڵ دوایی عەلی – کە لە ٣٥ – ٤٠ ك / ٦٥٦ – ٦٦١ ز خەلیفـە بـووە – دەرکەوتووە ، ئەوەش دەمانباتەوە سـەرەتای سـەدەی یـازدەیـەمی دوایی زایین ..شاخوشینیش بـە شێوەیەکی سەیروسەمەرە لە کچی یەکێ لەسەرۆکانی جاف لە دایك بووە ؟ .... ))[493] .

سـەبارەت بە سـەردەمی سوڵتان ئیسحاقیش دەڵێت : (( سوڵتان ئیسحاق دامەزرێنـەری ئایینی ئـەهلی هەقـە. دەڵێن باپیرەی، سەیدێکی هەمـەدان بووە، هاتۆتە ناوچەی گۆران، باوکی سوڵتان ئیسحاقیش بە گـوێرەی ئـەو یـاداشتانەی کـە یـەکێ لە دانـایانی ئـەهلی هەق کۆی کردوونەتەوە ئـەوا سەیـد عیسایـە و لە ٦٧١ ك / ١٢٧٢ز سوڵتان ئیسـحاقی لێ بووە . لـە دەوروبەری ٧١٦ ك / ١٣١٦ز دا ئایینی نوێ دەستی پێکردووە[494]، ئەو زانیارییە نوێیانەشی لە کتێبی ( کردو ترك و عرب ) ی ئەدموندزی رۆژهەڵاتنـاس و کارگـێری بـەریتانی راگوازتووە.

ئینجا مینۆرسکی دێتە سەر مێژووی دوای سولتان ئیسحاق – ئەو ماوەیەی کـە پێشتر بـە درێژی ئامـاژەی بـۆ نەکـراوە – دەڵێـت : (( پـاش ئیسحاق پشێویـەکی زۆر دەکـەوێتە زنجیرەی ئـەو سەرۆکە ئایینیانـەی بـەلکی رەسەنی

---

(491) Iranica، pp. 312-315.
(492) Ihid، p.312.
(493) Ibid، p. 312.
(494) Ibid، pp. 312-313.

تایفەکە دەگەنـەوە، لەوانە " قرمزی پێنجەم و محەمەد بـەگی شەشەم و خـان ئاتـەشی حەوتـەم " پیاوێکی چاك هەیـە بەنـاوی ئیبراهیم کە بەنەوەی ئیسحاق دادەنـرێ ، سـەردەمەکـەی بـۆ نیـوەی دووەمی سـەدەی چـواردەیـەم دەگەڕێتەوە))[٤٩٥].

مینۆرسکی ئامـاژە بـە چـالاکی هەرسێ سەرۆکی دوای ئیسحاق دەکات و پوختـەی قسەکانی لەبارەیانـەوە ئەوەیە کە تێکۆشانی قرمزی لە خاکی گۆران دابووە، محەمەد بەگیش کارەکـەی لە دلفانی باکووری لوڕستان دەست پێ کرد، هەروەها ئاماژەی بە چالاکی سەرۆکانی دیکەش دەکات[٤٩٦] لە خستنەڕووی ئەو زانیـارییە نوێیانـە پشـت بـە دەستنووسێك دەبەستێ بەنـاوی (هەفتەوانە)، هـەروەها پشتیشی بـە کتێبی ( راحـة الصدور ) ی راوندی ( لە ٦٠٢ ك / ١٢٠٥ز مردووە)[٤٩٧] (مجمل التـواریخ وقصص أخـری)ی نووسەرێکی نەناسراوە (پشتی ٥٢٠ ك / ١١٢٦ ز مـردووە) بەستووە، وەك هەموو جارێکیش باسەکـەی بـە بەرچاوخستنی ئەو نووسـراوانەی لەبارەی ئەو تایفەوە تا ساڵی ١٩٦٣ نووسراون بـە کـۆتا دەهێنێت ، بەمـەش ڕێگـای بـۆ ئەوانـە کورت کردۆتەوە کە بایەخ بە لێکۆڵینەوەی لەو بابەتە دەدەن[٤٩٨] .

**سێیەم : هۆزە کوردەکان :**

مینۆرسکی چـاوی بە میرنشـین و قـەوارەی سـیاسی کـوردی نەکـەوتووە، بەڵکو هۆزو پیاو ماقووڵانی بینیووە . بۆیە بنەمای تێگەیشتنی بۆ کـورد و مێژوو و جوگرافیای وڵاتەکەیانە ، ناسینی هۆزو لك و تیرەکانیان و شوێنی هاتووچۆیان بووە، ناسین و ئاشنابوونی بە هۆزە کوردەکانەوە لەو نوینانەوەیە:

---

(495) Iranica، p.313.

(496) Ibid، pp. 313-314.

(٤٩٧) هەفتەوانە: بە بەشێکی کتێبی سەرئەنجام دادەنرێت. سەدیق سەفی زادە بۆرەکەیی ساخیکردۆتەوەو بڵاوی کردۆتەوە ، دورە هفتوانە جزوی ازنامە مینوی سرانجام ، ( تهران : ١٩٨٢ ) المقدمة ، ص ص١٥ -- ٢٠ .

(498) Iranica، pp. 315-316.

أ- له ئەنجامی سەردانەکانی بۆ ناوچەی هۆزەکانی کوردەواری و دانیشتن لە گەلیاندا.

ب- سەرچاوەکان : ئەویش دەبێتە :

١- سەرچاوەی کۆن و نوێی ئیسلامی .

٢- سەرچاوە رۆژهەلاتناسییەکان ، چ رووسی چ ئەوانی دی بن.

ئەوەی جێی ئاماژە پێ کردنە مینۆرسکی لە کتێبەکەیدا لەبارەی کورد، جەخت لەسەر رەسەنایەتی ئەو هۆزانە دەکاتەوە و سەرەتای پەیدابوونیان لە کوردستان بۆ سەدەی حەوتەمی پێش زایین دەباتەوە ، لە دەمی مامۆستاکەی بارتولدی رۆژهەلاتناسی گەورەی رووسیدا دەلێت، کەوا کورد لە رۆژهەلاتەوە بۆ رۆژئاواوە کۆچیان کردووە[٤٩٩]. بە راشکاویش رای خۆی دەربڕیوە کە کورد نەوەی میدییەکانن و دەلێت: (( کوردە ئێرانییەکان خەلکی دێرینن لە بەشەکانی باشوور، رایشی وایە کەوا ئەوان راستەوخۆ رۆلەی میدییە کۆنەکانن، کە لە ناوچەکانی رۆژئاوای ئەو ولاتەدا دەژین ))[٥٠٠]. لە کۆنگرەی رۆژهەلاتناسی جیهانی، کە لەسالی ( ١٩٣٨ )[٥٠١]دا بەسترا ، بەدرێژی جەختی لەسەر ئەو راستییە کردۆتەوەو تا دوا ساتەکانی ژیانیشی هەر لەسەر ئەو رایەی مایەوە[٥٠٢].

دوای ئەوەی جەختی لەسەر رەسانەیەتی گەلی کورد کردەوە، ئاورێکی گشتی وەسەر هۆزە کوردەکانیش داوە - کە بنچینەو کرۆکی ئەو گەلەن -

---

(٤٩٩) الاکراد ، ص ص٢١ - ٢٢ .

(٥٠٠) نفسه ، ص٢٢ .

(501) Les Origines، pp.143-152.

(٥٠٢) بە بەلگەی وەلامی ئەو نامەیەی کە زانای کوردی رووسی کوردوییف لەبارەی رێورەچەلەکی کوردەوە ، بۆی ناردبوو ، کە دکتۆر کەمال مەزهەر وەریگێراوە ، بڕوانە : الاکراد احفاد المیدیین ؛ وتارەکە لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ؛ ( بەغدا : ١٩٧٣ ) ؛ ب ١ ؛ لا ٥٥٢ - ٥٦٦ بلاوکراوەتەوە . ئەگەرچی هەندێ کەس ئەوە ناسەلمێنن و بەنامەی تۆفیق وەهبی دەزانن ، بڕوانە : معروف خزندار ؛ المستشرق الکبیر مینورسکی ، وتارەکە لە گۆڤاری زاگرۆس ، (هەولێر : ١٩٩٧ ) ، ع١ ، ص ص١٢ - ١٣ ، پەراوێزی ژمارە ( ٦ )، بەلام بۆچی توفیق وەهبی ( لە ١٩٨٤ کۆچی دوای کردوە ) خۆی نکۆلی ئەوەی نەکردووە ؛ خۆزگە ئەگەر بکرێ وەرگێر، دەقی ئەسلی نامەکەی بلاوکردبایەوە .

دەڵێت : ((لای هەمووان روونە، کورد هۆزی رەوەند و شارین بە تێکەڵاوی لەگەڵ یەکدی دەژین ))[(٥٠٣)]. هەر لەو دەمەی کە واتای بۆ ئینسکلوپیدیای ئیسلامی دەنووسی و هەندێکیان لەبارەی هۆزە کوردەکانەوە بوون ، لەشەش هۆزی کورد بەجیا دواوەو لە نێواخنی باسە جیاجیاکاندا ئاماژەی بە گەلێ هۆز کردووە.

لەساڵی ( ١٩٢٧ )[(٥٠٤)] دا کە بابەتی ( کورد ) ی بۆ ئینسکلوپیدیای ئیسلامی نووسی ، تەوەرێکی بۆهۆزە کوردەکان تەرخان کرد و ناوی هەموو ئەو هۆزە کوردانەی کە مەسعودی و ئیستەخری باسیان کردووە ، هێناوە ، دەڵێت ئەوانە: (( پێش هەمووان زانیاری رێك و رەوانیان لەبارەی کورد داوینەتێ))[(٥٠٥)]، لە نێو وردیانی ئەو تەوەرەدا لە هەمبەر هۆزی شوانکارە[(٥٠٦)] وەستا و بیرورای جۆراوجۆری لەبارەیەوە لێ رادەگوێزێ و دەڵێت : (( لەلایەکی دیکەشەوە ئەوا فارسنامە هۆزی شوانکارە بە کورد دانانێت ، ئەو هۆزە لە دوادوای سەردەمی بنەماڵەی "ئال بۆیە" لە وڵاتی فارسدا بەهێز بوون ، (مسالك الأبصاري ) عومەریێ (لە ٧٤٩ك / ١٣٤٨ز مردووە)، شوانکارە بە هۆزێکی سەربەخۆ دادەنێ و بە کوردیان نازانێ،[(٥٠٧)] هەروەها شەرەفنامەش ئەوانە بە بنەماڵەی کورد دانانێت ))[(٥٠٨)]

---

(٥٠٣) الاکراد ، ص٣٣ .

(٥٠٤) جێی سەرنجە کەوا بەر لەو مێژووە لەبارەی هۆزەکانی : ( سنجابی و شکاك و شقاقی ) لە ئینسکلوپیدیای ئیسلامی نووسراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی دەچێتە سەردەمی مێژووی نوێ بۆیە خۆمان لێی بوارد .

(505) Kurd، EI¹، p.1135.

(٥٠٦) لەسەرچاوە ئیسلامییەکاندا بەزۆری ناوی ( شبانکارە )ی بەسەردا زاڵە ، کە هۆزێکی کوردی دانیشتووی هەرێمی فارسن ، میرنشینێکی بەهێزیان لەو ناوچەیەدا لە نێوان ساڵانی ( ٤٤٨ -- ٧٥٦ ك / ١٠٥٦ -- ١٣٥٥ ز ) دامەزراند . بۆ درێژەی بڕوانە : محمد بن علی بن محمد شبانکارە ای ، معجم الانساب ، تصحیح میر هاشم محدث ، ( تهران : ١٣٧٦ ك. هـ. ) ، ص ص١٥١ -- ١٨١ .

(٥٠٧) دەستنووسی (مسالك الابرار فی ممالك الامصار) فوئاد سزکین، دەری کردووە، (ئاستانبول:١٩٨٨) ، السفر الاول، ص١٣٧.

(508) Kurd، p.1135.

دوای بەرچاوخستنی ئەو ڕاوو بۆچوونانەی کە شوانکارە بە کورد دانانێن، ڕایەکی دیکەش هەیە دەڵێت (( لەگەڵ ئەوەش یەکێ لەو هۆزانەی سەروساختیان بە "شوانکارە"وە هەیە ناوی "ڕامانی" یە کە ناوی یەکێ لەو هۆزە کوردانەن، کە ناوی لە پێڕستەکەی "ئیستەخریدا" هاتووە))[٥٠٩].

ئیدی مینۆرسکی لەو قسەو گۆتە ناکۆکانە دەدوێت بێ ئەوەی بابەتەکە بباتەوە سەر یەك و بنبڕی بکات. لەگەڵ داننان بە کوردبوونیان . ئەوە دەقەکەیەتی((هەموو بەڵگەو نموونەکان بەڵگەی ئەوەن کە کوردەکانی نیشتەجێی فارس بەشێوەیەکی دیار لە هۆزەکانی دیکەی کوردستان ناکەن))[٥١٠] لە ساڵی (١٩٣٥)یش ڕایگەیاند کە شوانکارە بنەچەکەیان کورد نین.[٥١١]

لەباسی مادەی کورددا، بەپشت بەستن بەقسەی شەهابەدین عومەری ( لە ٧٤٩ك / ١٣٤٨ز مردووە ) لە کتێبی (مسالك الابصار) و کتێبی (صبح الاعشى)ی قەلقەشەندی[٥١٢]، ناوی بیست هۆزی کورد لە سەردەمی مەملوکی (٦٤٨ – ٩٢٣ك / ١٢٥٠ – ١٥١٧ز) دەهێنێت.

مینۆرسکی لە ساڵی (١٩٢٨)دا وتارێکی لە هەمان ئینسکلوپیدیادا سەبارەت هۆزی لەك نووسیوە و ئاوا پێناسەی دەکات : ((هۆز گەلێکی کوردن لە ئەوپەری باشووری ئێران و لە هەندێ گاویشدا لەگەڵ لوڕ لەلانی جەستەو ڕێوڕەچەڵەکەوە تێکەڵ دەبن لە ئەوپەری باکوورەوە بۆ ئەو شوێنانەی کە هەنووکە لێی نیشتەجێن کۆچیان کردووە ))[٥١٣].

سەبارەت بە زمانی ئەو هۆزەش مینۆرسکی ئاماژە بە گوتەی و. مانی ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی دەکات، کەوا ((زاری لەك هەمان خەسڵەتی زمانی کوردی

---

(509) Ibid.
(510) Ibid.
(٥١١) نامەی مینۆرسکی بۆ موکریانی لە ٢٢ی شوباتی ١٩٣٥؛لە فەسلی سێیەم بەریەرچی ئەوە دەدەینەوە .
(512) Kurd، pp. 1141-1142.
(513) Lak، EI[1]، Vol. V،p.10.

هەیە))[٥١٤]، هەمان قسەش بەرای جریکوف ڕۆژهەڵاتناسی رووسی پشت ئەستور دەکات کەوا (( لوڕ و لەك بەزاری جیاجیا دەئاخێون ))[٥١٥] هەروەها قسەی شەرەفنامەشی کردۆتە بەڵگە کەوا هۆزی لەك بەڕەگەز و زمان کوردن[٥١٦] .

هەر لە هەمانساڵدا وتارێکی لەبارەی هۆزی لوڕ نووسیوە و ئاوای دەست پێکردووە ئەوان: ((ئێرانیین و لە چیاکانی خوارووی ڕۆژئاوای ئێران دەژین، وەکو کوردەکانیش دابەش دەبنە سەر چوار پارچە، مامەسانی و کەلهوڕ و بەختیاری و لورە ڕەسەنەکانن ... لوڕەکان لە ژێر کاریگەریی فارسەکاندا، تەنانەت وا دەردەکەوێت کە فارس بن ))[٥١٧].

دوای ناساندنی ئەو هۆزە ، قسەی سەرچاوە ئیسلامیەکانیش لەبارەی ئەو هۆزە تۆمار دەکات، لەوانە کتێبی (مروج الذهب )ی مەسعودی ، کە لە هۆزە کوردەکان دەدوێت و ناوی لوڕیش دەبات، هەروا یاقوت حەمەوی لە (معجم البلدان) ئەویش جەخت لەسەر کوردبوونی هۆزی لوڕ دەکات. سەبارەت بە ناوی لوڕیش قسەی ڕۆژهەڵاتناسان وەردەگرێت، فون بودی ڕۆژهەڵاتناس پێی وایە ناوەکەی (لە هەر ئەسپ – لهراسب) وەرگیراوە، هەرچی یوستی ڕۆژهەڵاتناسیشە، لەو بڕوایەدایە کە لوڕ ماناى سۆر دەدات[٥١٨] .

مینۆرسکی لە وتارەکەیدا پێ لەسەر زمانی هۆزەکە دادەگرێت و پەنجە بۆ کۆمەڵە زاری لوڕەکان درێژ دەکات و دەڵێت دابەش دەبنەسەر :

أ- زاری لوڕی گەورە کە زاری هۆزەکانی مامەسانی و کهیگیلو و بەختیاری و لوڕی ڕەسەنن .

ب- زاری لوڕی بچووك کە زاری لوڕە فەیلییەکانن، مینۆرسکی پێی وایە کە یەکەمیان سیمای زمانی فارسی هەیە، بەڵام دووەمیان لە کوردی

(514) Ibid.
(515) Ibid، p.10.
(516) Ibid، 11.
(517) Lur،EI[1]، Vol.V.p. 41. لەبەشی سێیەم وەڵامی دەدەینەوە
(518) Lyr،p.41.

نزیکتره[٥١٩]. وتارەکەی بەو قسەیە دوایی دەهێنێت (( ئەو بابەتە پێویستی بە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی پتر هەیە ))[٥٢٠].

لەوتارەکەی کە لە ساڵی (١٩٢٨)دا لەبارەی ئەهلی حەقی نووسیوە، نەختێ بـە درێژی باسـی هـۆزی گۆرانی[٥٢١] کـردووە و دەڵێت (( گـۆران ناوی هۆزێکە لەچیاکانی زاگرۆس دەژین ... هۆزی گۆران لەبەر ئەو هۆیانە گرنگن: ئەو هۆزە بـەزارێکی تایبـەتی ئـێرانی دەئـاخێون کـــە کـوردی نییە، لــە زاری گـۆرانیـدا ئەدەبێکیـان هەیـە بە شـیعری گۆرانی و داستان سەقاو دراوە . ڕێورەچەڵەکی گۆڕانیش زۆر ئاڵۆزە ، ڕەنگە بچنەوە سەر دەیلەمییەکان ))[٥٢٢].

لە سـاڵی (١٩٤٣)دا، لـە لێکۆڵینــەوەیەکی تایبەتیـدا بە نـاوی (گۆران) مینۆرسکی تیشکی خسـتە سەر لایەنە جۆراوجۆرەکانی هۆزی گۆران، واپێدەچێ لەبـەر ئەو هۆیانە خۆی لەقەرەی ئەو بابەتە دابێت وەك : ئەدەبی تایفەی ئەهلی هەق بەزاری گۆرانی نووسـراوە، مینۆرسـکی چەندیـن لێکۆڵینـەوەی لەبارەیانەوە هەیـە وەك پێشــتر ئاماژەمـان پێ کرد هەروەها کۆمەڵێك دەستنووسی بەو زارە وەگیر کـەوتوون[٥٢٣]، جـا سـێیەکی لێکۆڵینـەوەی بـۆ ئـەو ئەدەبەی بەو زاراوە نووسـراوە تەرخــان کـردووە. لـە هەموو ئەمانـەش گرنگتر نووسەرەکەی ویستی ئــەوە بسەلمێنێ کە هۆزی گۆران، نەبەڕەگەز و نە بەزمان، کورد نین . بەڵام وەك پاشان باسی دەکەین کەوتۆتە هەڵەوە .

مینۆرسکی لێکۆڵینەوەی بە خستنەڕووی پوختەیەك لەبارەی زاراوەی کورد دەسـت پێ کــردووە، هــەر وەك هەمــزە ئەسـفەهانی (لە ٣٦٠ك / ٩٧٠ز )[٥٢٤]

---

(519) Ibid، pp.43-44.

(520) Ibid، p.44.

(٥٢١) گۆران: هۆزێکی دیارن لە باکووری لوڕستان و ناوچە جیاجیاکان دەژین، لە سەرچاوە ئیسلامییەکاندا بە جورقان بێژراوە، بەڵام ئێمە بێژە نوێیەکە بەکاردەهێنین، چونکە پتر لە نێو توژەران بەکاردێت.

(522) Etudes sur les، p.91. بڕوانە بەشی سێیەم بۆ پەرچدانەوەی ئەو ڕاوبۆچوونەوەی

(٥٢٣) بڕوانە بەشی سێ یەم .

(٥٢٤) تأریخ سني ملوك الأرضي والبناء ، (بیروت –١٩٦١)، ص١٥١.

نووسیویه، پاشان ئامـاژه به قسـه‌ی نووسـه‌ری شـه‌ره‌فنامه ده‌کات که‌وا گه‌لی کورد له چوار به‌ش پێك هاتووه که ئه‌مانه‌ن : کرمانج ، لورِ ، که‌لهورِ وگۆرانن . به‌لاّم مینۆرسکی پێچه‌وانه‌ی ئه‌مه ده‌بینیّ و پێیوایه لورِ و گۆران کوردنیین[٥٢٥] .

مینۆرسکی ئه‌و لێکۆڵینـه‌وه‌ی بۆ ئـه‌وه نووسـیوه تـا بیسه‌لمێنـیّ گۆران نه به‌رِه‌گه‌ز و نه به‌زمان کوردنیین، بۆیه ته‌وه‌رێکی بۆ گفتوگۆکردن سه‌باره‌ت به رِه‌سـه‌نی ئـه‌و هـۆزه ته‌رخـان کـردووه، مینۆرِسکی جیاوازی له نێوان گـۆران و گـووران ده‌کات، بێژه‌ی (گه‌بران)ش هه‌یه که په‌یره‌وانی زه‌رده‌شتن و ناوه‌که‌ش له گاوبازان، گاوراکان و گوراکان و گووران و گوران داتاشراوه[٥٢٦] .

بۆ پشـت ئه‌سـتوور بـوون بـه‌و رِایـه‌ی قسه‌ی ولاّتناسان و مێژوونووسانی موسـڵمانی وه‌ك ئیبن خـرداذبه و ئیبن فـه‌قیـه‌و یاقـوت حه‌مـوی و ئیبن ئه‌ثیر و حه‌مـدوڵلاّ قه‌زوێنی و شـه‌هابـه‌دین عومه‌ری و شه‌ره‌فخانی به‌دلیسی، که ناوی وه‌ك جابـرقه یـان جوره‌قـان یـان گـورانانیان به‌کارهێناوه، به‌ره‌به‌ره بێژه‌که گـۆرِاوه و بۆتـه ((گـۆران)) لای شـه‌هابه‌دین عومه‌ری و شه‌ره‌فخانی به‌دلیسی به‌گوێره‌ی بیر و رِای مینۆرسکی[٥٢٧] .

دوای به‌ڵگه هێنانه‌وه‌ی ئـه‌و سـه‌رچاوانه مینۆرسـکی ئه‌وه‌ی لیّ هه‌ڵێنجا که نـاوی هـۆزی گـۆران له سـه‌رچاوه عـه‌ره‌بیه کۆنه‌کـاندا به‌شـێوه‌ی ( جابـرق، جوره‌قـان، کـورانان) هاتـووه، واپێده‌چێت کـه بنچینـه‌ی وشه‌کـه سه‌روکاری به ناوچـه‌ی خوارووی ده‌ریای قه‌زوینه‌وه هه‌بێت ، ئه‌و ولاّته هه‌ر له کۆنه‌وه شوێنی جموجۆڵ و جوڵانه‌وه‌ی مرۆڤ بـووه و له‌وێشه‌وه به‌ره‌و رِۆژئاوا و رِووه و چیاکانی زاگرۆس کۆچی کردووه ، دواجار ئه‌وا زاری گۆران و زازا کوردی نیین، ئه‌ویش به پشتبـه‌ستن به قسه‌ی ئۆسکارمانی رِۆژهه‌لاّتناسی ئه‌ڵمانی[٥٢٨]، به‌لاّم لـه کۆتایی ده‌ره‌نجامه‌کـانیدا به‌شـی ئـه‌وه‌نـده‌ی ده‌رگـای بـۆ توێژه‌رانی دیکـه والاّ کردووه

(525) The Guran، p.75.
(526) Ibid. p.78.
(527) Ibid. pp. 80-85.
(528) The Guran، pp.86-89. بۆ په‌رچدانه‌وه‌ی ئه‌و رِاوبۆچوونه‌ی برِوانه: به‌شی سێیه‌م.

تـا ئـەو ڕاوبۆچوونانە فراوانتر بکەن یان ڕاستی بکەنــەوە، بۆیــە دەڵێت (( نابێ پەلە بکـەین و حوکـمی خێرا بدەین، واباشترە هزری مێژوویمان بۆ دوارۆژ بەجێبهێڵین بۆ ئەوکەسەی ڕاستییەکان بەشێوەیەکی ورد دەدۆزێتەوە ، دەربکەوێ ))[٥٢٩]

لەساڵی (١٩٤٥) کۆمەڵەی شاهانەی ئەنترۆپۆلۆجی بانگهێشـتی مینۆرسکی کـرد تـا لێکۆڵینەوەیــەک[٥٣٠] بخوێنێتــەوە ئــەویش باسـێکی لەمــەڕ هۆزەکانی ڕۆژئــاوای ئێران هەڵبــژارد، کــە لە مــەڕ هەردوولایەنی لێکۆڵینەوەی مێژوویی و ئەنترۆپۆلۆجی دەدوا و لە گۆڤاری کۆمەڵە لە ساڵی (١٩٤٩)دا بلاوی کردەوە .

مینۆرسـکی ســەردەقی لێکۆڵینــەوەکــەی بــە پێشەکییەکی کورت لەبارەی جوگـرافیای ناوچـەکە بـە پشــت بەسـتن بـە زانیاری و شارەزایی مەیدانی خۆی، شکاندبوو ، پوختەیەکی مێژووی کۆنی بەسەرکردبووەوە ، سەبارەت بە مێژووی ناوچەکــە لــە ســەردەمی ئیســلامیشدا مینۆرسـکی دەڵێت دانیشـتوانەکەی لەو عــەرەبانە بــوون کەلــە ڕۆژگاری فەتحی ئیسلامییەوە هاتبوون و لەگەڵ خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکەدا تواونەتەوە[٥٣١].

پاشــان باسـی دیلەمییەکــان[٥٣٢] دەکـات کە لە سەدەی چوارەمی کۆچی/ دەیەمی زایینی و سەلجوقییەکانیش[٥٣٣] لەسەدەی پێنجەمی کۆچی/ یازدەیەمی زایینی لە ناوچەکـەدا سەریان هەڵداوە، دوای ئەوانیش مەغۆلەکــان

(529) Ibid، 89.
(530) Minorsky، the Tribes، p.75.
(531) Ibid، pp. 73-74.

(٥٣٢) دەیلەم: گەلێکی ڕەسەنی ئێرانن، بەرەچەلەک لە خوارووی خۆرئاوای دەریای قەزوین پەیدابوونە بنەماڵەیەکیان توانیویانە دەوڵەتێک بەناوی بویهی لەنێوان ساڵانی (٣٢٤-٤٤٧ک/٩٤٥-١٠٥٥ز) دابمەزرێنن ، بڕوانە:
Minorsky، "Daylam"، $EI^2$; Vol.1، pp.189-194.

(٥٣٣) سەلجوقییەکان: هۆزگەلی تورکن و لکێکن لە هۆزەکانی ئەلغوز لەسەدەی پێنجەمی کۆچی/ یازدەمینی زایینی پەیدابوون و توانیان دەوڵەتێکی فراوان لەدوای لەناوچوونی بویهییەکان تا ساڵی (٥٩٥ک/١١٩٨ز) دابمەزرێنن، بۆ درێژەی بڕوانە الحسيني، زبدة التواريخ اخبار الامراء والملوك السلجوقية، تحقيق محمد نورالدين ، (بيروت:١٩٨٦).

لــە سەدەی حەوتــەمی کــۆچی / سێزدەیــەمی زایینی پەیــدابوون و شـــاری تــەورێز بووە پایتەختیان[534] .

مینــۆرسکی مێــژووی نـــوێی ئـــازەربایجـــانیشی لـــە لێکــۆڵینەوەکــدا بەســەرکــردۆتەوە و باســی لــەو کــەمینانەی وەك هۆزگەلی لوڕ و کورد و گۆران دەکات کــە لــەو ڕۆژگارەدا لەوێ بوون و بە زمانی خۆیان دەدوان و دانیشتــوانی ناوچەکــەیان پێــك دەهێنا. بــەڵام هەرچی لــەو بارەیــەوە گــوتویــەتی دووپاتی ڕاوبۆچوونەکانی پێشوویەتی کە دیارترینیان لێك جودابوونەوەی لــوڕ و گۆران لە کورد[535] .

لە کۆتــایی باســەکەشیدا وەك خــووی تایبــەتی خــۆی، ئــەو سەرچاوانەی لە لێکۆڵینەوەکــەیدا بەکــاری هێناون ڕیز کردوون ، هەمووشیان ئەو توژینەوانەن کە پێشــتر بــڵاوی کــردوونەتــەوە کە ئەمانەن : ئەهلی هەق ، کورد ، ڕێوڕەچەڵەکی کورد ، گۆران، دەسەڵاتی دەیلەمییەکان[536] .

**چوارەم : بنەماڵە کوردە فەرمانڕەواکان**

مینۆرسکی بوارێکی دیکەشی لە مێژووی کــورد بــەسەرکــردۆتەوە، ئــەویش هەندێ بنەماڵەی کــوردی فەرمانــڕەوان، کــە دەکــرێت بە تەواوکەری بایەخدانی مینۆرسکی بــە مێژووی هــۆزە کــوردەکان دابنــرێت، ڕەگ و ڕیشەو ئاگــاداری و بایەخــدانی بە ڕاشــکاوی لــە کتێبی (کــورد) دا دیارە کە لە ساڵی (١٩١٥) بڵاوی کردۆتەوە .

مینۆرسکی سەرپێیی ئاماژەی بەو بنەماڵە کوردە فەرمانڕەوایانە کردووە : بنەماڵەی حەسەن وەیهی کە لە دینەوەر و شارەزوور لە نێوان ساڵانەی (٣٤٨ — ٤٠٦ك / ٩٥٩ — ١٠١٥ز) دەسەڵاتیان پــەیدا کــرد ، بنــەماڵەی مــەڕوانی کــە لە باکــووری هــەرێمی جــزیرە لــە نێــوان ســاڵانی (٣٨٠–٤٩٠ك / ٩٩٠–١٠٩٦ز)

---

(534) The Tribes. p.74.
(535) Ibid. pp. 76-79.
(536) Ibid. p. 80.

فەرمانڕەوایەتیان دەکرد؛ هەروەها نیگای بڕیوەتە بنەماڵەی ئەیوبیش (٥٦٤-٦٤٨ك/١١٦٨-١٢٥٠ز) کە سەلاحەددینی ئەیوبی دامەزرێنیان بوو[٥٣٧].

بایەخدانی بە مێژووی سیاسی کورد و توێژینەوە لە بنەماڵە فەرمانڕەواکانیان لە سەردەمی ئیسلامەتی لە نووسینی بابەتی (کورد) لە ساڵی (١٩٢٧) بۆ ئینسکلۆپیدیای ئیسلام بەدەردەکەوێت، کە تێیدا تیشك دەخاتە سەر ئەو هەوارە مێژوویانەی کورد، هەر لە فەتحی ئیسلامەتی ناوچەکەوە پێدا ڕۆیشتووە و باس لە نەخش و بزاڤ و جموجۆڵەکانیان لە سەردەمە یەك لە دوایەکەکان دەکات، دیارترینیشیان بزاڤ و جموجۆڵەکانی دەیسەمی کوڕی ئیبراهیمی کورد بوو لە ئازەربایجان و ئەرمینیا کە سی ساڵی خایاند(٣١٥-٣٤٥ك / ٩٢٦-٩٥٦ز) مینۆرسکی دەڵێت باوکی دەیسەم عەرەب بووە[٥٣٨]. لە لێکۆڵینەوەکانی دیکەشدا جەختی لەسەر ئەوە کردتەوە.[٥٣٩]

هەروەها ئامارژە بەو بنەماڵە کوردە فەرمانڕەوایانەی حەسەنوەیهی و مەڕوانی و عەنازی و ئەحمەدیلی و شەدادی و ئەیوبی و سەروکاریان لەگەڵ هێزەکانی دەوروبەریان لەو سەردەمەدا دەکات.[٥٤٠] تیشکی خستۆتە سەر نەخشی کورد لە سەردەمی مەغۆلەکان و کاریگەریی خراپی شالاوی مەغۆلی لەسەر نەخشی سیاسی کورد لە ناوچەکەدا[٥٤١]. لە ڕۆژگاری مەملوکییەکانیشدا بەتەنیا باس لە دەسەڵاتی سەربەخۆی کورد لە ماردین دەکات، بە پشت بەستن بە کتێبی ( مسالك الابصار )ی شەهابەدین عومەری؛ بەڵام ئامارژەی بەوە کردووە کە سوڵتانەکانی مەمالیك بە نیازی بایەخدان بە وڵاتی کوردان بوون و تەنانەت پەیوەندیشیان پێیانەوە هەبوو . هەروەها جەخت لەسەر هەلومەرجی خراپی کورد لە ژێر سایەی فەرمانڕەوای هەردوو بنەماڵەی ((قەرەقۆینلو و ئاق قۆینلو ))ی تورکمان دەکاتەوە. لە لێکۆڵینەوەکانی

---

(537) Kurd. pp. 1136-1137. الاکراد، ص ص٢٠-٢١.
(538) Studies. pp. 113-114.
(539) Kurd. pp. 1136-1140.
(540) Ibid.
(541) Kurd. pp. 1141-1142.

دواتریشیدا جەختی لەسەر ئەو هەلومەرجە کردۆتەوە[542] و ئینجا باسی شەش بنەماڵەی فەرمانڕەوای کورد بەشێوەیەکی سەربەخۆ دەکات .

### أ- لوڕی گەورە[543] (٥٥٠-٨٢٧ك / ١١٥٥-١٤٢٣ز) :

لە ساڵی (١٩٢٨)یش لە باسی لوڕدا دەیەویست بابەتەکە تەواو بکات و لە تەواوی مێژووی سیاسی وڵاتی لوڕستان بدوێ . لە باسی ئەو بنەماڵەیەدا دەست پێ دەکات: (ئەو بنەماڵەیە لە نێوان ساڵانی (٥٥٠-٨٢٧ك / ١١٥٥-١٤٢٣ز) لە ڕۆژهەڵات و خوارووی لوڕستان فەرمانڕەوایەتیان دەکرد ، پایتەختیان مالامیر بوو ))[544] .

پاشان مینۆرسکی باسی ئەبو تاهیر کوڕی عەلی کوڕی محەمەد فەزلەوی دامەزرێنی ئەتابکی دەکات کە کوردی شامە، بەخۆی و هۆزەکەی لە دەوروبەری ساڵی (٥٠٠ك/١٠٠٦ز) بۆ ئازەربایجان کۆچیان کردووە .

پاشان لە لۆڕستان جێنشین بوون . هەروەها باسی چۆنیەتی وەرگرتنی دەسەڵات لەوێ و دامەزراندنی حکومەتی سەربەخۆی لە ساڵی (٥٥٠ك/١١٥٥ز) دەکات، کە بە (فەزلەوییە)، کە ناوی دامەزرێنەریەتی ، ناسراوە[545] .

پاشان سەروسۆراخی مێژووی فەرمانڕەواکانی بنەماڵەی ناسراو بە ئەتابیك[546] دەکات و لەگەڵ ناوهێنانی تیشك دەخاتە سەر کارەکانیشیان و ڕووداوە دیارەکانی ئەو سەردەمە بە کورتی ، تا ئەودەمەی دەسەڵاتداریەتیان

---

(542) La perse Au xv^e، Iranica، p.320.

(٥٤٣) بۆ درێژەی بڕوانە: رمضان شریف زبیر الداودي، لورستان الکبری(٥٥٠-٨٢٧ك / ١١٥٥ - ١٤٢٣ ز) ، ر.م. غ ، الآداب: (جامعة صلاح الدين/ أربيل : ١٩٩٤) ، ص٣٢ و دواتر .

(544) Lur-I Buzurg، EI[1]: Vol. V،p. 46.

(545) Ibid.

(٥٤٦) ئەتابەك: وشەیەکی تورکییە لە دوو برگە پێك هاتووە: "ئەتا" واتە باب، (بەگ)یش واتە میر باوکی میر یان بەخێوکەری میر. بۆ درێژەی بڕوانە: القلقشندي، صبح الاعشی في صناعة الانشاء، شرح وتعليق يوسف علی طويل، (بيروت:١٩٨٧) ،ج٤، ص١٨، محسن محمد حسين ، أربيل في العهد الاتابكي ، (بغداد: ١٩٧٦) ص ص٢٤-٢٦.

لەسەر دەستی سوڵتان ئیبراهیمی کوڕی شاهرخی کوڕی تەیمورلنگ لە دەستدا، ئەویش لە ئاکامی هێرشێکی بەربلاو بۆ سەر غەیاسەدین کوڕی کاوێس کوڕی هۆشەنگی ئەتابەگ کە خۆی لەبەر ڕانەگرت و لە وڵات دەریانپەڕاند ، پاشان فەرمانڕەوایەتی دەکەوێتە دەست سەرکردەکانی هۆزگەلی بەختیاری[٥٤٧] .

ب- **لوڕی بچووك[٥٤٨] (٥٨٠-١٠٠٦ك /١١٨٤-١٥٩٧ز) :**

باسەکەی بە پێناسەکردنی دەست پێ دەکات و دەڵێت ((سەرۆکەکانی ئەو بنەماڵەیە لە باکوور و ڕۆژئاوای لوڕستان لە نێوان ساڵانی (٥٨٠-١٠٠٦ك /١١٨٤-١٥٩٧ز) فەرمانڕەوایەتیان کردووە ... پایتەختیشیان خورەم ئاوا بووە))[٥٤٩] ، ئینجا دەڵێت ((بنەچەی ئەو بنەماڵەیە بۆ تایفەی لوڕ "جنکروی" دەگەڕێتەوە ... ئەو ئەتابەگییەی بە خورشید ناسراوە و دامەزرێنی شوجاعەدین خورشید بوو ... دوا بە دوای ساڵی ٧٣٠ك/١٣٢٩ز جڵەوی فەرمانڕەوایەتی کەوتە دەست بنەماڵەیەکی دی کە خۆیان دەبەنەوە سەر تۆرەمەی عەلی[٥٥٠] و نازناوی مەلیکیان لە جیاتی ئەتابك بەکارهێنا ))[٥٥١] .

پاشان بە کورتی باسی هەر بیست و چوار ئەتابەگ و مەلیکێك دەکات . لە کۆتایی وتارەکەشیدا باسی لەناوچوونی بنەماڵەکە بە دەستی شا عەباسی سەفەوی دەکات ، ئەویش دەسەڵاتەکەی دایە دەست حوسێن خانی کوڕی مەنسور بەگی سلاوریزی کە ئامۆزای شاوردیخانی شای لێکەوتوو بوو[٥٥٢] .

ئەو سەرچاوە سەرەکیانەی کە نووسەر لەبارەی ئەو دوو بنەماڵەیە بەکاری هێناون ، سەرچاوەی فارسین و وەك (گزیدە)ی حەمەدوڵڵا مستەوقی قەزوێنی و

---

(547) Op. cit. pp. 46-48.

(٥٤٨) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: علی سید و الگورانی: اللر و لرستان ، لێکۆڵینەوەکە لە گۆڤاری المجمع العلمي الكردي (بغداد: ١٩٧٤) مج٢، ف٢. ص ص١٢٤-١٤٢. بلاوکراوەتەوە .

(549) Lur-i kuchik. EI[1]: Vol. v.p. 48.

(٥٥٠) واتە عەلی کوڕی ئەبی تالیب (خوا لێی ڕازی بێت)

(551) Lur-i Kuchik. pp.48-49.

(552) Ibid. p.48-49.

(جهاننامه)ی حاجی خەلیفە و(شەرەفنامە)و سەرچاوەی ڕۆژهەلأتناسی دیکەی وەك مێژووی مەغۆلی هورثی ڕۆژهەلأتناس .

جـ - بنەماڵەی شەدادیی[٥٥٣] ( ٣٤٠-٥٩٥ك / ٩٥١-١١٩٨ز )

دوای ئەوەی کە مینۆرسکی لە ساڵی (١٩٤٤) لە خوێندنگای لێکۆڵینەوە ڕۆژهەلأتناسییەکان ، خۆی تەرخان کرد بۆ نووسینی لێکۆڵینەوە و توژینەوەی قووڵتر لە بـواری جیاجیـادا، لەمەشـدا بایـەخی پتری بـە مێژووی بنـەماڵە فەرمانڕەوا کوردەکان دەدا، هەروەك لێکۆڵینەوە بە پێزەکەی لەبارەی بنەماڵەی شەدادی و ئەیوبی کە لە ساڵی (١٩٥٣) لە شێوەی کتێبێکی قەبارە مام ناوەندیدا بەناوی ( لێکۆڵینەوە لە مێژووی قەفقاس )دا بلأو کردەوە .

بەلأم سەبارەت بە بنەماڵەی شەدادی وادیارە مینۆرسکی لێکۆڵینەوەیەکی نووسیوە کە زانیاری پتری خستۆتە سەر، کەچی زۆر کەم بۆتە جێی بایەخی تۆژەرانی پێش خۆی[٥٥٤] ، کارەکەشی بلأوکردنەوەی دەقێکی بەنرخ بوو لەبارەی ئەو بنەماڵەیە لە کتێبی (جامع الدول)ی نووسەری تورك منجم باشی (١١١٣ك/١٧٠٢ز) کە ئەو بەشەی سەروکاری بەو بنەماڵە فەرمانڕەوایە هەیە ناوی ( باب في الشدادية) لەگەڵ وەرگێڕانی و دەوڵەمەندکردنی بەلێدوانی زمانەوانی و جوگرافی و مێژووییەوە .

دەکرێ لێکۆڵینەوەکانی لەبارەی شەدادیەکان بکەینە سێ بەش ، وەرگێڕانی دەقەکە ، لێدوان و دواتر لێکۆڵینەوەی مێژوویی لەبارەیەوە ، بەری ئەوانەش، هەموو پێشەکییەکی بۆ کتێبەکە نووسیوە، تێیدا هۆیەکانی بایەخدانی بەو بنەماڵەیە ڕوون کردۆتەوە کە مینۆرسکی وای داناوە ((بازنەیەکی ونە کە ناکرێ بێ ئەو تەنیا لایەکی ڕووداوەکان ببینێ ، لە لایەکی دیکەشەوە

---

(٥٥٣) بۆ درێژەی مێژووی بنەماڵەی شەدادییەکان بڕوانە: رسول، الشداديون؛ ص٤٩ و بەدواوە .

(٥٥٤) لە پێشەکی کتێبەکەیدا مینۆرسکی ئاماژەی بە دیارترینی ئەو نووسراوانە کردووە کە لە بارەی ئەو بنەماڵەیە لە لایەن تۆژەرانی ڕۆژهەلأتی یان ڕۆژئاوا نووسراون کە پازدە لێکۆڵینەوەن؛ هەندێکیان بە کتێب و هەندێکیشیان لەشێوەی وتارن . بڕوانە:
Studies، pp.2-3.

شەدادیەکان ببوونە لایەنێکی دام و دەزگاکانی دەوڵەت لەو کاتەی کە (اباطرة) بیزەنتییەکان بۆ خۆش کردنی جێ پێی خۆیان لە ئەرمینیا و ڕۆژهەڵاتی قەفقاس .. لە دواجاریشدا ئەوا شەدادییەکانیش یەکێك لە ڕواڵەتەکانی سەردەمی ناوبڕ (( الفترة الفاصلة )) ی ئێران بوون . کە ئەگەرچی سەردەمێکی کورتیش بوو، بەڵام زۆر بە بایەخ بوو ، چونکە ناوبڕی هەردوو سەردەمی دەسەڵاتداریەتی عەرەبی و تورکی بوو(٥٥٥) .

پاشان مینۆرسکی دەسەنگرێتەوە و هەوڵ دەدات ڕاستی ئەو دەقەی بەکاری هێناوە دەربخات کاتی دەڵێت (( هیچ یەك لەو نووسەرانەی پێشوو ، تەنانەت ئەوانەی کە وەرگێڕدراوە تورکییەکەی منجم باشی ، کە ئەحمەد نەدیم لە ساڵی ١٧٣٠ لە ژێر ناوی ( صحاف الاخبار لە ساڵی ١١٨٥ك/١٧٦٨ز) وەرگێڕدراوە و بلاویشی کردۆتەوە، نازانن ئەوە کورتەی کارێکی گەورەترە و بە عەرەبی بەناوی (( جامع الدول))ی ئەحمەدی کوڕی لوتفوڵڵای ناسراو بە (منجم باشی) نووسیویەتی و لە ساڵی (١٧٠٢ز / ١١١٣ك) لە مەکە کۆچی دوایی کردووە و سەرچاوەیەکی زۆریشی تێیدا بەکار هێناوە ...))(٥٥٦) ، کەواتە یەکەم کەسە کە گەڕاوەتەوە سەر سەرچاوە ڕەسەنەکە و پشتی بەو دەقەی وەرگێڕ نەبەستووە .

لەکاتی وەرگێڕانیشدا بابەتەکەی کردۆتە برگە و ئەویش کردوویەتــە نۆزدە کەرت(٥٥٧) . هەر بە وەرگێڕانی وشە بەوشەی دەقەکەش لێ نەگەڕاوە ، بەڵکو لــە پاشکۆیەکی تایبەتیشدا لێی دواوە(٥٥٨) و زۆریشی خــۆ بــە ڕاســت و دروست نووسینی ناوە جیاجیاکان ماندوو کردووە .

لەو لێکۆڵینەوە مێژووییەی کە مینۆرسکی لەبارەی مێژووی شەدادییەکان نووسیویە ، هەر بەتەنیا باسی ئەو بابەتانەی منجم باشی نووسیوویەتی ناکات ،

---

(555) Studies، pp.1-2.

(556) Ibid، p.3.

(557) Ibid، pp.5-25.

(558) Studies، pp.25-33.

بەڵكو سەرچاوەی دیكەش بەسەر دەكاتەوە بۆ تیشك خستنە سەر ئەو لایەنانەی كە ئەو سەرچاوەیە بایەخی پێنەداوە ، مێژووی بنەماڵەكەشی كردۆتە دووبەش : یەكەم بەناوی (فەرمانڕەوایان و داگیركاران ) و دووەمیش بەناوی (شەدادییەكانی ئانی ) .

لە بەشی یەكەمدا باسی ڕێوڕەچەڵەكی شەدادییەكان دەكات و هەر بەكوردیان دادەنێ، لەمەشدا پشت بە قسەی منجم باشی و( ابن الأثیر لە ٦٣٠ك / ١٢٣٣ز مردووە ) دەبەستێ و بەوەش ئەوقسەی ماركوارتی ڕۆژهەڵاتناس ڕەت دەكاتەوە كە دەڵێ ئەو بنەماڵەیە دەیلەمینە.[٥٥٩]

پاشان باسی محەمەد كوڕی شەداد (لە ٣٤٤ك/٩٥٥ز مردووە)ی دامەزرێنی میرنشینەكە لەساڵی (٣٤٠ك/٩٥٦ز ) لە شاری دوین دەكات و چۆن دوای سێ ساڵان فەرمانڕەوایەتیان لێ سەندۆتەوە[٥٦٠].بەپاڵپشتی دەقی منجم باشی لەسەر لێكۆڵینەوەكەی بەردەوام دەبێت وباسی هەرسێ كوڕەكانی[٥٦١] دەكات كە ئەبو حەسەن لەشكری (٣٦٠-٣٦٨ك/٩٧٠-٩٧٨ز) وعەلی مەرزەبان (٣٦٨-٣٧٥ك/٩٧٨-٩٨٥ز) و فەزلە . لەو برگەیەدا ڕەخنە دەگرێت و لەگەڵ قسەی فاردانی[٥٦٢] مێژوونووسی ئەرمەنی سەبارەت بە بێوەژنی محەمەدی كوڕی شەداد و هەرسێ كوڕەكانی بەراوردیان دەكات و چۆن لەشكری كوڕە گەورەی

---

(559) Ibid، pp.33-34.

(560) Ibid، pp. 36-37.

(561) Ibid، pp.37-39.

(٥٦٢) فاردان: زانا و قەشەیەكی ئەرمەنی بوو لە لاهوت دا پسپۆڕ بوو. كتێبێكی مێژووی نووسیوە بە ڕووداوەكانی كۆن دەستی پێ كردووە . تا ساڵی (١٢٦٧) لە ساڵی (١٢٧١ز) مردووە . بڕوانە جمال رشید احمد ؛ لقاء الاسلاف الكرد واللان فی بلاد الباب و شروان ، (لندن : ١٩٩٤، ص ص٢٥-٢٦ .

بەیــارمەتی برابچووکەکـەی دەستی بەسـەر شـاری گەنجـەدا[٥٦٣] گرت لە ساڵی (٣٦٠ك/٩٧٠ز)[٥٦٤].

پاشـان تـەوەرێك بـۆ میر فـەزڵی یەکــەم[٥٦٥] (٣٧٥-٤٢٢ك/٩٨٥-١٠٣١ز) تەرخان دەکات و قسەکەی منجم باشی بەگوتەی فاردان لەبارەی میرفەزڵ پشت ئەستور دەکات، کەچی ڕەخنە لە ئیبن ئەثیر دەگرێت، بەڵام جیاوازی لەنێوان فەزلون و فەزلی یەکەم ناکات[٥٦٦] . بە درێژی باسی ڕووداوەکانی سەردەمەکەی دەکـات ، ڕەخنە لەو قسەیەی منجم باشی دەگـرێت کـە لەبارەی ئـەو سەردەمە و دەڵێت: ((سەرچاوەکەمان پڕ زانیارییە، بەڵام گوێی بە تۆمارکردنی نشوستی شەدادییەکان نەداوە))[٥٦٧] باسی ئەو ڕووداوە گرنگانە دەکات کە بەسەریان هاتووە و تەوەرەکەش بە ناوهێنانی کوڕەکانی موسا و ئەبو ئەسوار و عەسکەوییە تەواو دەکات[٥٦٨] .

لە تەوەرێکی تایبەتیشدا باسی موسای کوڕی فەزل (٤٢٢-٤٢٥ك/١٠٣١-١٠٣٤ز)کوڕەکەی لەشکری (٤٢٥-٤٤١ك/١٠٣٤-١٠٤٩ز) و ئەنۆشیروانی کوڕی لەشکری (٤٤١ك/١٠٤٩ز)[٥٦٩] دەکات. سەبارەت بە کوشتنی لەشکریش لە لایەن باوکییەوە لەساڵی (٤٢٥ك/١٠٣٤ز) و بەرەنگاربوونەوەی هێرشی سەلجوقییەکان لە دەمی گەمارۆدانی شاری گەنجەدا ، مینۆرسکی ڕەخنە لە هەموو سەرچاوەکان دەگرێت بە منجم باشیشەوە، کە وێنەیەکی ڕوونیان سەبارەت بەو

(٥٦٣) گەنجە: لە شارەگەورەکانی وڵاتی ئارانە ، کەوتۆتە نێوان هەردووشاری بەرذعە و شەمەکۆر. بۆ زانیاری پتر بڕوانە : یاقوت ، معجم البلدان، ج٢، ص١٧١ .

(564) Studies، pp.38-39.

(565) Ibid، pp. 40-45.

(566) Ibid،P.42.

(567) Studies، pp.52-53.

(568) Ibid، pp.44-45.

(569) Ibid، pp.46-50.

ڕووداوانه نەخستۆته ڕوو.[٥٧٠] جا بۆ پتر ئاشنا کردنی مینۆرسکی، هاتووه پشتی به زانیاری درەنگتر به ستووه .

ئینجا تەوەرەیەکی سەربەخۆ بۆ شاوری کوڕی ئەسواری یەکەم[٥٧١] (٤٤١–٤٢٩ك/١٠٤٩–١٠٦٧ز) دەکاتەوه و سەرەتا له ژیان و فەرمانڕەوایەتی له دوین دەدوێت ، هەرچەنده منجم باشی باسی ئەوه ناکات، چونکه مەبەستی نووسینی مێژووی شەدادییانه، ئەوا ئەو دەق و بابەتانەی لەسەرچاوه ئەرمەنی و بیزەنتییەکانی وەرگرتوون فەرامۆش ناکات . بەپاڵپشتی کتێبی مێژووی ڕەهاوی نووسەری ڕەهاوی نادیار (له ٦٤٢ك/١٢٣٤ز مردووه ) بەدرێژی لەسەروساختی ئەبی سوار لەگەڵ ئەرمەن وسەلجوقییەکان دەدوێت . بەکەڵك وەرگرتن له سەرچاوه بیزەنتییەکانیش باسی هێرشی بیزەنتییەکان بۆ سەر ئەبی سوار دەکات.[٥٧٢] هەروەها سەبارەت به چالاکییەکانیشی دەڵێت (( بێ گومان ژیانی ئەبێ ئەسوار لەو ماوەیەدا تژی موغامەراته وبێ گومان ناو و دەنگی وەك موجاهیدێك بنەمایەکی پتەوی بۆڕەخساند ))[٥٧٣].

جارێکی دیکەش تۆژەر هەست به نەخشی شارەزایی مینۆرسکی لەناوی شوێنەکان و دروست ڕاگرتنی قەوماوه مێژووییەکان دەکات[٥٧٤] ؛ دوای گفتو گۆ کردن لەبارەی ئەو ڕووداوانەی لەو ماوەیەدا قەوماون، ئاماژه به مردنی ئەبی ئەسوار له ساڵی (٤٥٩ك/١٠٦٧ز)ی دەکات و ڕەخنه لەو قسه هەڵەیەی سەبارەت به نەخشی ئەبی ئەسوار لەشەڕی مەلازگرد گرت، که چوار ساڵ دوای کۆچی دوایی ئەبی ئەسوار قەوماوه .[٥٧٥]

---

(570) Ibid، pp. 46-48.

(571) Ibid، pp. 50-59.

(572) Ibid، p. 43.

(573) Ibid، p. 56.

(574) Studies، pp.64-66.

(575) Ibid، pp.58-59.

لەباسی پەلاماری نقفور لەدژی ئەبی ئەسوار لە سالّی(٤٤١ك/١٠٤٩ن) مینۆرسکی زۆری خۆ بە دیاریکردنی مێژووی ڕاست و دروستی ئەو پەلامارە ماندوو دەکات بۆ ئەوەی لەگەلّ ئەو ڕووداوانەی کە لە ئەرمینیا قەوماوە بەیەکەوەیان ببەستێتەوە ، بە پشت بەستن بە سەرچاوە کۆن و نوێیەکان بابەتەکە شەن و کەو دەکات [٥٧٦]، لەسەر ئەوەی لەو سەرچاوانەدا نووسراوە ئاوا دەلێت : (( دوای بەرچاوخستنی ئەو هەموو ڕاوبۆچوونانە ئەوا بیری من بۆ کاتێکی کۆنتر لە پەلاماری نقفور دەچێت و تەواو لە سالّی (١٠٤٨ز ، ١٠٤٩ن) واتە بەر لەوەی ئەبی ئەسوار فەرمانرەوایەتی لەگەنجە بگرێت دەست ))[٥٧٧] .

کەدێتە سەر باسی سەردەمی فەزلی دووەم[٥٧٨] (٤٥٩-٤٦٦ك/١٠٦٧-١٠٧٣ن) ئاوا دەست پێ دەکات:(( شەدادییەکان لە سەردەمی ئەبو ئەسواردا زۆر بەختەوەربوون ، بەلاّم لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی کوڕەکەی فەزلی دووەم بەختەوەری پشتی لەو بنەمالّەیە کرد . سەلجوقییەکان لە وێرانبوونی ئەو میرنشینە بەرپرس بوون ))[٥٧٩] .

لە بەدواداچوونی توژینەوەی دەقەکـەدا دێتە سەر باسی فەزلون[٥٨٠] "فەزلّی سێیەم" (٤٦٦-٤٦٨ك/١٠٧٣-١٠٧٥ن) ، ڕەخنـە لـە مێژوونـووسی ئێـرانی ئەحمەدی کسروی (لە١٩٤٥ مردووە)دەگرێت کـە دەلێت ئەمیری وابوو نییە، بـەلاّم بەڕای مینۆرسکی بەلّگەی زۆر لەسەر ڕاستی و دروستی بوونی ئەو میرە هەن کە هیچ بوارێك بۆ گومـان ناهێلّنـەوە کـە ئاماژەش بە لادانیش فەزلـەون وەرگـرتنی دەسەلاّت لەلایـەن ساوتـەکینی سەلجوقی دەکـات، دەلّـێت ((ئەوا مانای ئەوەنییە کە کۆتایی فەرمانڕەوایەتی شەدادییەکانە ))[٥٨١] .

---

(576) Ibid، pp. 63-64.

(577) Ibid، p. 64.

(578) Ibid، p. 58.

(579) Ibid، p. 64.

(580) Ibid، pp. 67.

(581) Ibid، p. 67.

مینۆرسکی لە بەدواداچوونی مێژووی ئەو بنەماڵەیە لە شاری ئانی[٥٨٢] لە نێوان سالأنی (٤٥٦–٥٩٥ك/ ١٠٦٤–١١٩٨ز)[٥٨٣] بەردەوام دەبێت ، ئەگەرچی منجم باشی باسی ناکات ، بەلأم هەرچی مینورسکییە بە پشت بەستن بە کسروی مێژوونووس ئەوەی ڕاستییە پەرش و بلأوەکانی لەسەرچاوە ئیسلامییەکان کۆکردۆتەوەو باسی لێوەکردوون ؛ لەگەڵ ئەوەش ڕەخنەی لێ دەگرێت کەوا. (( بەوردی لە بابەتەکەی نەکۆڵیوەتەوە و لە سەرچاوە رووسی و جۆرجییەکاندا نەگەڕاوە ))[٥٨٤] ، چاو بە کتێبی فاردانی ئەرمەنیدا دەخشێنێ و چەندین برگەی کورتیش لە کتێبی مێژووی فارقی[٥٨٥] و لە سەرچاوەیەکی فارسی بەناوی ( أنيس القلوب – هۆگری دڵان)ی قازی بورهانەدین ئەبو نەسر کوری مەسعودی ئانەوی[٥٨٦] و چەندین سەرچاوەی ڕۆژهەلأتناسی دیکە ، وەردەگرێت.[٥٨٧]

سەرەتا لەبەسەرکردنەوەی مێژووی ئەو بنەماڵەیە لە شاری ئانیدا ئاماژە بە جیاوازی زۆری نێوان گەنجەی پایتەختی کۆنی بنەماڵەکەو شاری ئانی نوێدا دەکات ، یەکەمیان شارێکی ئیسلامی کۆنە و هەرچی شاری دووەمیانە ئەرمەنییەکان و دواتریش بێزەنتییەکان فەرمانڕەوایەتیان تێدا کردووە . لە لایەکی دیکەشەوە شوێنی شارەکە کەوتۆتە ناوجەرگەی ململانێی تورکی و جۆرجی و وای لێکردووە کە چارەنووسی بەو ململانێیەوە بەند بێ[٥٨٨] .

---

(٥٨٢) ئانی: شارێکە کەوتۆتە باکووری ڕۆژهەلأتی ولأتی ئەرمینیا. یاقوت؛ معجم البلدان؛ ج١، ص٢٥٧ .

(583) Ibid، pp. 79-106.

(584) Ibid، p. 79.

(٥٨٥) تأريخ الفارقي: دانەری ئەحمەدی کوڕی یوسفی کوڕی عەلی کوڕی ئەزرەقە (لە ٥٧٢ك/١١٧٦ز مردووە ).

(586) Studies، p.100.

(587) Ibid، pp. 79-80.

(588) Ibid، p.80.

بۆ خستتنەڕووی مێژووی شەدادییەکان لە ئانی مینۆرسکی زنجیرەی میرەکان بەسەردەکاتەوە و هەر لەمەنوچەهرەوە[٥٨٩] دوای (٤٥٦-٥١٢ك/١٠٦٤-١١١٨ز). کە بەهۆی سیاسەتی نەرمی لەگەڵ ئەرمەنەکان خۆشیان ویستووە.[٥٩٠] پاشان تەوەرێك بۆ ئەبو ئەسواری دووەمی[٥٩١] (٥٠٢-٥١٨ك/١١١٠-١١٢٤ز) دوومانی دەکاتەوە، کە پێچەوانەی سیاسەتی باوکی بوو لەگەڵ ئەرمەنەکان ((مانگێکی زیوونی گەورەی لەسەر کاتەدرائییەی ئەرمەنی لەئانی دانا))[٥٩٢] کە باوکی خۆی لەسەری لادابوو[٥٩٣]، بەلاَم هەرچی مینۆسکی لەو بارەوەی نووسیوە، ئەوا لە فاردانی ئەرمەنی لایەنگیری وەرگرتووە و مینۆرسکیش ڕەخنە لەو قسانەی ناگرێت .

مینۆرسکی لە لێکۆڵینەوەکەیدا باسی فەزلەونی سێیەمی[٥٩٤] کوڕی ئەبی ئەسوار دەکات کە لە نێوان سالآنی (٥١٩-٥٢٤ك/١١٢٥-١١٣٠ز) فەرمانڕەوایی کردووە و لە جموجۆڵەکانی دەدوێت و دەڵێت : (( فەزڵەون زۆر پەرۆشی بەدەست خستنەوەی شکۆمەندی لەدەست چووی بنەماڵەکەی بوو ... دەستی بەسەر هەردووشاری گەنجەو دوین داگرت ))[٥٩٥]. بەمردنی فەزلەون کێشەی نوێ سەریان هەڵدا ، مینۆرسکی تیشك دەخاتە سەر جموجۆڵی براکانی ((مەحمود و کوشیر و ناوی سێیەمیش نابات)) ، بەقسەی فاردان ئەوا سێیەمیان چۆتە سەر ئایینی مەسیحی و بۆتە قەشەو لەکەنیسەدا لە خەلوەتدا بووە[٥٩٦] .

---

(589) Ibid، pp. 80-83.

(590) Ibid، p.82.

(591) Studies، p.86.

(592) Ibid، p.83.

(593) Ibid، p.82.

(594) Ibid، pp. 84-86.

(595) Ibid، p.85.

(596) Ibid، pp. 83-84.

دوای ئەمە مینۆرسکی ئاماژە بە نەخش و بزووتنەوەی کوڕەکانی مەحمود: شەداد و فەزلەونی چوارەم یان ((پێنجەم)) و شاهنشاه دەکات ، بەڵام دەڵێت : ((شتێکی کەم لەبارەی ڕووداوە جۆراوجۆرەکان دەزانین ))[٥٩٧] .

دوای ئەوەی بە درێژی پەنجە بۆ پەلامارەکانی ئەبخاز[٥٩٨] و کەرج[٥٩٩] و بۆ سەر شاری ئانی درێژ دەکات ، مینۆرسکی دەڵێت :(( شەدادییەکان ماوەیەکی کورت لە ئانی مانەوە، قەشەکان پەلاماریان داو لە فەخرەدین شەدادی کوڕی محەمەد کوڕی مەنوچەهری وەرگرت و دایە فەزلەونی برای ... شەدادیش ڕووی لە وڵاتی شام کرد بۆ لای ئەسەدەدین شێرکۆ کە شادی باوکی سەربەو بنەماڵەیە بوون ... ماوەیەك شەداد چووە خزمەت نورەدین زەنگی[٦٠٠]، پاشان چووە ماردین[٦٠١]، ئەو قسەیەشی بە پاڵپشتی قسەی ئیبن ئەثیر و فارقی و قەسیدەیەکی بورهانەدین ئانوی، کردووە .

بە دابڕانی شەدادییەکان لە فەرمانڕەوایەتی و دواتریش گەڕانەوەیان، ئەوا مینۆرسکی لەکارەکەی دووچاری دژواری دێت ، بەتایبەتیش پاش دەسەڵاتی جۆرجییەکان بەسەر ئانیدا لە ساڵی (٥٥٦ك/١١٦١ز)[٦٠٢] و گەڕانەوەی ڕۆڵەکانی ئەو بنەماڵەیە بۆ ماوەیەك[٦٠٣] ، بەلأم لە دەقێکی نەخشێندراوی دۆزراوە لە شاری ئانی تۆژەر زانیاری تازە دەخاتە سەر، کەوا ئەو بنەماڵەیە

---

(597) Ibid، pp. 86-89.

(٥٩٨) ئەبخاز: گەلێکن لەڕۆژئاوای قەفقاس لەسەر دەریای ڕەش دەژین. بۆ زانیاری پتر بڕوانە: مینورسکی ،أبخاز؛ دائرة المعارف الاسلامية ، ط٢، ص ص١٣٧–١٤٠ .

(٥٩٩) کەرج: مەسیحیین لە چیاکانی قەفقاس و وڵاتی سەریر نیشتەجێن . بڕوانە: یاقوت ، معجم البلدان؛ ج٢ ، ص٣٦٨ .

(٦٠٠) نورەدین زەنگی: لەدوای عیمادەدین زەنگی لەساڵی (٥٤١ك/١١٤٦ز) هاتە سەر تەخت ، دەسەڵاتی خۆی لەشام جێگیر کرد و بەهەموو توانایەکییەوە بەرهەڵستی خاچ پەرستەکانی کرد تا لە ساڵی (٥٦٩ك/١١٧٣ز) کۆچی دوایی کرد. بۆ زانیاری پتر بڕوانە: ابن الأثير ، التأريخ الباهر، ص ص١٦١–١٩٤؛ التكريتي ، الايوبيون ، ص ص٥٢–٧٢ .

(601) Studies، pp.87-88.

(٦٠٢) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: رسول ؛ الشداديون ؛ ص ص٨٧–٩١ .

(603) Studies، pp.90-103.

فەرمانڕەوایەتیان تا ساڵی (٥٩٥ك/١١٩٨ز)[٦٠٤] درێژەی هەبووە ، هەروەك ئەحمەد کسروی[٦٠٥] مێژوونووس و سیردینسی رووسی[٦٠٦] ڕۆژهەلاتناس و حوسێن حوزنی موکریانی[٦٠٧] و ئیسماعیل شوکری تۆژەریش[٦٠٨] سەلماندوویانە.

مینۆرسکی لە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەیدا لەبارەی شەدادییەکان تیشك دەخاتە سەر لایەنی سیاسی و ئابووری هەردووشاری دوین و ئانی و نەخشیان لە مێژووی بنەماڵەی شەدادییەکاندا[٦٠٩] .

## د- بنەماڵەی ئەیوبی (٥٦٤-٦٤٨ك/١١٦٨-١٢٥٠ز) .

لە درێژەی تۆژینەوە مێژووی قەفقاس لەسەردەمی ئیسلامەتیدا بەشێکی تەواوی کتێبەکەی لێکۆڵینەوە لە مێژووی قەفقاسی بۆ بنەماڵەی سەلاحەددین[٦١٠] تەرخان کردووە، هەروەك مینۆرسکی خۆی دەڵێت: (( وتاری مێژووی شەدادییەکان زەمینەی لێکۆڵینەوەی لە سەروساختی نێوان ئەیوبییەکان و قەفقاسدا سازکرد))[٦١١]. پێی وابوو (( ناوچە سەرەکییەکانی نیشتەجێی کورد لە خوارووی ئەرمینیایەو ... لە ڕۆژگارێکی زووەوە رووەو ڕۆژئاوای ئازەربایجان ڕۆیشتوون))[٦١٢]، سەبارەت بە ئەیوبیەکانیش دەڵێت، ((بێگومان ڕەگوڕیشەیان بۆ سەردەمی بووژانەوەی ئێرانی دەگەڕێتەوە، کە هاودەمی سەرەتای هێرشەکانی تورکە ))[٦١٣] .

---

(604) Ibid، pp. 100-101.

(٦٠٥) شهرياران گمنام ، (تهران: ١٣٣٥هـ.ش) ؛ ج٣ ،ص ص٢١٦-٢٢٧ .

(٦٠٦) بنوشداد ، دائرة المعارف الاسلامية ، ط١ ، ج١٢، ص١٨٣ .

(٦٠٧) کوردستانی موکریان ، ص٤٥٨.

(٦٠٨) الشداديون ، ص٩١ .

(609) Studies، p.109.

(610) Ibid، pp.107-156.

(611) Ibid، p.109.

(612) Ibid، p.113.

(613) Ibid، pp. 104-106.

له سەرەتایی تۆژینەوەکەیدا مینۆرسکی تیراژێك دەکاتەوە کە سەرنجی نووسەرانی سەرو سەربردەی سەلاحەددینی ڕانەکێشاوە (( ئەویش سەروساختی بنەماڵەکەیەتی بە کاروباری قەفقاس و ئێرانەوە.. هەرچی سەبارەت بە باوباپیرانی دەگوترێت ئەوەیە، کە ئەوان سەر بە بنەماڵەی فەرمانڕەوای کوردی شەدادیین))(٦١٤) هەر لە دەراوی شارەزایی لە ئازربایجان و بنەماڵەی شەدادییەوە دەچێتە سەر مێژووی ئەو بنەماڵەیەشەوە .

سەردەقی توژینەوەکەی بەناساندنی کەسایەتی سەلاحەددین لە کەلەپووری ڕۆژئاواوە دەشکێنێ(٦١٥) . ڕەخنە لەو ڕۆژهەلاتناسانە دەگرێت کە پێی سەرسام بوون، پاشان لە تەوەرێکی سەربەخۆدا دەگەڕێتەوە سەر ڕەگ و ڕیشەی ئەو بووژانەوە ئێرانییەی کە بنەماڵەی فەرمانڕەوای کوردی ئەیووبی لێ بەدەرە، بەڵکو گەلانی دیکەی ئێرانی وەك دەیلەمیی و بوەیهیی لەو سەروبەندەدا پەیدابوون(٦١٦) .

دوای ئەمانە مینۆرسکی باسی ئەو گۆڕانکارییانە دەکات کە بەسەر شاری دویندا هاتووە(٦١٧)، مینۆرسکی پێی وایە (( یەکێکە لە پایتەختە گەورەکانی ئەرمینیەکان و ئەرشاق خەسرۆی دووەمی پاشای ئەرمەنی دروستی کردووە))(٦١٨) ، ئاماژەش بە سەروکاری کورد بەوشارەوە دەکات و دەڵێت ((کورد لە زووەوە لە دەوروبەری دوین نیشتەجێن و ڕژێمە فەرمانڕەواکانی ئەرمەن و فارس و عەرەب خەمی لابردنی ئەو گەلەیان لە شارەکە لەخۆ بارنەکردووە ))(٦١٩) .

لە برگەکانی دواتریشدا سەرچاوە ئەرمەنی و ئیسلامییەکانی بۆ سەروبەرکردنی مێژووی شارەکە بەکارهێناوە، تێیدا هۆیەکانی کۆچکردنی

---

(614) Ibid.
(615) Ibid، pp.107-110.
(616) Studies، p.123.
(617) Ibid، pp.116-124.
(618) Ibid، p. 116.
(619) Ibid، p.117.

بنەماڵەی ئەیوبی شی دەکاتەوە و دەڵێت ((لەساڵی (٥١٢ك/١١١٨ز) دوین کەوتە دەست بنەماڵەی ئەحدەب (پشت کوڕ) ئەرزن ، هاتنی ئەو تورکانە وای لە بنەماڵەی ئەیوبییەکان کرد بۆ عێراق کۆچ بکەن))[٦٢٠].

دوای ئەوە لە باسی مێژوو و بنەچەکەی سەلاحەددین و بنەماڵەکەیدا ئەو دەقە لەئیبن خەلەکان (لەساڵی٦٨١ك/١٢٨٢ز کۆچی دوای کردووە) ڕادەگوێزی: ((شارەزایانی مێژوو لەسەر ئەوە کۆکن کە باو باپیرو کەسوکاری خەڵکی دوینن، شارێکە لە ئەوپەڕی قەڵەمڕەوی ئازەربایجان بەلای ئاران و وڵاتی کرج، ئەوانە کوردی ڕەوادیین ... بەرەبابێکن لە هەزەبانییەکان ... کە ئەوانیش هۆزێکی گەورەی کوردن ، فەقیهێکی شارەزای خەڵکی دوین پێی گوتم : گوندێك لەلای دەروازەی دوین هەیە ئەجندەقانی پێ دەڵێن هەموو خەڵکەکەی کوردی ڕەوادیین، ئەیوبی باوکی سەلاحەددین لەوێ لەدایك بووە، شادی هەردوو کوڕەکەی ئەسەدەدین شێرکۆ و نەجمەدین ئەیوبی بردن و چوونە بەغدا ، لەوێشەوە بۆ تکریت، شادی لەوێ مرد، گۆڕەکەی لەناو شاردایەو گومبەزێکی لەسەرە، گەلێکم سەروسۆراخی بنەچەکەی کرد، بەڵام جگە لە شادی ناوێکی دیکەی نەهاتووە))[٦٢١].

ئینجا مینۆرسکی دەڵێت : (( سەرچاوەکانی دیکە، زانیاری کەمتر لەو بارەیان تێدایە، بەڵام بارتولدی ڕۆژهەلاتناسیش دەڵێت، باوکی سەلاحەددین خەڵکی دوین بووە ))[٦٢٢]. هەرچەندە جەخت لەسەرشوێنی دوین لە ئەرمینیا دەکاتەوە، بەڵام گومانی لەناوی ئەجندەقان هەیە و دەڵێت :(( چ ئاماژەیەکم بۆ گوندی ئەجندەقانی سەلاحەددین نەبینیووە ، دەبێ ئەو ئەزدنکانە وەلابنێین کە موسا خۆرانی مێژوونووسی ئەرمەنی بەر لە نزیکەی چوار سەدە لە ناوچەکەی دەوروبەری ناوی هێناوە))[٦٢٣] لە تەوەرێکی سەربەخۆشدا ئاماژە بەرۆیشتنی

(620) Ibid، pp.111-112.

(٦٢١) وفيات الأعيان ، تحقيق احسان عباس ، (بيروت :١٩٧٩)،ج٧ ، ل١٣٩–١٤٠؛ Studies, pp. 124-125.

(622) Studies، p. 131.

(623) Ibid.

شادی و هەردوو کوڕەکانی لە دوین و نیشتەجیّ بوونیان لە تکریت دەکات، هەروەها ئەو پلەو پایە کارگێڕییە گەورانەی کە لە دەوڵەتی نورەدین زەنگی لە شامدا[٦٢٤] وەریگرت، ئینجا مێژووی بنەماڵەی ئەیوبی دیار دەکات و دەڵێت: ((یەکەمین مێژووی وردی بنەماڵەی ئەیوبی ساڵی(٥٢٦ك/١١٣٢ز)ه ))[٦٢٥] دوای خستنە ڕووی بیروڕای قسەی خەڵکانی دیکە پوختەیەك[٦٢٦] دەنووسێت و دەڵێت (( ڕەگەزی ئەیوب ئارییە... نە عەرەب بووە و نەتورك، بەڵکو کوردە و لە هۆزی ڕەوادییە، لە گوندی ئەزدنکانی نزیك دوین لە ئەرمینیا لەدایك بووە...))[٦٢٧] سەبارەت بە سەروساختی سەلاحەددین بە قەفقاسەوە، مینۆرسکی دەڵێت: ((سەلاحەددین لەناوچەی قەفقاس دانەبڕاوە، پاش ڕزگارکردنی قودس، مەسیحییەکانی ڕۆژهەلات لەوانەش جۆرجییەکان لە زۆر بۆنەدا پێوەندییان پێوە کردووە))[٦٢٨] ئەو رایەشی بە بەلگەی مێژوویی پشت ئەستوور دەکات[٦٢٩].

دوای ئەوە مەسەلەی گرنگی پێکەوەژیانی نێوان موسڵمان و مەسیحییەکان لە شاری دوین و دەوروبەری دەوروژێنێت و چۆنیەتی تێکەلاوی یەکتربوونیان لە ئاکامی ژن و ژنخوازی، ئەو لێبوردەیی و هاوسۆزییەی سەلاحەددین لەگەڵ مەسیحییەکان لە باووباپیرانی سەردەمی ئازەربایجانەوە بۆ مابۆوە. ئیدی بیروڕاکانی لەو بارەیەوە ئاوا کورت دەکاتەوە و دەڵێت: ((باوکی سەلاحەددین مامەکەی وەك شوانەوێڵەی نیمچە کێوی بۆ ڕانانی مێگەلەکان نەهاتوونەتە عێراق و وڵاتی شام... بەڵکو بە کەلتوورێکی تەواوی ڕژێمی سیاسی و ڕەوشتەوە هاتوون ))[٦٣٠].

ئینجا مینۆرسکی پتر جەخت لەسەر کوردبوونی سەلاحەدین و بنەماڵەکەی بە بەڵگە ڕاستەقینە مێژووییە ڕاستەوخۆکان دەکاتەوە و دەڵێت: (( هەندێ

---

(624) Ibid، p.130.
(625) Ibid، p. 125.
(626) Ibid. pp. 132-139.
(627) Ibid، p.132.
(628) Ibid، p. 133.
(629) Ibid، pp. 133-134.
(630) Studies، p. 137.

ڕۆمانسیەتی ئێرانی لەبەکارهێنانی هەندێ ناوی وەك تورانشا ، شاهنشا ، بەهرام شا ، فەروخ شا لەلایەن هەندێ لە ئەیوبییەکان بەدی دەکرێت))[٦٣١] ئەگەرچی زمانی عەرەبی بۆ نووسین و قسەکردنی تایبەتی لە نێو زانایانی ئەو بنەماڵەیە بەکاردەهێنرێت .

ئینجا بەڵگەی تۆکمەتر سەبارەت بە پێوەندی ئەیوبییەکان بە ڕۆڵەکانی گەلەکەیانەوە دەداتە دەست و دەڵێت (( لە هەمووشی هەرە گرنگتر گەلێ تیپی کورد لە ژێر سەرکردایەتی سەلاحەددین دابوون و هەندێ لە میرە کوردەکانیش پلەوپایەی بەرزیان لە کارگێری دەوڵەتی و سەربازی ئەیوبییەکاندا هەبوو))[٦٣٢]، لە پاشکۆیەکی تایبەتیشدا نموونە لەبارەی ئەو ڕاستییە تۆمار دەکات[٦٣٣].

پاشان مینۆرسکی باسی هاوسۆزی نێوان کوردەکان خۆیان دەکات و دەڵێت: (( کورد هەست دەکەن، ئەوان لەگەڵ تورکاندا جیاوازن ))[٦٣٤] هەروەها ئەو باس و خواسانە تۆمار دەکات کە لەدوای مردنی شێرکۆ لە ساڵی (٥٦٤ك/١١٦٩ز)، لەنێوان سەرکردەکانیدا قەومان و چۆن زیائەدین عیسای هەکاری توانی قایلیان بکات، سەلاحەددین لە شوێنی شێرکۆ هەڵبژێرن، کاتێ بە قوتبەدین یەنالی هەزەبانی گوت: ((تۆ و سەلاحەددین کوردن، پێویستە لێنەگەڕێن دەسەلات بکەوێتە دەست تورکان))[٦٣٥].

بەڵام لەگـــەڵ ئـــەو هاوسۆزی و لاگیرییـــەش مینۆرسکی دەڵێـــت : (( لەخەسڵەتە سیاسییە بەرزەکانی سەلاحەددین، ڕاگرتنی هاوسەنگی نێوان شەڕکەرە موسڵمانەکان بوو، نەمان بیستوە لەو سەردەمەدا هیچ پێکدادانێك لە نێوان لایەنگرە تورك و کوردەکاندا ڕووی دابێت))[٦٣٦].

سەبارەت بە سەروکاری ئەیوبییەکان بەنیشتمانەکەیانەوە، دەڵێت: ((ڕاستی هەرەگرنگ ئەوەیە کە ئەیوبییەکان ئارەزوویانە پێ بخەنە سەر بانی

---

(631) Ibid.
(632) Ibid، p.136.
(633) Ibid، pp. 139-146.
(634) Ibid، p. 137.
(635) Ibid، p. 138.
(636) Studies، p. 138.

ئەرمینیا ))[٦٣٧] ، بۆ سەلماندنی ئەوەش، کۆششی سەلاحەددین بۆ دەست گرتن بەسەر شاری ئەخەلات دەکاتە بەڵگە، هەروەها هەوڵی ئەیوبییەکان بۆ نزیک بوونەوە ((بەژن و ژنخوازی لەگەڵ ئەو بنەماڵە کورد و ئەرمەنی و جۆرجیانەی کەلە ئانی فەرمانڕەوابوون))[٦٣٨]، هەروەها ئاماژە بە جموجۆڵی ((مەلیك ئەشرەف[٦٣٩] کە توانی لە ڕووباری ڕەس[٦٤٠] بپەڕێتەوە و بگاتە نزیك زێدی ئەیوب و شێرکۆ))[٦٤١] دەکات لە پاشکۆیەکی تایبەتیشدا باسی هەوڵە یەك لە دوای یەکەی ئەیوبییەکان دەکات بۆ دەست گرتن بەسەر ڕۆژهەلاتدا[٦٤٢].
مینۆرسکی زۆر بە درێژی لەو لایەنە دواوە ، چونکە بیروڕای وابووە ئەمەیان وێنەیەکی تەواو لەبارەی بنەماڵەکەوە دەکێشێت و ئەو لەوبڕوایەدا بووە کە ئەو ڕاستی و تایبەتمەندییانە نەزانراو بوونە[٦٤٣].

مینۆرسکی کتێبەکەی بەچەندین پاشکۆ دوایی هێناوە ، لە پاشکۆی یەکەمدا تیشك دەخاتە سەر نەخشی کورد لە سوپای سەلاحەددین — هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێ کرد ، لەگەڵ ئەوەش دەڵێت ئەوەی ئەو دەیکات بەرچاوخستنێکی کورتە وەك پێشنیارێك بۆ پتر لێکۆڵینەوە لەدوا ڕۆژدا، دوای ئەوەی لەو بارەیەوە قسەی ئیبن شەداد (لە٦٣٢ك/١٢٣٤ز مردووە) وەردەگرێت، دەڵێت کورد شوێنێکی بەرزیان لەریزی سەرکردەکانی سەلاحەددیندا هەبووە[٦٤٤].

---

(637) Ibid.
(638) Ibid.

(٦٣٩) مەلیك ئەشرەف موسا کوڕی مەلیك عادل (لە٦٣٥ك/١٢٣٧ز مردووە). بۆ زانیاری پتر لەبارەیەوە بڕوانە: کرفان محمد أحمد أمیدی، الملك الاشرف موسی بن الملك العادل الایوبي دوره وأثره في الدولة الأیوبیة ، ر.م.غ ، الاداب جامعة صلاح الدین / أربیل :١٩٩٩) ص ص١٧–٤٠ .

(٦٤٠) بڕوانە: نەخشەکە لە پاشکۆ .

(641) Studies، p. 138.
(642) Ibid، pp. 146-156.
(643) Ibid، p. 139.
(644) Ibid.

لەپاشكۆی دووەمیشدا مینۆرسكی دێتەوە سەر قسەكردن لەبارەی سەروكاری نێوان ئەیوبییەكان و ئازەربایجان و ئەرمینیا ، ئەو كۆششی بەردەوامی ئەیوبییەكان بۆ خستنەژێر ركێفی ناوچەكانی جەزیرە بەجۆرێك لە ئارەزووی گەڕانەوەیان بۆ زێدەكەیان دەبینیٚ و پیٚ گیركردنیان لەو سەرزەمینانەدا كە ڕۆژیٚ لە ڕۆژان لێیەوە هاتوون [٦٤٥] .

هەروەها پاشكۆیەكی دیكەشی [٦٤٦] لەبارەی بنەماڵەی ڕەوادی [٦٤٧] سازكردووە، كە باپیرانی سەلاحەددین بوونە و ئەو بنەماڵە كوردەن كە لە (٣٤٥-٤٦٣ك/٩٥٦-١٠٧٠((١٠٧١))ز ) فەرمانڕەوای ئازەربایجانیان كردووە، زۆر بە كورتیش ئاماژە بە میرەكانی ئەو بنەماڵەیەو ئەو ڕووداوانەی كە لەسەردەمەكانیاندا قەوماون دەكات، بە وەرگرتن لە سەرچاوە ئیسلامییەكان، بەبیٚ هیچ لێدوان و شەن و كەو كردنێك .

**هـ . بنەماڵەی ئەحمەدیلییە [٦٤٨] (٥٠٥-٦٢٤/١١١١-١٢٢٦ز)**

سەرەتای بایەخدانی مینۆرسكی بەو بنەماڵەیە لە دووتۆویی ئەو نووسراوانە دەردەكەوێت كە لە ساڵی (١٩٢٧) لەبارەی كوردی نووسیوە ، لەوێدا ناوی دامەزرێنەری ئەو بنەماڵەیە دەهێنێت و دەڵێت ((والی مەراغە لە ساڵی ٥٠٤ك/١١١٠ز ) ئەحمەدیلی كوڕی هسودانەو كوردی ڕەوادییە)) [٦٤٩]

---

(645) Ibid، pp. 146-147.

(٦٤٦) بەر لەسازكردنی ئەو پاشكۆیە و لە گەلاڵەنامەیەكی بچووكدا مینۆرسكی ڕەخنە لەڕای كبی ڕۆژهەلاتناسی بەریتانیی دەگرێت لەبارەی ئیبن ئەثیر و وردو باریكی لەو نووسینانەی كە لە كتێبە بەناوبانگەكەی ( الكامل في التأريخ) دا لەبارەی هەندیٚ هەڵوێستی سەلاحەددینی ئەیوبی سەركردە تۆماری كردووە. بڕوانە: Studies، pp.156-157 لێرەدا ئەوە بۆ كبی ڕۆژهەلاتناس جێدەهێڵین كە بەپەرچی قسە و ڕەخنەی مینۆرسكی دەداتەوە، بڕوانە: بەشی سێیەم .

(647) Studies، pp. 167-169.

(٦٤٨) بنەماڵەی ئەحمەدیلییە: دامەزرێنەری ئەحمەدیلی كوڕی ئیبراهیمە وئەو بنەماڵە فەرمانڕەوایە لە ئازەربایجان سەریان هەڵدا و پایتەختیان شاری مەراغە بووە . بۆ زانیاری پتر بڕوانە : النقشبندی، أذربایجان .ص ص١٧٩-٢٣١.

(649) Kurd، p.1139.

که دێته سەر مێژووی شاری مەراغە لە ساڵی (١٩٣٤) تەوەرێك بۆ لێکۆڵینەوە لەو بنەماڵەیە هەر لە ساڵی (٥٠٥ك/١١١١ز)یەوە تەرخان دەکات ، بە ئەحمەدیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی وهسودانی کوردی ڕەوادی دەست پێ دەکات و لە نەخشی ئەحمەدیل و بنەماڵەکەی لە دژی خاچپەرستان لە ساڵی (٥٠٥ك/١١١١ز) و چالاکییەکانی دیکەی دەدوێت تا لە ساڵی (٥١٠ك/١١١٦ز) غافلکوژ دەکرێت، پاشان باسی یەکەیەکەی ئەوانە دەکات، کە لە دوای ئەحمەدیلەوە هاتوون لەگەڵ ئەو ڕووداوە گرنگانەی کە لە سەردەمی فەرمانڕەواکانیان قەوماوە تاکو هاتنی مەغۆلەکان و کۆتایی هاتنیان لە ساڵی (٦٢٤ك/١٢٢٦ز)[٦٥٠] و نەمانی فەرمانڕەوایەتیان.

جێی وەبیرهێنانەوەیە کە مینۆرسکی دان بەوە دەنێت کە زانیارییەکی زۆری لەبارەی ئەو بنەماڵەیەوە نییە[٦٥١].

لە دواجاریشدا باسی ئەو بنەماڵەیەی بەوتارێکی سەربەخۆ کردووە و لەچاپی دووەمی ئینسکلوپیدیای ئیسلامدا لە ساڵی (١٩٥٦)[٦٥٢] بڵاوی کردۆتەوە، بەڵام ئەوەیانی لەو وتارەی ڕاگوازتووە کە لەسەر شاری مەراغەی نووسیبوو، کە[٦٥٣] پێشتر ناوی هات،. بەبێ هیچ زانیارییەك، تەنانەت کورت تریشە.

### و- بنەماڵەی عەنازی[٦٥٤] (٣٨١-٥١١ك/٩٩١-١١١٧ز)

یەکەمین جار مینۆرسکی لە بابەتی کورد کە ساڵی (١٩٢٧) نووسیوویەتی باسی ئەو بنەماڵەیە دەکات و دەڵێت : (( دوای نەمانی بنەماڵەی حەسنوەییە لە

---

(650) Maragha، EI[1]،Vol.V،pp. 263-265.

(٦٥١) ئەو قسەیە بۆیە دەکات، چونکە وەکو هەردوو بنەماڵەی شەدادی و ئەیوبی بەوردی و تێروتەسەلی لەو بنەماڵەیە نەدواوە.

(652) Ahmadili، EI[2]. Vol. I، pp. 300-301.

(٦٥٣) بڕوانە: نەخشەکە لە پاشکۆ .

(٦٥٤) بنەماڵەی عەنازی: ئەو بنەماڵەیە میرنشینێکیان لە ناوچەی حەلوان دامەزراند ، کە بنچینەیان لە هۆزی شادنجانی کورد بوون . بڕوانە: حسام الدين علي غالب النقشبندي ، الكرد في الدينور و شهرزور خلال القرنين الرابع و الخامس الهجريين ، ر.م.غ.الاداب ( جامعة بغداد : ١٩٧٥) ، ص ص١٩٥-٢٥٠ .

هەرێمی چیا دەسەلآت کەوتە دەست بەنی عەناز، هەر ئەو بنەماڵەیە بە بنەماڵەی ئەبی شوکیش ناسراون... وادیارە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی ئەو بنەماڵەیە ئەبا فەتح محەمەد کوڕی عەناز بێت کە لە ٣٨٠-٤٠١ك فەرمانڕەوایەتی کردووە))(٦٥٥).

هەر لەهەمان وتاردا سنووری دەسەلآتی ئەو بنەماڵەیە بەشارەزوور و کرماشان و بیلوار و سامغان دیار دەکات...، هەروەها ئاماژە بە سوپاکەش دەکات کە لە کوردی شادنجانی و دەیلەم پێك هاتبوون. لەلایەکی دیکەشەوە ناوی میرەکانی ئەو بنەماڵەیە لە دوای ئەبی شۆك دەهێنێت تا لەساڵی (٥١١ك/١١١٧ز) سەلجوقییەکان میرنشینەکەیان داگیر دەکەن(٦٥٦).

جارێکی دیکەش دێتەوە سەر مێژووی ئەو بنەماڵەیە و لە ساڵی (١٩٥٦) وتارێکی سەربەخۆ لەچاپی دووەمی ئینسکلوپیدیای ئیسلامدا بلآو دەکاتەوە، بە پێناسەیەك دەست پێدەکات و دەڵێت: (( بنەماڵەیەکی فەرمانڕەوان... لە ناوچەی سنووری نێوان عێراق و ئێران کە ڕەنگدانەوەیەکی سەردەمی ناوبڕی نێوان عەرەب و تورکە ))(٦٥٧).

پاشان جەخت لەسەر کوردبوونی بنەماڵەکە دەکات و دەڵێت: (( لەبەر ئەوەی پەیدابوونی بەنی عەناز لەسەر کوردی شادنجانی وەستاوە، بۆیە بە بنەماڵەیەکی فەرمانڕەوای کورد دادەنرێت، ئەگەرچی ناووناوونیشانی زۆربەی فەرمانڕەواکانیان عەرەبیین))(٦٥٨) ، هەروەها ئاماژە بە لایەنی کۆمەلآیەتی ئەو بنەماڵەیە دەکات و دەڵێت : (( نموونەیەکن لەسەر شێوازی خێڵەساتن ـ کۆچەر ئاسان ـ))(٦٥٩) بەلآم لەبەر ئەوەی بنەماڵەکە چەندین لقی رکابەریان هەن، ئەو دەور و شوێنی دەسەلآتیان دیارناکات(٦٦٠).

---

(655) Kurd. p1139.
(656) Ibid.
(657) Annazids. EI$^2$. Vol. I.p.512.
(658) Ibid.
(659) Ibid.
(660) Ibid.

مینۆرسکی مێژووی بنەماڵەکەی کردۆتە دووبەش: بەر لەپەیدابوونی سەلجوقییەکان کە لەناوچەکانیان فەرمانڕەوای دەسەلأتدار بوون، بەلأم بەسەرهەڵدانی ئەلغەز وسەلجوقییەکان بارودۆخی بنەماڵەکە تێك چوو[٦٦١].

لە بەسەرکردنەوەی مێژووی بنەماڵەکەشدا ئاماژە بەیەك لەدوای یەکی میرەکان و ئەو ڕووداو و گۆڕانکارییانەی کەلەسەردەمەکانیان ڕووی داوە دەکات، بەپشت بەستنی بە سەرچاوە ئیسلامییەکان و بە تایبەتیش کتێبی (( الکامل في التأریخ))ی ئیبن ئەثیر[٦٦٢].

(661) Ibid.
(662) Ibid. pp. 512-513.

## بەشی سێیەم

### هەڵسەنگاندنێکی ڕەخنەیی لە بارەی مینۆرسکی و کارەکانی

یەکەم: نیگایەکی تێکڕایی بەسەربردەی مینۆرسکی
دووەم : شێواز و ڕێبازی
سێیەم : ئەو سەرچاوانەی ئەو پشتی پێ بەستوون
چوارەم : هەڵسەنگاندنێکی ڕەخنەیی ڕاوبۆچوونەکانی
پێنجەم : هەڵوێستی خەڵك بەرانبەر مینۆرسکی و لێکۆڵینەوەکانی

## بەشی سێیەم

# هەڵسەنگاندنێکی ڕەخنەیی لەبارەی مینۆرسکی و کارەکانی

**یەکەم: نیگایەکی تێکڕایی بەسەربردەی مینۆرسکی :**

دوای خستنەڕووی کارواتی ڕۆژهەڵاتناسی و دابەشکردنی ڕۆژهەڵاتناسان بەپێی ڕووکارە جیاجیاکان و دوای ئەوەی تیشك خرایە سەر هەوارەکانی ژیانی مینۆرسکی ڕۆژهەڵاتناس و چالاکییە جۆراوجۆرەکانی وَ نووسینەکانی لە بواری جیاجیادا، دەپرسین ئاخۆ پایە و شوێنی مینۆرسکی لەو کاروانەدا لە کوێیە؟ کەسایەتی ئەو وەك ڕۆژهەڵاتناس چۆن بووە؟ تێڕوانینی زانستیانە لەسەر نووسراوەکانی چۆنە، کە بۆتە پاژێکی گرنگی کەلەپووری ڕۆژهەڵاتناسی؟

لەبەسەرکردنەوەی هەوارەکانی ژیان و جموجۆڵەکانی چ بەئامادەبوون لە کۆنگرە و کۆڕ و وانە گووتنەوە وبڵاوکرانەوەی تۆژینەوە و بڵاوکراوەکان و تەنانەت کۆڕی برادەرەکانی، دەتوانین بڵێین کەوا مینۆرسکی بەدوای ڕووکاری مژدەدەری (التبشیر. میسینێر) نەکەوتووە بە بەڵگەی ئەوەی بەکردەوە(٦٦٣) بەشداری لە گۆڤاری ناوداری مژدەدەری لە جیهانی ئیسلامدا نەکردووە، ئەگەرچی بایەخی بە تایفە ئایینیە ڕۆژهەڵاتییەکانی وەك ئەهلی هەق داوە، کە ئەو گۆڤارە مژدەدەرییە بایەخی پێ دەدان.(٦٦٤)

مینۆرسکی نزیکەی بیست ساڵی وەك دبلوماسییەك بە ئەرك و دڵسۆزی بۆ وڵاتەکەی کرد و پایەی بەرزی بەلێهاتوویی خۆی گرتۆتە دەست؛ بە بەردەوام ڕاپۆرتی لەسەر ئەو شوێنانەی کاری تێدا دەکردن ، دەنووسی، بەبێ ئەوەی لەو ڕاستیانەی هەستی پێ کردووە خۆببوێرێ یان خۆی لێ نەبان بکات، باشترین

---

(٦٦٣) دەڵێم (بەکردەوە)، چونکە لەو گۆڤارەدا یەك بەدواداچوونی تێدا بڵاوکراوەتەوە کە ئەمەیە:
Review of Levys The sociology of Islam،1932،Vol.XXII،P.416.

(664) Saeed Khan The sect of Ahl-1- Haqq، pp.31-42; F.M stead، the Ali ilahis Sect in Persia، 1932، Vol.xxII، pp.184-189; Charales R. Pittman ، The Final world of the Ahl-1-Haqq،1937.Vol.XXVII، pp.147-163.

گەواهیش تێگەیشتنی لە کێشەی کورد ، دوای ئەوەی لەحاڵ و باری گەلی کورد گەیشت و لە ڕاستی و دروستی گەیشت ، ((لەراپۆرتەکانیدا زۆر بەپەرۆشەوە داکۆکی لەوە دەکرد ولاتەکەی سیاسەتی نزیك بوونەوە لەهەمبەر کورد بگرێتە بەر و بەتوندی دژی بەکارهێنانی هێز بووە لە دژی کوردە نەیارەکان . واتە لە سیاسەتی ئەو ڕۆژەی رووسیا بۆ ئەوەی رووسیا ئەو گەلە بەروومەتە بەلای خۆیدا ڕابکێشێ ، لە پێناو ئەمە پێشنیاری کرد بایەخ بە هەستی ڕزگاریخوازی و بەڵێن دان لە پێناو جێبەجێ کردنی خودموختاری بۆیان))[٦٦٥] بەو جۆرە لە ڕاپۆرت نووسین بەردەوام بوو[٦٦٦] تا ((رووسیا پێشوازی لە پێشنیارەکەی کرد و جێبەجێی کرد))[٦٦٧] .

سەبارەت بە کێشەی کورد ((مینۆرسکی دەڵێت: ((دادپەروەری لە لایەنگیری کردنی خەباتیان دایە... بۆ ئەوەی زمان و نەتەوەکەیان بپارێزرێن))[٦٦٨] قسەکانی بە پێشبینییەکی ڕاستگۆیانە بەکۆتا دێنێت کە لە سەرەتای سەدەی بیستەم تۆماری کردووە و دەڵێت: ((ئەو کێشە گرنگترین کێشەیەکە لە دوارۆژدا ڕووبەڕووی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دەبێتەوە ))[٦٦٩]

لە لایەکی دیکەوە سەردەمی دبلۆماسیەتی مینۆرسکی بواری بۆ ڕەخساند لە نزیکەوە سەروساخت بە گەلانی ڕۆژهەلاتەوە پەیدا بکات و پێوەندی توندوتۆڵ لەگەڵ ڕۆڵە ڕۆشنبیر و دیارەکانیان دابمەزرێنێ . هەموو ئەو زانیاری و ئەزمونەی کۆی کردبووەوە و ئەو دەستنووسانەی بەدەستی هێنابوون لە سەردەمی ژیانی نووسینی ئەکادیمیانەیدا بەکاری هێناون .

---

(٦٦٥) لە : کمال مظهر، کردستان ڤ سنوات ، ص١٥٨ ؛ وەرگێراوە .

(٦٦٦) لازاریفی ڕۆژهەلاتناس ئەو ڕاپۆرتانەی مینۆرسکی لە لێکۆڵینەوەیەکدا بەناوی (کێشەی کورد) بەکارهێناوە. بڕوانە :لا ٢٦٧، ٢٨٣، ٢٨٤، ٢٩٤، ٢٩٩، ٣٠٢، ٣٠٣.

(٦٦٧) کمال مظهر، کردستان ڤ سنوات، ص١٧٢ .

(٦٦٨) الأکراد ، ص٨٠ .

(٦٦٩) نفسه ؛ ص٨١ .

ڕاسته مینۆرسکی به سیاسەت دەستی پێ کرد و تێیدا تێهەڵات ، بەڵام ئەو پیاوە نموونەی پیاوی سیاسەت نەبوو، بەقەد ئەوەی کە خۆی بە تەواوی لە بواری توژینەوە و لێکۆڵینەوەی ئەکادیمیانەدا بینییەوە ، بێ پاشگەزبوونەوەش پابەندی بوو . لەگەڵ ئەوەش نەیتوانی خۆی لە خلتەی سیاسەت ڕزگار بکات و لەگەڵ مکوڕی لەسەر وازهێنان لە سیاسەتدا ، کەچی گەلێ نووسراوی سەبارەت بەو مەسەلە گەرم و گوڕانەیە کە سیاسەتی نێودەوڵەتی ئەو ڕۆژە هێنابوونیە ئاراوە لە فەرەنسا، بلاوبوونەوە .[٦٧٠]

هەر لەو ڕۆژگارەی کە مینۆرسکی لە فەرەنسا بووە، دەستی کرد بە پێوەندی گرتن بە دەزگا ئەکادیمییەکان، هەر لەو سەردەمەشدا بەشداری لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامی کرد و نزیکەی سەد و چوار وتاری ئەکادیمی تا دوارۆژەکانی ژیانی نووسیوە. هەروەها بایەخی بە نووسینی لێکۆڵینەوە و پێداچوونەوە لە گۆڤاری خوێندنگای لێکۆڵینەوەی ئەکادیمیی یان پێداچوونەوەی نووسیوە. ئەمە سەرباری ئەو لێکۆڵینەوە بەنرخانەی کە بەشێوەی کتێب بلاوبوونەتەوە. ئالێرەدا دەتوانین بلێین هەرچی لە بەریتانیادا بلاوی کردۆتەوە بەلای ڕۆژهەلاتناسی ئەکادیمی دابووە. جێی سەرنجە کەوا بڕوانامەی ئەکادیمی بەرزی نەبووە، بەلام نازناوی پرۆفیسۆری بە لێهاتوویی خۆی و نووسینی ئەو لێکۆڵینەوە ئەکادیمییە بەنرخانە بەدەست هێنا، تا ئەوەی بەیەکێ لە زانایانی بەرز دانرا.[٦٧١]

لایەنێکی گرنگی ژیانی مینۆرسکی هەیە، پێویستە لە ئاستی هەڵوەستەیەك بکەین، ئەویش دەرخستنی سەروساختی ئەو ڕۆژهەلاتناسە گەورەیەیە بەو ولاتانەی کەلێی ژیاوە یان پێوەندی توند و تۆڵی پێیانەوە هەبوو، هەروەك ئاشکرایەو لەبەسەرکردنەوەی سەربردەی ژیانیشی دا دیارە کە بەو ئایدۆلۆژیانە ڕازی نەبووە کە ولاتەکەی لەدوای ساڵی (١٩١٧) گرتیە بەر، بۆیە بڕوای بەو

---

(٦٧٠) بڕوانە: بەشی یەکەم .

(٦٧١) تقی زاده ، در رثای، لا ٧٧ " مینوی یاد برفیسور لا ١٥ ؛ Lang, The obituary, p. 699.

لەدڵ دەرنەچوو، ڕازی نەبوو لە بەردەمیدا بە خراپ ناوی وڵاتەکەی بهێنرێت[٦٧٢]، هەروەها سەروسۆراخی کاروانی ڕۆژهەڵاتناسی لەوێشدا دەکرد و تەنانەت سەروکاری لەگەڵ ڕۆژهەڵاتناسەکانیشیانەوە هەبوو[٦٧٣]، هەر بۆیە لەساڵی (١٩٦٠) بانگهێشتی مۆسکۆ کرا .

جێی سەرنجە کە مینۆرسکی زۆر پەرۆشی دیتنی وڵاتەکەی بوو، کە ماوەی چل ساڵ پتر بوو لێی دوورکەوتبۆوە، بە ئاواتەوە بوو بۆ جارێکیش بێت بەرلەمردنی، وڵاتەکەی ببینێت[٦٧٤] . ئەوە بوو ئەو هەلەی بۆ ڕەخسا، کە لە مێژبوو چاوەڕوانی دەکرد، بەلام پزشکی هێناوە، چونکە دەستی کورت بوو[٦٧٥] . ئەوە بوو زانکۆی مۆسکۆ لەگەڵ هاوسەرەکەی میوانداری کرد، کەشتییەکی تایبەت بۆ ئەو مەبەستە لە مۆسکۆوە هات و هەردووکیانی هەڵگرت[٦٧٦] . دەکرێ ئەوە بکەینە بەڵگەی پاکی و ڕەوتی ئەکادیمیانەی ئەو ڕۆژهەڵاتناسە لێهاتووە .

ئەو ماوەیەی لە فەرەنساش مایەوە سەردەمێکی دوودڵی و نائارامی بوو بۆ مینۆرسکی[٦٧٧] ، بۆ مەبەستی ئەکادیمی[٦٧٨] چووە بەریتانیا ، ئەوێی کردە جێگای نیشتەجێ بوون . بەلام هەرچەندە سی ساڵ پتری لێ مایەوە کەچی ڕەگەزنامەی بەریتانی وەرنەگرت، هەروەك هاوڕێیەکی[٦٧٩] زۆر نزیکی گەواهی

---

(٦٧٢) بۆ درێژەی بڕوانە لافرینکو، مراسلات، ص ص١٤٥–١٥٧ ؛ مینوی ؛ هەمان .

(٦٧٣) نامەی مینۆرسکی بۆ تەقی زادە لە ٨ی مایسی ١٩٥٣.

(٦٧٤) نامەی مینۆرسکی بۆ تەقی زادە لە ٨ی مایس ١٩٦٠.

(٦٧٥) نامەی مینۆرسکی بۆ جهانبهانی ١٩٦١ .

(٦٧٦) نامەی مینۆرسکی بۆ تەقی زادە لە ٨ی ئابی ١٩٦٠ ؛ نامەی جیهانبهانی ساڵی ١٩٦١ .

(٦٧٧) مینورسکی ، الاکراد ، مقدمة المترجم ، ص٨ .

(٦٧٨) بڕوانە : بەشی یەکەم .

(٦٧٩) سەید محەمەد عەلی جەمالیزادەیە (١٨٩١–١٩٩٧) لە خێزانێکی ئاینی لە ئەسفەهان لەدایك بووە و بڕوانامەی مافی لە سویسرا لە ساڵی ١٩١٣وەرگرتووە ، لە نووسەرە پێشرەوە هاوچەرخەکانە لە ئێران . بڕوانە :علی دهباش، سید محمد علی جمالزادە ، وەرگێڕانی ڕەشید فەهمی ، وتارەکە لە گۆڤاری ڕامان ، (هەولێر : ٢٠٠٠)، ژ٤٥، ل١٥٤–١٥٥ ، بلاوبۆتەوە .

ئەوە دەدات[٦٨٠]. بەلاَم نەجیب عەقیقی پێچەوانەی ئەمەی لە ئینسکلۆپیدیایەکەی[٦٨١] نووسیوە، وا دیارە عەقیقی لەو قسانەی لەمەڕ مینۆرسکی نووسیوویەتی ورد نەبووە، چونکە دەڵێت: (( ئەو لە زانکۆی پەترسبورگ دەرچووە ))[٦٨٢] بە پێچەوانەی ئەوەی کە لە هەموو سەرچاوە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلاَتییەکانەوە نووسراوە .

ئاشکرایە مینۆرسکی لە زانکۆی مۆسکۆ دەرچووە و لە ئامۆژگای لازاریف لە مۆسکۆ خوێندنی زمانە ڕۆژهەلاَتییەکانی تەواو کردووە .

ئەو پرسیارەی کە لێرەدا خۆی قیت دەکاتەوە ئەمەیە، بۆچی مینۆرسکی نەگەڕایەوە ولاَتەکەی وەك ئەکادیمییەك لە دەزگا ئەکادیمییە ڕۆژهەلاَتناسییەکانیدا کار بکات ؟!

وەلاَمەکەی ئەوەیە ئەو لەگەڵ شۆڕش نەبوو، وەك کارمەندێکی سیاسی لە بالیۆزخانەی رووسیا لایەنی شۆڕشی نەگرت و هەر لەگەڵ ئەوانە مایەوە کە لە دژی شۆڕش کاریان دەکرد چ لە تاران یان لە پاریس[٦٨٣]. بە گەڕانەوەی بۆ ولاَتەکەشی ئەوا کۆت دەخرا ملی چالاکییە تۆژینەوەکانی، ئەویش لەبەر ملهوڕی و زاڵی ئایدۆلۆژیا بەسەر هەموو ڕووخسارێکی ژیانی سیاسی و هزری و بواری پێوەندی کردنی بە دام و دەزگاکانی دەرەوەی ولاَتەکەی لێ دەگیرا ، سەرباری ئەوەش بڕوای بەوە هێنا بوو کە نووسین بە زمانی رووسی وەك ڕۆژهەلاَتناسەکانی دیکە لە چالاکی ڕۆژهەلاَتناسی ڕۆژئاوای دا دەبڕی ، چونکە بۆ سەروساخت پەیداکردن لەگەڵ ڕۆژهەلاَتناسی ڕۆژئاوا دەبوا زمانە ئەوروپاییەکانی وەك فەرەنسی و ئینگلیزی بەکار بهێنێت .

---

(٦٨٠) سيد محمد جمال زاده ، نامه جمالزاده برفيسور ولاديمير مينورسكى ، وتارەکە لە گۆڤاری (يغما)،(تهران ، ١٣٤٥ هـ.ش )، ج١٩ ، ص١٠٦ .

(٦٨١) المستشرقون : ج٣ ، ص٥٢٧ .

(٦٨٢) نفسه .

(٦٨٣) مينورسكي ، الاكراد ، مقدمة المترجم ، ص ٥-٦ .

دەکرێ تێبینی ئەوە بکەین کە پێوەندی گەرمی بە ئێران و ڕۆڵەکانییەوە، پێوەندی زانایەکی دڵسۆزی ئەورووپایی بوو بۆ کەلەپووری دەوڵەمەندی ئێران، کە زۆری پێ داخبار بوو . ئێرانییەکانیش ئەو هەستە ڕاستگۆیانەیان لەو پیاوە بەدی دەکرد، کە لە ساڵانێکی ناسکی مێژووی وڵاتەکەیاندا وەك فەرمانبەرێکی سیاسی لەوڵاتەکەیانا بەسەربرد، دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت کە ئەو ڕۆژهەڵاتناسە تا چەند ئەکادیمییە، هەوڵیاندا لێی نزیك ببنەوە[٦٨٤]، وەك پسپۆڕێکی بواری ئێرانناسیش مینۆرسکی زۆر زۆری خۆ لەو بوارە ماندوو کردووە. لە نامەیەکدا بۆ جهانبهانی هاوڕێی یەکەوڕاست دەڵێت: ((ئەوە پەنجاو دووساڵە هیچ ڕۆژێکم نەگوزەراندووە ئەگەر لەبارەی ئێران نەخوێنمەوە یان بیری لێ نەکەمەوە، یاخود لەسەری نەنووسم...تۆش دەزانی وڵاتی دووەمم کوێیە))[٦٨٥].

مینۆرسکی بەشێکی کارو ئەرکی بۆ کوردناسی تەرخان کردووە وەك گەلێکی ئێرانی ، لەبەر ئەوەی کوردستانی ئێرانیش ناوچەیەکی گرنگی ئێرانە، ناوە ناوە لێکۆڵینەوەیەکی لە بواری کوردناسی بڵاو دەکردەوە ، یان سەروسۆڕاخی کاری خەڵکی دیکەی لەبارەی گەلی کوردەوە دەکرد[٦٨٦].

**دووەم : شێواز و ڕێبازی**

مینۆرسکی تۆژینەوەکانی بەرووسی و فەرەنسی و ئینگلیزی نووسیوە . لە ڕۆژگاری رووسیادا هەموو نووسینەکانی بەرووسی نووسیوە. بەڵام لە فەرەنسا لێکۆڵینەوەکانی بە فەرەنسی و بەڕووسی بڵاودەکردەوە. دوای ئەوەی چووە بەریتانیاش هەموو نووسینەکانی بە ئینگلیزی بڵاوکردنەوە، جێی سەرنجە ئەگەرچی لە هەردوو زمانی فارسی و تورکیدا پسپۆڕ بوو ، کەچی تەنانەت یەك

---

(٦٨٤) مینوی ، بیاد مینورسکی ، ص١١ .

(٦٨٥) نامەی مینۆرسکی بۆ تەقی زادە لە ٢٥ی شوباتی ١٩٥٢ .

(686) Review of Hamiltons Road through Kurdistan، BSOS، 1937، Vol. IX،p.251; Safrastian،Kurd and Kuristan . Bo، 1950،Vol.VII،pp.50-51.

لێکۆڵینەوەشی پێیان ،بڵاونەکردەوە ، ڕەنگە لەبەر ئەوەبووبی کە کاری ئەوپەڕ دواندنی ڕۆشنبیری ڕۆژئاوایە .

زۆربەی نووسینەکانی لە وەرزنامە ئەوروپاییەکاندا بڵاو دەکردەوە و هەندێ لە لێکۆڵینەوە باشەکانیشی بە شێوەی کتێب بڵاوکردنەوە و ژمارەی وتارەکانی، بەوانەشەوە کە لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامی نووسیون، گەیشتە سێ سەد وتار، بەڵام لەگەڵ ئەوەش ڕێبازی کورتبڕی گرتبووە بەر ، هەروەك مینۆرسکی خۆی دەڵێت: ((هەتا پێم بکرێ ئەمن بە کورتی دەنووسم، دەستەواژەکانم پێویستیان بە وردەکاری تەواو هەیە ))[٦٨٧] . لەگەڵ ئەوەش کورتەی نووسینەکانی لە ڕوونی و باشی ڕیك خستن بێبەش نەبوون، تەنانەت ڕێبازەکەشی سەرنجی خەڵکانی دیکەی ڕاکێشابوو[٦٨٨].

لە لایەکی دیکەوە مینۆرسکی دەستێکی باڵای لە وەرگێڕاندا هەبوو، هەرچەندە ئەو بڕوای وابوو کە (( وەرگێڕان کارێکی گرانە، تەنانەت ئەگەر لە فەرەنسییەوە بۆ ئینگلیزیش بێت ، ئەی کەواتە وەرگێڕان لە نێوان فارسی و ئینگلیزیدا چۆنە ، واباشە وەرگێڕ و نووسەر سەروساختێکیان بەیەکەوە هەبێت))[٦٨٩] ،بۆهەر لەبەر ئەوە گلەیی لەوانە دەکرد نووسینەکانیان بێ ئاگاداری ئەو وەردەگێڕا[٦٩٠] . ئەویش لەبەر ئەوەی نووسینەکانی کورتبڕبوون، کە وەردەگێڕدرا و دەخرایە بەرچاوی خوێنەرانی دیکە پێویستی بە لێدوان و زێدەکردن هەبوو .

مینۆرسکی بابەتی نەدەجوویەوە، بەڵکو هەمیشە لە بابەتی لەبیرکراو و تۆزلێنیشتوو دەگەڕا، بۆیە هەموو هەوڵی بۆ ساخکردنەوەی دەستنووسی دەگمەن و ئەو بابەتانەی بەسەر دەکردەوە کە باش لێی نەکۆڵدرابۆوە، ئەوەی

---

(٦٨٧) نامەی مینۆرسکی بۆ ئەفشار لە ٢٤ی تەموزی ١٩٥٦ .

(٦٨٨) محمد أمين زكي ؛ خلاصة تأريخ الكرد و كردستان من اقدم العصور التأريخية الى الآن، ترجمة: محمد علي عوني، (مصر ١٩٣٩) ؛ پێشەکی .

(٦٨٩) نامەی مینۆرسکی بۆ ئەفشار لە ٥ی کانونی دووەمی ١٩٥٧ .

(٦٩٠) نامەی مینۆرسکی بۆ تەقی زادە لە ٤ی مارسی ١٩٥٤ .

ئەوەش دەسەلمێنێ توژینەوە بەرووەمەتەکانیەتی لەبارەی قەفقاز و کورد و تورك و فارس.

خەسڵەتی دیکەی ئەکادیمیانەی تایبەتی مینۆرسکی ئەوە بوو ئەو هەر رای خۆی پێ پەسەند نەبوو، زۆرجار ڕەتی دەکردەوە کە ئەحکامی کۆتایی بەدەست هێناوە؛ بواری دەهێشتەوە بۆ ئەو کەسەی دوای ئەودێت بۆ تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی پتر .

بە ئاوەزی زانایانە لە لێکۆڵینەوە و ماندووبوونی خەڵکانی دیکەی دەڕوانی. کە نووسراوی خەڵکانی دیکەی سەروبەر دەکرد، ڕەخنەکارێکی ورد بوو، هەروەك لەخستنەڕووی کتێبەکەی سبولری ڕۆژهەلاتناسی ئەڵماندا سەبارەت بە ((ئێران لە چوار سەدەی سەرەتای سەردەمی ئیسلامی ))[٦٩١] دەردەکەوێت . لەبەر (( وردەکاری و سووربوونی لەتۆژینەوە و توندی لە ڕەخنەگرتن لە تۆژینەوەکان ))دا[٦٩٢]، عەبدولعەزیز دوری دەڵێت، داوام لە مینۆرسکی کرد سەرپەرشتی نامەکەم بکات .

**سێیەم : ئەو سەرچاوانەی مینۆرسکی پشتی پێ بەستوون :**

ئەوەی جێی سەرنجە بۆ تۆژەر لە نووسراوەکانی مینۆرسکی ئەوەیە کە هیچ لێکۆڵینەوە و وتار و کتێبێکی بێ بەکارهێنانی سەرچاوەی جۆراو جۆر بلاو نەکردۆتەوە. لە ئاکامی ئاگاداری لە دوازدە زمان – جگە لە زمانی زگماکی – فەرەنسی، ئینگلیزی، ئەڵمانی، ئیتاڵی، لاتینی، یۆنانی، جۆرجی، بیزەنتی، فارسی، تورکی[٦٩٣]، کوردی[٦٩٤]، بواری بۆ ڕەخسا ژمارەیەکی یەکجار زۆر

---

(691) Minorsky، Review of spulers Iran in fruhislamischer zeit، JRAS. 1953، Parts 3-4، pp.161-163.

(٦٩٢) نامەیەکی تایبەتی بەڕێز عەبدولعەزیز دوری بۆ تۆژەر .

(٦٩٣) مینوی ؛ یاد برفیسور ، ل١٥ .

(٦٩٤) جێی سەرنجە کە بۆی نەلوا زمانەکە بزانی کە توێژینەوەکانی پێ بنووسێ و تەنانەت نامەکانیشی بۆ هاوڕێ کوردەکانی بە فارسی بوون، ئەو برگەیەی بۆ تۆفیق وهبیشی نووسیبوو؛ دەستەواژەکانی تێك ناکەنەوە .

سەرچاوەی سەرەتایی بەکاربهێنێت، جگە لەو لێکۆڵینەوە تازانەی کە بۆ زمانە ئەوروپاییەکان وەرگێڕدراون و زۆر بەوردی لە نووسینەکاندا بەکاری هێناون، دوور لە دووبارە کردنەو وەرگرتنی وشك . هەمیشە دەیەویست دەستنووسەکان بەکاربهێنێت .

وێرای کارە دبلۆماسییەکانی لەسەردەمی ژیانی رووسیایدا، کەچی لە نووسینەکانیدا، ژمارەیەك سەرچاوەی سەرەتایی و رۆژهەلاتناسی بەکارهێناون . ئاگای لە کتێبی شەرەفنامە[٦٩٥] هەبوو ، لە زۆربەی تۆژینەوەکانی مێژووی کوردا ئەو کتێبەی بەکاردەهێنا . هەرکە دەستی کرد بە نووسین لەبارەی مێژووی کوردەوە لە سەردەمی ئیسلامەتیدا ناچار بوو، چاو بە نووسینی ولاتناسان و مێژوونووسە موسڵمانەکاندا بخشێنێت[٦٩٦] .

کتێبی ئەو ولاتناسە بەناوبانگانەی مینۆرسکی پشتی پێ بەستوون ئەمانەن: (المسالك والممالك)ی ئیبن خردذابە (لەدەوروبەری ٣٠٠ك/٩١٣ز مردووە)، (مسالك والممالك)ی ئیستەخری (لەدوای ٣٤٠ك/٩٥١ز مردووە)،(صورة الارض)ی ئیبن حەوقەل (لە ٣٦٧ك/٩٧٧ز مردووە)، (معجم البلدان)ی یاقوت حەمەوی (٦٢٦ك/١٢٢٩ز) دەستنووسی (الابصار)ی فەزلولای عومەری (٧٤٩ك/١٣٤٨ز) .

لە کتێبە مێژووییەکانیشدا، بە پلەی یەکەم پشتی بەو دوو کتێبە (مروج الذهب) و (التنبيه والاشراف)ی مەسعودی (لە ٣٤٦ك/٩٥٦ز مردووە) و (تجارب الامم)ی مەسکەویە (لە٤٠١ك/١٠٣٠ز مردووە)، (ذيل تأريخ دمشق)ی ئیبن قەلانسی (لە ٥٥٥ك/١١٦٠ز مردووە) ، (تأريخ الفارقي) ئیبن ئەزرقی فارقی (لە ٥٧٢ك/١١٧٦ز مردووە)، بەستووە .

ئیبن ئەثیر (لە ٦٣٠ك/١٢٣٢ز مردووە) و کتێبەکەی (الكامل في التأريخ) روومەتێکی زۆریان لای هەبوو، ئەویش بەبەڵگەی بەرگری لێ کردنی لەبەرانبەر ئەو رەخنە توندەی کە کبی رۆژهەلاتناسی بەریتانیی لێی گرتبوو .

---

(٦٩٥) بڕوانە : الاكراد، ص ص٢٤-٢٥ .

(٦٩٦) بڕوانە: نووسینەکانی لە ئینسکلوپیدیای ئیسلامدا .

هەروەها پشتی بە سەرچاوە کۆن و نوێیەکانی فارسیش بەستووە، دیارترینیان هەردوو کتێبی (تأریخ گزیده) و (نزهه القلوب)ی حەمەدوڵڵای مستەوفی قەزوینی (لە ٧٥٠ك/١٣٤٩ز کۆچی دوایی کردووە) بوو. هەروەها سەرچاوە ئەرمەنی و جۆرجی و بێزەنتییەکانیشی بەسەرکردۆتەوە . چاوی بە دانراوە تازەکانیشدا خشاندووە ،وەك دانراوەکانی مێژوونووسی تەورێزی ئەحمەدی کسرەوی (لە١٩٤٥ مردووە)کە ناودارترینیان کتێبی (شهریاران گمنام)ە .

مینۆرسکی هەربەوەندە وازی نەدەهێنا، بەڵکو لە کتێبی گەڕیدەکانیش کەڵکی وەردەگرت ، دەبینن چەند ساڵێکی تەمەنی بۆ ساخکردنەوەی (سفرنامە)ی ئەبی دەلەف مەسعەر کوڕی مهلهل (لەدوای٣٨٤ك/٩٩٤ز مردووە) تەرخان کردووە . هەروەها پشتی بە کتێبی (سیاحتنامە)ی ئەولیاچەلەبیش بەستووە لە شوێنەواری گەڕیدە ئەوروپاییەکانی وەك کلافیجوی ئەسپانی و تافرنییەی فەرەنسی و هی دیکەش بەهرەمەند بووە .

هەروەها مینۆرسکی کەڵکی لە ڕۆژهەڵاتناسە سیاسییەکانی وەك راولنسن و جریکـوف[٦٩٧] و ئـەدمۆنـدزیش وەرگـرتووە.ڕاوبـۆچـوونی ڕۆژهـەڵاتناسە ئەکادیمییەکانی وەك بارتولدو ئۆسکارمان و ن.ماری جێی بڕوای بـوون . بـەڵام وێـڕای لێهاتـوویی و شـارەزایی و زانیـاری زۆری، کـەچی کـۆی لەپێـوەندە تایبەتییەکانی نەدەکردەوە بۆ ئەوەی لە تێڕوانین و شرۆڤەکانیان کەلك وەرگرێ بۆ دەوڵەمەندکردنی سەرنج و ڕێگاکانی ئەو بابەتانەی لێی دەکۆڵییەوە[٦٩٨].

لەگەڵ ئەو بەرنامەکارییەی مینۆرسکی پەیڕەوی لێ دەکرد و سەرباری پشت بەستنی بەسەرچاوەی جۆراوجۆرو ماندووبوونی زۆری بۆ نووسینی لێکۆڵینەوەی ورد، کەچی نووسینەکانی لەکەم و کورتی بێ بەش نین و قەڵەمەکەشی لە هەڵەوناتەواوی دەرباز نەبووە، لەو بابەتەی کەوا سەروکاری بە

(٦٩٧) ی.ج.جریکۆفی ڕۆژهەڵاتناسی ڕووسی، نوێنەری ڕووسیا بوو لە لیژنەی سنووری تورکیا و ئێران لە ساڵانی ١٨٤٩–١٨٥٢ز). بڕوانە : ادموندز ، کرد و ترك و عرب ،ص٣١.

(٦٩٨) نامەی مینۆرسکی بۆ تەقی زادە لە ١٠ی ئابی ١٩٢٩ .

کورد لە سەردەمی ئیسلامەتییەوە هەیە، رووی داوە و تۆژەر هەوڵی داوە بەپێی توانا لێیان بدوێ .

### چوارەم: هەڵسەنگاندنێکی رەخنەیی راوبۆچوونەکانی :

#### أ- لەبارەی هەرێم وشارە کوردییەکانەوە:

١- وا پێدەچێت مینۆرسکی ئەو سەرچاوە زۆر و جۆراوجۆرانەی نەبینیوە کە بۆ یەکەم جار زاراوەی (کوردستان)یان بەکارهێناوە، ئەو لەو بابەتەوە هەر بەتەنیا ئاماژەی بەوەی حەمەدوڵڵا مستەوفی قەزوینی (لە ٧٥٠ک/١٣٤٩ز مردووە) کردووە[٦٩٩]، ئەویش لەژێر کاریگەریی لسترنجی رۆژهەڵاتناسی بەریتانی[٧٠٠]. کەچی رایەکی بڕواپێکراو هەیە بەرپەرچی ئەو قسەیە دەداتەوە[٧٠١] ، کە یەکێ لە توژەرەوان[٧٠٢] بەکارهێنانی هەرێمی کوردستان بۆ دەوروبەری ساڵی (٦٦٠ک/١٢٦٢ز) دەباتەوە .

جێی سەرنجە وشەی (کوردستان) بەر لە مستەوفی قەزوینی لەسەرچاوەکاندا بەکار هاتووە، رەشیدەدین فەزلولڵای هەمەدانی مێژوونووس (لە ٧١٨ک/١٣١٨ز مردووە)، ناوی (کوردستان)[٧٠٣] دەهێنێت، هەروەها مارکۆپۆلۆی گەڕیدەی ئیتاڵی (٧٢٣ک/٣٢٣ز)[٧٠٤]یش ئاماژەی پێ کردووە، هەروەها مێژوونووس محەمەد شبانکارەای کە کتێبەکەی[٧٠٥] لە ساڵی

---

(٦٩٩) نزهة القلوب ، ص١١٧ و دواتر .

(٧٠٠) بلدان الخلافة ، ص ص٢٢٧–٢٢٨ .

(٧٠١) محەمەد جەمیل رۆژبەیانی، سوڵتان سەنجەری سەلجوقی – کوردستان – سلیمان ئەیوە ، وتارەکەی لە گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، (بەغدا : ١٩٨٨) ، ژ١١٨، ل٢٢–٢٦، بلاّو کردۆتەوە .

(٧٠٢) توفیق ، کردستان فی القرن الثامن الهجری ، ص١٩ .

(٧٠٣) جامع التواریخ ، ترجمة: محمد صادق نشأت ، فؤاد عبدالمعطي الصیاد، مج٢، القاهرة: (د.ت)، ص٢٦١.

(٧٠٤) رحله مارکوبولو ، ل ٤٥ .

(٧٠٥) معجم الانساب ، ص ٢٠٧ ،٢٩٩،٣١٢–٣١٤ .

(٧٣٣ك/١٣٣٢ز) نووسیوه، ناوەکەی هێناوه، هەروەها بەر لە کتێبی (نزهة القلوب ) له سەرچاوەکانی دیکەشدا ناوی هاتووه[٧٠٦].

٢- له دیاریکردنی مێژووی هەندێ ڕووداودا ئالۆزی و تێکەڵی هەیه، بۆ نموونه کە باسی هەرێمی شارەزوور دەکات به هەڵه[٧٠٧] مێژووی فەرمانڕەوای بنەماڵەی حەسنەوەیهی دیار دەکات[٧٠٨]، کە دیاره وەك زانراوه ئەوانه له نێوان سالآنی (٣٤٨-٤٠٦ك/٩٥٩-١٠١٥ز) فەرمانڕەوایەتیان کردووه، هەروەها له دانانی هەردوو مێژووی کۆچی و زایینیش ورد نەبووه، بۆ نموونه مێژووی دروست کردنی قەلاّی (زەڵم)ی به ساڵی (٥٦٤ك) و بەرانبەرەکەی ساڵی (١١٥٨ز)[٧٠٩] داناوه، کەچی ئەو مێژووه به زایینی بەرانبەر ساڵی (١١٦٨)ه ، به هەمان شێوەش بۆ ساڵی زایینی که بۆ کتێبی ئیبن خردذابەی داناوه ، کە (٢٣٢ك/٨٤٠ز)[٧١٠] داناوه، کەچی بەرانبەر ئەو ساڵه کۆچییه ساڵی (٨٤٦)ی زایینییه[٧١١].

٣- کاتێ دێته سەر ئەوەی له بارەی ئەوقسانەی ئەبی دەلەفی مەسعەری کوڕی مهلهلی گەڕیده بدوێت، کە لەبارەی گوندی کوسه هەجیج[٧١٢] کردوونی، ئەوا مینۆرسکی لێی تێك چووەو دەڵێت ئەو گونده مەڵبەندی تایفەی

---

(٧٠٦) بۆ درێژەی بڕوانه : توفیق ، کردستان في القرن الثامن الهجري، ص ص١٢-١٤ .

(٧٠٧) بڕوانه: بەشی دووەم .

(٧٠٨) بنەماڵەی حەسنەوەیهی : ئەو بنەماڵه فەرمانڕەوا کوردییه له ڕۆژئاوای هەرێمی چیا سەریان هەڵدا . بۆ زانیاری پتر بڕوانه: النقشبندی ، الکرد فی الدینور و شهرزور ، ص ص١٣٠-١٩٥ .

(٧٠٩) بڕوانه : شهرزور ، دائرة المعارف الاسلامیة ، ج١٣ ، ص٤٢١ .

(٧١٠) بڕوانه : تبریز ؛ دائرة المعارف الاسلامیة ، ج١٣، ص٥٤٠.

(٧١١) جێی سەرنجه کە مینۆرسکی ئاماژەی به قسەی ولآتناس و مێژووناسانی موسڵمان دەکات، به زۆری مێژووی دانانی کتێبەکە دیار دەکات - ئەگەر به شێوەیەك بێ نزیك بێت - کە ئەوه بابەتیانه تره ، پێچەوانەی ئەوەی کەله لێکۆڵینەوه مێژووییەکان دا پەیڕەو دەکرێت ئەویش نووسینی ساڵی مردنەکانیانه .

(٧١٢) بڕوانه: نەخشه له پاشکۆ .

ئەهلی هەقەیە . کە وەك دەزانین هەموو خەڵکی کوسەی هەجیج موسڵمانی سونەن[٧١٣].

٤- ئەوەی جێی سەرنجە مینۆرسکی باسی کورد لە هەندێ شاری کوردەواری لە سەردەمی ئیسلامەتی ناکات، هەروەك لە باسی شاری سەحنەدا[٧١٤]، کەچی کە پیتروڤاڵی گەڕیدەی ئیتاڵیایی سەردانی شارەکەی کرد لە چارەکی یەکەمی سەدەی یازدەیەمی کۆچی / حەڤدەیەمی زایینی نووسیوویەتی کە (( دانیشتوانەکەی کورد بوون ))[٧١٥] ، هەروەك لسترنجی ڕۆژهەڵاتناسیش جەختی لەسەر دەکاتەوە[٧١٦].

هەروەها کە دێتە سەر باسی شاری (نەهاوەند)[٧١٧] یش باسی دانیشتوانە کوردەکانی ناکات ، کەچی مەسعودی کە جێی باوەڕی مینۆرسکییە شارەکەی بە وڵاتی کوردان داناوە [٧١٨] هەروەك حەمەدوڵلای مستەوفی قەزوینیش جەختی لەسەر دەکاتەوە[٧١٩]. سەبارەت بەشاری (ڕامهرمز)[٧٢٠]یش مینۆرسکی باسی دانیشتوانە کوردەکانی ناکات، کەچی مسکویە لەسەدەی پێنجەمی کۆچی/ یازدەیەمی زایینی ئاماژە بە بوونی کورد لەوێ دەکات[٧٢١]، هەروەك ئیبن

---

(٧١٣) سلطانی ، قیام نهضت ، ج١، ل٣٦ .

(٧١٤) بڕوانە: نەخشە لە پاشکۆ.

(٧١٥) لە: محمد علی سلطانی ، جغرافیای تاریخی و تأریخ مفصل کرمانشاهان ، تقدیم عبدالحسینی نوایی ، (تهران : ١٣٧٤ش) ،ج١، ص١٩، وەرگێڕاوە .

(٧١٦) بلدان الخلافة ، ص٢٢٥ .

(٧١٧) نەهاوەند: شارێکی گەورەیە ، دەکەوێتە باشووری هەمەدان ، نێوانیان سێ ڕۆژە . بڕوانە : الحموی ، معجم البلدان ،ج٢، ص ص٣١٣-٣١٤ .

(٧١٨) التنبیه والاشراف ، (بیروت، ١٩٨١) ص٩٤ ؛ مروج الذهب و معادن الجوهر ، شرح و تقدیم محمد مفید محمد فصیحة ، (بیروت :١٩٨٦، ج٢ ، ص١٣٥ .

(٧١٩) نزهة القلوب ، ص٨٣ .

(٧٢٠) رامهرمز : شارێکی بەناوبانگە لەلای نەهواز و خەڵك پێی دەڵێن رامز . بڕوانە : الحموی ، المصدر السابق ، ج٣ ، ص١٧ .

(٧٢١) تجارب الامم : هـ .ف ،امدروز (مصر:١٩١٤) ، ج٢ ، ص١٣٥ ، ڕاستیکردۆتەوە و بڵاوی کردۆتەوە .

بەتوتەش لەسەدەی هەشتەمی کۆچی/ چواردەیەمی زایینی ئاماژە بە بوونی کورد لەوێ دەکات[٧٢٢]. بۆیە دەتوانیین بڵێین کە بە درێژایی ئەو سەدانە پڕی خەڵکی کورد بووە .

٥- کە دێتە سەر مێژووی هەر شارێك ، سەرنجی مەسیحییەکان و نەخشیان لە شارەکە دەدات، هەندێ جاریش تەوەری تایبەتیان بۆ تەرخان دەکات[٧٢٣]،کە ئەوەش نیشانەی هاوسۆزیەتی بۆ ئەوان ، لە لێکۆڵینەوەی دیکەشدا هەمان هەڵوێستی لەبارەیانەوە هەبووە[٧٢٤].

٦- جێی ئاماژە پێکردنە ناوی شاری ئامێدی لەناوە کۆنەکەی شاری (ئەمات و ئامادی)[٧٢٥] کەلە نووسینە ئاشوورییەکاندا نووسراوە و وشەکەش زۆر نزیکە لە ناوی ئێستای (ئامێدی)ەوە[٧٢٦] دارێژراوە، نەك وەك ئەوەی مینۆرسکی دەیباتەوە سەر ناوی عیمادەدین زەنگی[٧٢٧].

**ب- لەبارەی تایفەی ئەهلی هەقەوە :**

بنچینەی ناودەرکردنی مینۆرسکی ئەو لێکۆڵینەوانە بوون کە لەبارەی تایفەی هەقەکانی نووسیوە ، لەمەش ڕەوتی ڕۆژهەلاّتناسیانەی گرتۆتە بەر کە بایەخ بە تایفە و کۆمەڵی بچووکی لاچەپ دەدەن[٧٢٨] ، ئەوەش لەبەر :

---

(٧٢٢) رحله ابن بطوطة ، تقديم و تحقيق عبدالهادي التازي ، (الرباط: ١٩٩٧) ، ج٢ ، ص١٨ .

(723) Maragha، p. 265 ; Mardin،p.276.

(724) Studies، pp.82 – 86.

(٧٢٥) طه باقر و فؤاد سفر ؛ المرشد الى مواطن الاثار، (بغداد :١٩٦٥)، الرحلة الثالثة: ص٥٤؛ بشير فرنسيس و كوركيس عواد ، نبذة تأريخية في اصول الامكنة العراقية ، تۆژینەوەیەکە لە گۆڤاری سومر ، ( بغداد: ١٩٥٢) مج٨ ، ج٢ ، ص٢٦٩ بلأوكراوەتەوە .

(٧٢٦) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: کاوە فریق احمد، امارة بادينان ١٧٠٠-١٨٤٢ دراسة سياسية اجتماعية ثقافية، ر.م.غ ،الاداب، (جامعه صلاح الدين/ أربيل :١٩٩٨)، ص١٣ و دوایی .

(٧٢٧) بڕوانە: بەشی دووەم .

(٧٢٨) موسیلیانی ڕۆژهەلاّتناس لە کتێبەکەیدا بەشێکی تەواوی بۆ ئامارکردنی ئەو کارانە تەرخان کردووە کە لە سەد و شەست لێکۆڵینەوەی تێپەڕاندووە ، زۆربەشیان لەبارەی ئێزیدی و هەقەن. بڕوانە: بيبلوغرافيا ؛ ج٢ ، ص ص٦٧٤-٦٩٦ .

أ– سروشتی رۆژهەڵاتناسان ئەوەیە کە سەرنج لە دیاردە دەگمەنەکان دەدەن و لایەنە سەیرەکانیان دەردەخەن و بایەخ بەشتە بچووکەکان دەدەن، هەروەك رودنسونی رۆژهەڵاتناسی بەریتانی جەختی لەسەر دەکاتەوە [(729)].

ب– لەوەش گرنگتر مژدەدەرەکان هەوڵیان دەدا خۆ لەپەیرەوانی ئەو تایفانە نزیك بکەنەوە بۆ دووبەرەکی نانەوەو و پارچە پارچە کردنی کۆمەڵی رۆژهەلات هەروەك ف ـ م ـ ستیدی رۆژهەڵاتناس جەختی لەسەردەکات [(730)].

هەروەك پێشدەچێت مینۆرسکی بەشێوەی راستەوخۆ هاوکاری مژدەدەرەکانی نەکردووە، بەڵام تۆژینەوەکانی بەکەڵکی مژدەدەرەکان هاتووە ، ئەوەبوو سموئیل زۆیمری گەورە مژدەدەری ئەمریکی لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لەکاتی پێداچوونەوەی ئەوەی لەبارەی تایفەی ئەهلی هەقەی لەساڵی ( ١٩٢٠ ) بڵاوکردەوە ، رایگەیاند کەوا : (( پێویستە ئەو لێکۆلینەوەیە لە کتێبخانەی هەر مژدەدەرێکدا هەبێت)) [(731)].

لەسەرێکی دیکەوە رۆژهەڵاتناسی گەورەی ئەلمانی نولدکە لە نامەیەکدا بۆ مینۆرسکی ئاگاداری دەکاتەوە کە ئەوەندە بەو لێکۆلینەوەیەدا بەقوول دا نەچێت بۆ ئەوەی بە بەکرێگیراوی لەقەڵەم نەدەن [(732)] . مینۆرسکیش بە رێزەوە وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت لێکۆلینەوەکەی جگە لە لایەنی ئەکادیمی هیچ شتێکی دیکەی لە دواوە نییە [(733)]. هەرچی چۆنی بێت، ئەوا بەدیقەت روانین لە لێکۆڵینەوەکانی هەندێ سەرنجت بۆ پەیدا دەبێت :

١- مینۆرسکی لەمەڕ هەلبژاردنی ناوێکی لەبار بۆ ئەو تایفەیە سەرکەوتوو نەبووە، ناوی عەلی ئیلاهی – بە بیانووی (( عەلی مەبەستی سەرەکی نییە لەو تایفەیە )) ناوی ئەهلی هەقی بۆیان هەڵبژارد، بەڵام پێی وایە

---

(٧٢٩) بروانه : سلامة حسين كاظم ، التبشير في العراق وسائله وأهدافه ، ر.م.غ. كلية الشريعة، (جامعة بغداد:١٩٨٥) ، ص٧٩ .

(730) The Ali-Ilahis، p. 189.

(731) Review of minorskys Notes la secte، p.103.

(732) Minorsky، Review of A. Azzawi، al-kakiyya، p.410.

(733) Ibid.

(( دەستەواژەی ئەهلی هەق ورد نییە )) . باشە بۆچی مینۆرسکی بەدوای ناوێکی لەبار نەگەڕا بۆیان ، کە تا دوادوای ژیانی بایەخی بەو بابەتە دەدا؟ هۆی چییە ناولێنانی ( کاکەیی ) رەت دەکردەوە، هەروەك پەیرەوانی تایفەکە بەخۆیان دەگووت[٧٣٤]؟ رەنگە هۆیەکەی ئەوە بووە کە مینۆرسکی لە ئێران لەو تایفەیەی تۆژیتەوەو لەوێش بە ئەهلی هەق ناسراون ، جا ئەگەر لەگەڵ ئەوانەی عێراق تێکەڵاتی هەبوایە رەنگ بوو ناوی کاکەیی بۆ هەڵدەبژاردن ، چونکە بەو ناوەوە ناسراون .

٢- ئەوەی جێی سەرنجە مینۆرسکی لەو قسەیەی پەشیمان بۆتەوە کەوا: ((عەلی ئیلاهی ئایینێکی کوردی رووتە و بەباشی لێی نەتۆژراوەتەوە))[٧٣٥]، ئەو قسەیەی لەبەر ئەوەکرد، چونکە بڕوای وابوو زاری گۆران — کە ئەدەبی ئەو تایفەیەی پێ نووسراوەتەوە، سولتان ئیسحاق پێی دەئاخاوت — یەکێ لە زارە کوردییەکانە ، بەلام مینۆرسکی هەر لەساڵی (١٩٢٦ ) ەوە رای خۆی گۆڕی بەبێ گەڕانەوە لەو بارەیەوە، کاتێ کە بڕوای پەیداکرد کەوا هۆزی گۆران هۆزێکی کورد نین[٧٣٦] ئەوەش دواتر گفتوگۆی لەسەردەکەین.

٣- مینۆرسکی لە بەسەرکردنەوەی مێژووی ئەو تایفەدا بە بایەخەوە لەنەخشی سەرکردە ناودارەکانیان دەدوێت، بەلام هەندێکیانی لەبیر کردووە[٧٣٧]. لەهەمان کاتدا نەیتوانیوە بەوردی مێژووی ئەوانە دیار بکات کە ئاماژەی پێ کردوون. هەروەك شاخوشین کە مینۆرسکی مێژووەکەی بە هەڵە دیارکردووە، ئەویش چونکە پشتی بە کتێبی سەرئەنجام بەستووە. بەلام

---

(٧٣٤) رەشاد میران، رەوشی ئاینی و نەتەوایەتی لە کوردستاندا، (هەولێر : ٢٠٠٠)، لا ١٥٦ — ١٥٧.

(٧٣٥) الأكراد ، ص٥٦ .

(٧٣٦) شهرزور ، ص٤٢٠ .

(٧٣٧) بۆ زانیاری لەبارەی ئەو سەرکردانە . بڕوانە : كريم نجم خضر الشواني ، الكاكائية اصولها و عقائدها ، ر. م. غ. كلية الشريعة ، ( جامعة بغداد ١٩٨٩ ) ، ص ص٥٣ — ٦٨ ؛ سلطاني ، قيام نهضت ، ج ٢١، ص ص٢٦ — ١٤٨ .

محەمەد عەلی سولتانی تۆژەر توانی بگاتە ئەوەی کە شاخوشین لە نێوان سالانی ( ٣٢٠ – ٤١٠ ك / ٩٣٢ – ١٠١٩ ) دا، ژیاوە[٧٣٨].

سەبارەت بە سولتان ئیسحاقیش – کە مینۆرسکی بایەخی پێدەدا – نەیتوانیوە مێژووی ژیانی دیاربکات ، کە لەمەیاندا بەهەڵەدا چووە، بێ گومان جیاوازییەکی زۆر لە نێوان تۆژەران سەبارەت بە سەردەمی ئەو سەرۆکانەوە هەیە. سەبارەت بە سەردەمی سولتان ئیسحاق راو بۆچوونی جیاجیا نووسراوە، هەیە دەڵێت لەساڵی ( ٦١٢ ك / ١٢١٢ ز )[٧٣٩] یان لەساڵی (٦٧١ ك / ١٢٧٢ ز ) بۆ ئەوەی مێژووی کۆچی دوایی دیاربکرێت[٧٤٠]، کەچی هەندێك پێیان وایە لەنێوان سالانی ( ٧١٦ – ٧٩٦ ك / ١٣١٦ – ١٣٩٣ز)[٧٤١] ژیاوە، مینورسکیش لەئاکامی کەوتنە ژێر کاریگەریی هاورێ بەریتانییەکەی ئەدموندز لەگەل رای دووەم دابووە[٧٤٢]، بەڵام لەراستیدا رای دوایی لەراستی نزیکترە، چونکە باوکی سولتان شێخ عیسا بەرزنجی لە ساڵی (٧٥٤ ك / ١٣٥٣ ز) خودا بۆخۆی بردەوە[٧٤٣].

٤- بەڵام ئەو بابەتەی کە هەمیشە مینۆرسکی لەکۆتایی لێکۆلینەوەکانیدا گفتوگۆی لەسەردەکات لەبارەی ئەو تایفە، رێورەچەلەکی ئەو تایفەیەیە، پێی وایە ئەو ئاینزایە کە ئاوی لە زۆربەی ئایینە ئاسمانییەکانەوە خواردۆتەوە. لەراستیدا قسەی ناکۆك لەو بارەیەوە هەیە[٧٤٤]، بەڵام پوختەکەی ئەوەیە کە لە بنجدا رێبازێکی خاوێنی سۆفیگەرییە، بەڵام

---

(٧٣٨) قیام نهضت ، ص ص٢٦ – ٢٧ .

(٧٣٩) بورەکەیی ، دوره هفتوانه ؛ ص٢٥ .

(٧٤٠) ادموندز ، كرد و ترك و عرب ، ص ١٧٠ .

(٧٤١) هاشم کاکەیی ؛ ئەستێرەگەشەی ئاسمانی شارەزوور سولتان ئیسحاقی بەرزنجی ، وتار ، لەگۆڤاری کاروان ؛ ( بەغداد : ١٩٨٧ ) ؛ ژ ٦١ ، ب ١ ، ل ١٠٣ ؛ بڵاوکراوەتەوە .

(742) Iranica، pp. 312-313.

(٧٤٣) سلطانی ، قیام نهضت ؛ ج١ ، ص ص٧٤ – ٧٨ .

(٧٤٤) نورعلی الهي ، برهان الحق ، ص ص٢٩٤ – ٣٦٦ ؛ میران ؛ رەوشی ، ل ٦١ – ٦٢ .

دەروێشەکانی سولتان ئیسحاق لە ڕێبازەکەیان لایانداو کردیانە سۆفیگەرییەکی تێکەڵ بە پەنامەکیی ( باطنية )[٧٤٥].

مامۆستا مەلاعەبدولکەریمی موژدەریس لەبارەی سولتان ئیسحاق و ڕێبازەکەی دەڵێت : ((پیاوێکی خاوەن کەرامەت بوو ، بەڵام هەندێ لە پەیرەوە نەزانەکانی زۆر راو بیروباوەری پڕوپووچیان داهێنا ، لەگەل ئەفسانەدا تێکیان هەلشێلا ، پاشان خستیانە سەر ڕێبازی سولتان ئیسحاق ، کە زۆر زۆر لەوشتانە دووربووە، پیاوچاك و موسلمانێکی راستەقینە بووە ))[٧٤٦].

سەرباری ئەو تێبینی و رەخنانەش، بەڵام مینۆرسکی لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی بۆ توێژەران جێ هێشت کە سەرچاوەی سەرەکییە و ناکرێت پشت گوێ بخرێت بۆ ئەوەی دەیەوێت لەو تایفە بتوێژێتەوە .

**ج– لەبارەی هۆزە کوردەکانەوە :**

مینۆرسکی، چ لەنێو لێکۆلینەوە جۆراوجۆرەکانی و چ لە لێکۆلینەوەی سەربەخۆدا، باسی هۆزە کوردەکانی کردووە . ئەوەی دەکرێ گفتوگۆی لەسەر بکەین ئەوەیە، کە پێوەندی بە ریورەچەڵەکی ئەو هۆزانەوە هەیە کە مینۆرسکی بە کوردیان نازانێ :

سەبارەت بە هۆزی شوانکارە، ئیستەخری ئاماژە بەوە دەکات کە هۆزێکی کوردن[٧٤٧]، هەروەها ئیبن ئەثیریش کوردبوونی رادەگەینێ و مینورسکیش پشتی پێ دەبەستێ، کەباسی ڕووداوەکانی ساڵی ( ٥٦٤ ك / ١١٦٨ ز )[٧٤٨]

---

(٧٤٥) نوری یاسین هەرزانی ، الكاكائية دراسة انثروپولوجية ، ر. م. غ. الآداب ، ( جامعة بغداد : ١٩٨٥) ، ص ص٥٧ — ٧٠ ؛ الشوانی ، الكاكائية أصولها ، ص ص٥١ — ٥٢ .

(٧٤٦) بنەماڵەی زانیاران ؛ ( بەغدا : ١٩٨٤ ) ، ل ٢٧٦ .

(٧٤٧) كتاب الأقاليم ، دقز كردن ج. موللر ( د. م. ت ) ، ص٢٩ " هەمان نووسەر ، مسالك الممالك (ليدن : ١٩٢٧ ) ، ص ١١٤ ؛ Kurd, p. 1135

(٧٤٨) الكامل ، ج ٩ ، ص١٠٤ .

دەکات، هەروەها بەنداریش ( ٦٤٣ ك / ١٢٤٥ ز) رایدەگەیەنیَ کە شوانکارە ((نەوەیەکن لە رەگەزی کوردان لە لای ولاَتی فارس ))[٧٤٩].

لە سەریَکی دیکەوە بوخنری رۆژهەلاَتناس دەلیَت: (( ناوی شبانکارە واتای هۆزیَکی کورد دەدات ))[٧٥٠] و پتریش دەلیَت (( هۆزی شوانکارە کوردن، لەسەدەی شەشەمی کۆچی/ دوازدەیەمی زایینی پیَنج تیرەی هەبووە، کە ئەمانەن : ئیسماعیلی و رامانی و کروزی و مەسعودی و شکانیین .... دیارترینی ئەو هۆزانەش لە میَژوودا هۆزی رامانە ))[٧٥١]. عەلی ئەکبەر دهخدای زاناو شارەزای گەورەی فارسیش شوانکارە بە کورد دادەنیَت[٧٥٢]. هەروەك تۆژەرانی کوردی وەك محەمەد ئەمین زەکی[٧٥٣] و محەمەد مردۆخ[٧٥٤] . و جەمیل رۆژبەیانیش[٧٥٥] لەسەر ئەو رایەن .

سەبارەت بە هۆزی لوریش ، هەموو سەرچاوە ئیسلامییەکان بە هۆزیَکی کوردی دەزانن ، مینۆرسکی خۆی قسەی مەسعودی و یاقوت حەمەوی لەوبارەیەوە دەنووسیَتەوە[٧٥٦]. ویَرای ئەوە ئیبن حەوقەل[٧٥٧] و ئەنصاری و ئەلدیمەشقیش هەمان رایان هەیە[٧٥٨].

---

(٧٤٩) تاريخ دولة آل سلجوق ،تحقيق لجنة احياء التراث العربي، (بيروت : ١٩٨٠ ) ص١١٦ .

(٧٥٠) شبانكاره ، دائرة المعارف الاسلامية ، ط١ ، ج ١٢ ، ص١٥٤ .

(٧٥١) نفسه ، ص ١٥٥ .

(٧٥٢) لغت نـامة ، ج ٩ ، ص١٢٤٤٧ — ١٢٤٤٨ .

(٧٥٣) تاريخ الدول و الأمارات الكردية ، ترجمة و مراجعة : محمد علي عوني ، ( مصر : ١٩٤٨ ) ، ص ص ١٢١ — ١٢٤ .

(٧٥٤) تأريخ مردوخ ، ج ١ ، ل ٩٩ .

(٧٥٥) فەرمانرەوایی شوانکارەی کورد لە هەریَمی فارس و ئەسفەهان، تۆژینەوەکە لە گۆڤاری کۆری زانیاریِ عیراق — دەستەی کورد — ،(بەغداد: ١٩٨١)؛ ب٨، ل١٥٩٧—١٩٨؛ بلاَوکراوەتەوە.

(756) Lur، p.41 ;

المسعودي : التنبية. ص ص٨٨ — ٨٩؛ مروج، ج ٢، ص١٣٥ ؛ ياقوت ، معجم البلدان، ج٢، ص١٦.

(٧٥٧) صورة الأرض ، ص٢٩٣.

(٧٥٨) نخبة الدهر في عجائب البر والبحر ، تصحيح اغسطسى بن يحيى ، (لايبزك : ١٩٢٣) ، ص١٧٩.

هەروەها ئەبو فیدای مێژوونووس[٧٥٩] و شبانکارەای[٧٦٠] و قەلقەشەندی[٧٦١] و مەقــریزی[٧٦٢] و شرفخـانی بەدلـیسی[٧٦٣]، و محەمەد مورتـەزا زبێـدی[٧٦٤] و ئەحمەد جەودەت پاشای مێژوونووسی ناوداری عوسمانی[٧٦٥]، شلور بە هۆزێکی کورد دەزانن .

لە سەرێکی دیکەشەوە چەندین رۆژهەڵاتناسی وەك ریچ[٧٦٦] و لسترنج[٧٦٧] و مالکوم و فریج و براون و لدیە و هاسل و ئینسکلوپیدیای تورکی[٧٦٨] و دهخدای زانای فارسی[٧٦٩] و شاکر خەسباکی تۆژەری عەرەبیش لوڕ بە کورد دەزانن[٧٧٠] .

لەلایەکی دیکەشەوە ئەگەر سەیری سروشتی جوگرافی هەرێمی لورستان بکەین، بۆمان دەردەکەوێت کەوا درێژبوونەوەی وڵاتی کوردەوارییە، بەجۆرێ کە لەسەردەمی بویهییەکان خرابووە سەر هەرێمی چیا، چونکە (( هەوای چیای بەسەردا زاڵە))[٧٧١] دەگاتەوە ئەوێ[٧٧٢] ، لەلایەنی مێژووشەوە مینۆرسکی خۆی

---

(٧٥٩) تقویم البلدان ؛ نشر وتصحیح رینود وماك كوكین دیسلان ، ( باریس : ١٨٤٠ ) ؛ ص٣١٣ .

(٧٦٠) معجم الانساب ؛ ص ص٢٠٦ – ٢٠٨ .

(٧٦١) صبح الاعشى ؛ ج ٤ ، ص٢٤٣ .

(٧٦٢) السلوك لمعرفة دول الملوك، تحقيق محمد عبدالقادر عطاء، (بيروت : ١٩٩٧) ؛ ج١، ص١٠١.

(٧٦٣) الشرفنامة في تأريخ الدول و الأمارات الكردية ، ترجمة و تعليق ملا جميل بندى روژبيانى ، (بغداد : ١٩٥٣ ) ، ص٢٠.

(٧٦٤) تاج العروس من جواهر القاموس ؛ ( مصر : ١٣٠٦ هـ ) ؛ ج ٢ ، ص٤٨٤ .

(٧٦٥) لە : زكى ، خلاصة ، ص١٨ ، وەرگیراوە .

(٧٦٦) رحلة ريج . ج ١ ؛ ص٧٨ .

(٧٦٧) بلدان الخلافة ؛ ص٢٣٥ .

(٧٦٨) لە زكى ، المصدر السابق ؛ وەرگیراوە .

(٧٦٩) لغت نامة ، ج ١٢ ؛ ص ص١٧٣٤٥ ؛ ١٧٣٤٩ – ١٧٣٥١ .

(٧٧٠) الاكراد ، دراسة جغرافية اثنوغرافية ( بغداد : ١٩٧٢ ) ، ص ص ٤٩٢ ، ٥٢٠ .

(٧٧١) ابن حوقل ؛ صورة الأرض ، ص٢٣٢ .

(٧٧٢) ياقوت ، معجم البلدان ؛ ج ٥ ، ص٢٥ .

سەلماندوویە کەوا دامەزرێنی ئەتابەکییەی لوڕی گەورە، ئەو کوردانە بوون کە لە شامەوە هاتبوون[٧٧٣].

بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە کە زاری لوڕی لەگەڵ فارسی تێکەڵ بووە و کاری تێکردووە، ئەویش لەبەر نزیکی خەلکەکەی لەناوچەی فارسی[٧٧٤]، ئەمین زەکی مێژوونووسی کورد لەو ئاڵۆزییە دەدوێت و دەڵێت: پوختەی قسە لەو بابەتەدا ئەوەیە، جیاوازی سادە لە زمان و زار بەشی ئەوە ناکات بکرێتە جیاوازی نەتەوان و لێکیان هەڵبوێریت، گەلەکانیان بە نەتەوەی جیاواز لەقەڵەم بدات ))[٧٧٥].

بەڵام ئاخۆ مینۆرسکی بۆچی تێکرای ئەو راستیانەی فەرامۆش کردووە ؟ رەنگە ئەوەیان لە تێڕوانینی سەردەمانەی بابەتەکەوە بێت ، بەو مانایەی کەوا بەپێی هەلومەرجی ئەمڕۆ سەیری لوڕ و وڵاتەکەیان دەکات ، نەك وەك رۆژانی سەردەمی ئیسلامەتی[٧٧٦].

لەبارەی رێوەڕەچەڵەك و زمانی هۆزی (گۆران) ساڵی ( ١٩١٥ ) مینۆرسکی بەرپەرچی ئەو رایەی داوەتەوە ، کە دەڵێت : (( بەڵام من بڕوام وایە کە ئەو تیورییە راست نییە، چونکە ئەوانە بەزمانی کوردی دەئاخێون کە چەند زاراوەنیەکن. رەگەزەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیان کوردییە و ئایینیان عەلی ئیلاهییە کە هۆزی دیکەی کورد پەیرەوی دەکەن ))[٧٧٧]. بەڵام هەر لەساڵی (١٩٢٥)[٧٧٨] وە رای خۆی گۆڕی و هەرپێیەوە پابەندییەتی[٧٧٩]، پێی وایە هۆزی گۆران کورد نین ، لە ساڵی ( ١٩٤٣ ) یش بەدرێژی رای خۆی لەبارەی

---

(٧٧٣) بڕوانە: بەشی دووەم ؛ هەروەها بڕوانە : شبانکارة ای ، معجم الانساب ؛ ص٢٠٦ .

(٧٧٤) راستییەك هەیە ئەویش ئەوەیە، کە هەردوو زمانی کوردی و فارسی رەسەنیان یەکە؛ بۆیە شتێکی بەڵگەنەویستە کە لێك چوون لەنێوان زارەکانی کوردی و فارسیدا هەبێت.

(٧٧٥) خلاصة ؛ ص ص١٧ – ١٨ .

(٧٧٦) بڕوانە : بەشی سێیەم .

(٧٧٧) بڕوانە : الاکراد ، ص ص١٧ – ١٨ .

(٧٧٨) مینۆرسکی ، سنة ، دائرة المعارف الاسلامية ، ط١ ، ج١٢ ، ص٢٧٦ .

(٧٧٩) بڕوانە : سفر نامة ابو دلف ، ص١١٧ ، ؛ pp.1150-1151 ؛ " Kurd " ؛ شهرزور، ص٤٢٠ .

رێوڕەچەڵەك و زمانی هۆزی گۆرانەوە دەردەبڕێت، هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرا .

لەسەر ئەوە لەگەڵی کۆکین کە دەبینیٚ وشەی گۆران لە جورقان داتاشراوە، چونکە هەردوو وشەکە لێك دەچن و رەنگە وشەی جورقان لەئاکامی زاڵی راوێژی زمانی مێژوونووسانی عەرەبەوە بێت، چونکە وشەی گۆرانی ئەمڕۆ لە سەرچاوەیەکی فارسیدا ناوی هاتووە، کە لەسەرەتای سەدەی شەشەمی کۆچی/ دوازدەیەمی زایینی[780] تۆمارکراوە، سەبارەت بەو رایانەی کە لەبارەی بنەچەکەی ئەو هۆزەی گوتوون کۆك نین، چونکە نە سەرچاوە کۆنەکان و نە لێکۆڵینەوە نوێیەکان لاگیری لیٚ ناکەن .

مەسعودی نووسیوویەتی کە هۆزی جورقان لە هۆزە کوردەکانن و دەڵێت : (( چیا ئەوانەی لێیە .. وەك یاقوبی و جورقان ... مەڵبەندەکەشیان لەولای موسل و چیای جوودییەوەیە ))[781] . هەروەها مەقریزی[782] و زبێدی[783] و ئەحمەد جەودەت پاشای مێژوونووسی عوسمانی و ئینسکلوپیدیای تورکیش[784] هەمان رایان هەیە .

لەلایەکی دیکەشەوە مینۆرسکی بەرێنوێنی قسەی ئیبن خردذابە کە نووسیویەتی، ناوی هەردوو هۆزی جاوان و جابرقە بەجیا لە ناوی کورد هێناوە، لە دەرەنجامی ئەوەوەیە کە جابرقە بە کورد نازانیٚ ، ئەو قسەیەش یەکلایکەرەوە نییە ، مەسعودی هۆزی جاوان بە کورد دەزانیٚ و[785] هەروا مەقریزیش[786] لایەنی ئەو قسەیە دەگرێت، لەم دواییانەشدا مستەفا جەواد لە

---

(٧٨٠) بڕوانە: مؤلف مجهول؛ مجمل التواريخ و القصص، (تهران : ١٣١٨ هـ. ش)، ص ص٣٩٧ – ٤٠١.

(٧٨١) مروج ، ج ٢ ، ل ١٣٥ . هەروا لە کتێبەکەی دیکەشی جەخت لەسەر ئەوە دەکات . التنبيه ، ص ص٨٨ – ٨٩ .

(٧٨٢) السلوك ، ج١ ، ص١٠١ .

(٧٨٣) تاج العروس ، ج٢ ، ص٤٨٤ .

(٧٨٤) لە زکی ، خلاصة ، ص ١٨ ، وەرگیراوە .

(٧٨٥) التنبيه ، ص٩٤ ؛ مروج ، ج٢ ، ص١٣٥ .

(٧٨٦) السلوك ، ج ١ ، ص١٠١ .

لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمی و بە بەڵگەی بابەتیانە سەلماندی، کە جاوان هۆزێکی کوردن[٧٨٧] . جا لەوەوە ئەو ئەنجامەمان دەستگیر دەبێت، کە ئیبن خردذابە لە دەستەواژەکەی مەبەستی ئەوە نەبووە ئەو دوو هۆزە لەکورد جیان.

لەلایەنی زمانیشەوە ئاشکرایە جیاوازی لە نێوان گۆرانی و کوردیدا هەیە، هۆیەکەشی ئەوەیە، زاری گۆران ئەدەبی هەقەکانی پێ نووسراوەتەوە و بۆتە زمانی ئایینی و دواتر کەمتر دووچاری گۆڕان و گۆڕین بووە، هەروەها بۆتە زمانی دیوانی لە میرنشینی ئەردەڵانیش[٧٨٨]، ئیدی بۆتە زمانی ئەدیب و شاعیرانی ئەو رۆژە[٧٨٩]، سەرباری باری جوگرافی کە نەخشی دیاری لەمانەوەی ئەو زارە وەك خۆی هەبووە، چونکە سەختی ناوچەکە وای لێ کردوون دوورە پەرێز بن و لەگەڵ خەڵکی دی تێکەڵ نەبن[٧٩٠]، وێڕای هەبوونی هۆی ئەو جیاوازیانە ، ئەوا گۆران خۆیان بە بەشێك لە نەتەوەی کورد دەزانن ؛ هەروەك شەرەفخانی بەدلیسی[٧٩١] و ئەدموندزی رۆژهەڵاتناس[٧٩٢] و دهخدای زانا[٧٩٣] و

---

(٧٨٧) بۆ درێژەی بڕوانە : جاوان القبيلة الكردية المنسية و مشاهير الجاوانيين ، ( بغداد : ١٩٦٧ ).
دوای ئەوەیش تۆژەروانی دیکەش کوردبوونی ئەو هۆزە دەسەلمێنن . بڕوانە : حسام الدين النقشبندی ، ملاحظات حول جاوان القبيلة الكردية المنسية و مشاهير الجاوانيين تۆژینەوەکە لە گۆڤاری المجمع العلمی الكردی ، ( بغداد : ١٩٧٤ ) ، مج٢ ق٢ ، ص ص٢٧٨ — ٢٩٢ ؛ عبدالرقيب يوسف ، نبذة وثائقية عن تاريخ قبيلة جاوان الكردية ، وتارەکە لە گۆڤاری شمس کوردستان ؛ ( بغداد : ١٩٧٩ ) ، ع ٥٥ . ص ص١٤ — ١٨ ، بڵاوکراوەتەوە .

(٧٨٨) میرنشینی ئەردەڵان : میرنشینێکی کوردە لە سەدەکانی نێوان سێزدەیەم و نۆزدەیەمی زایینی پایتەختیان سنەی ئێستایە لە کوردستانی ئێران . بۆ زانیاری پتر بڕوانە : البدليسی ، الشرفنامة ، ص ص١٠٦ — ١٢٤ ؛ زكی ، تأريخ الدول ، ص ص٢٧٦ — ٢٩١ .

(٧٨٩) مینورسکی ؛ سنە ، ل ٢٧٧ ؛ محمد ، لیریکای شاعیری گەورەی کورد ، ل ٣٨ .

(٧٩٠) بۆ زانیاری پتر سەبارەت بەو هۆکارانە بڕوانە : فؤاد حمە خورشيد ، اللغة الكردية و التوزيع الجغرافی للهجاتها ، ( بغداد : ١٩٧٣ ) ؛ ص ص٢١ — ٢٢ .

(٧٩١) الشرفنامة ، ص٢٠ .

(٧٩٢) کرد و ترك و عرب ، ص١٥ .

(٧٩٣) لغت نامە ، ج ١٢ ، ص ص٨٣ — ١٧ .

ماشاءالله سوری[٧٩٤] و عەباس عەزاوی تۆژەرەوەش جەختی لەسەر دەکەنەوە[٧٩٥] .

سەرباری ئەدموندز، ئەوا کۆمەڵێ رۆژهەڵاتناس چ بە ئاخاوتن چ بە ئاماژە پێکردن بێ، گۆران بە هۆزێکی کورد دادەنێن و لەوانە ریجی بەریتانی[٧٩٦] و ن.مار[٧٩٧] و ڤاسیلیڤا[٧٩٨] و مینتیشاشفیلی[٧٩٩] و زاری یوسفی[٨٠٠] رووسی و ج. روسوی فەرەنسیش دانی پێدادەنێت ، مارتن ڤان برونسنی رۆژهەڵاتناسی هۆلەندیش کوردبوونی ئەو هۆزەی رەت نەکردۆتەوە[٨٠١] .

لەسەرێکی دیکەشەوە ئەوەی مینۆرسکی لەبارەی ئەدەبی گۆرانی نووسیوە ، واپێدەچێت بەباشی لە لێکۆلینەوەکەی ورد بووبێتەوە ، ناوی بیست و هەشت شاعیر دەهێنێ ، بەلاّم لە پێشەکی لێدوانەکەیدا دەڵێت بیست و حەوتن[٨٠٢]، تێیدا ئاماژە بە خانای قوبادی[٨٠٣] ( ١٧٠٠ — ١٧٥٩ ) شاعیریش دەکات کە لەهۆزی جافی کوردە ، جا بۆئەوەی رایەکەی خۆی لەبارەی زمانی گۆران بسەلمێنێت؛ ئەگەر بە بەلگەی نابابەتیش بێت ، بۆیە دەڵێت هۆزی جاف ئەمرۆ زمانی خۆیان گۆریوە ، بەلاّم ئایا دەکرێ هۆزێکی گەورە لەماوەیەکی

---

(٧٩٤) سرودهای دینی ، ص٢٥.

(٧٩٥) شهرزور — السليمانية اللواء و المدينة ، تقديم و تعليق ، محمد علی قرەداغی، ( بغداد :٢٠٠٠)، ص ص١٣٦ — ١٣٨ .

(٧٩٦) رحلة ريج ، ج ١ ، ص٨٥ .

(٧٩٧) لە: ب. نیکیتین ، کورد و کوردستان ، وەرگێرانی : خالیدی حسامی ( هێدی ) ، ( هەولێر : ١٩٩٨ ) ، لا ٣٦٩ — ٣٧٠ ، وەرگێراوە .

(٧٩٨) کوردستانی خوارووی رۆژهەلاّت ، وەرگێرانی رەشاد میران ، ( هەولێر : ١٩٩٧ ) ، لا ١٧٩ ، ١٨٧ — ١٩٦ .

(٧٩٩) کورد ، کورتەی پێوەندی کۆمەلاّیەتی و ئابووری و رۆشنبیری و گوزەران ، وەرگێران و لێدوانی عیزەدین مستەفا رەسول ، ( سلێمانی : ١٩٩٩) ، لا ١٥٢ — ١٥٧ .

(٨٠٠) لەبارەی پێکهاتنی دیالیکتەکانی زمانی کوردی ، وتارێکە لە گۆڤاری رووناکبیری . (ستوکهولم: ١٩٩٣ ) ، ژ ١ ، لا ٥٦ — ٧٤ ، بلاّوکراوەتەوە .

(٨٠١) ئاغاو شێخ و دەولەت ، وەرگێرانی: کوردۆ عەلی ، ( سلێمانی : ١٩٩٩ ) ، لا ١٤٩ — ١٦٣ .

(802) The Guran ، pp.92-93.

(٨٠٣) بۆزانیاری پتر بروانە : خانای قوبادی ، شیرین و خوسرەو ، ئامادەکردنی محەمەدی مەلا کەریم ، ( بەغدا : ١٩٧٥ ) .

کورتدا زمانی خۆی بگۆڕێت . لەوەش گرنگتر خانای قوبادی شاعیر خۆی لە شیعرەکانیدا ئاماژە بە زمانە کوردییەکەی خۆی دەکات و زمانێکی خۆشەویستە لای[٨٠٤] .

ئەنوەر سولتانی تۆژەرەوەی کورد، ساخکەرەوەو وەرگێڕی ئەو دەستنووسەیە کە مینۆرسکی باسی دەکات و لە مۆزەخانەی بەریتانیایەو لە لێکۆلینەوە ئەکادیمییەکەیدا سەلماندوویە کەوا خوتبە خوێنی مزگەوتی شاری (سنە) شێخ عەبدولمؤمن مردۆخی ( ١٧٣٩ — ١٧٩٧ ز ) ئەو شیعرانەی بەر لە دووسەد ساڵ کۆکردۆتەوە و شیعرەکانی خۆی و باوکیشی خستۆتە سەر، ئەوا ئەو شیعرانە تەواو کوردیین ، ئەوەی زمانی کوردی نەزانێ تێی ناگات[٨٠٥] .

لە کۆتاییشدا دەتوانین بلێین مینۆرسکی لەو رایەی کە دەڵێت هۆزی گۆران کوردنین، بە هەڵە داچووە، مەسعودی مێژوونووسی سەدەی چوارەمی کۆچی / دەیەمی زایینی لە راستی بوونی جیاوازی لە زمانی نێوان هۆزە کوردییەکان گەیشتووە، کاتێ دەنووسێت: ((هەر کوردەو جۆرە زمانی کوردی خۆی هەیە))[٨٠٦] بۆیە ئەو گومانی لە کوردبوونی گۆران نەبووە .

سەبارەت بە بنەچەکەی هۆزی کوردی رەوادی، رەنگە لەژێر کاریگەریی مێژوونووسی هاوچەرخ ئەحمەد کسروی[٨٠٧]، مینۆرسکی پێی وایە، کە رەوادی سەروکاریان لەگەل هۆزی ئەزدی عەرەبییەوە هەیە و چەندین جاریش دووپاتی کردۆتەوە[٨٠٨] . بەبێ ئەوەی پشت بە قسەی سەرچاوەی هاوچەرخی ئەو سەردەمە ببەستێت، ئەوا حیسامەدین نەقشبەندی تۆژەر لە لێکۆڵینەوە ئەکادیمییەکەیدا بەرپەرچی رایەکەی داوەتەوە و دەڵێت : (( ئەو چەشنە گۆڕانە دەشێت ... بەڵام کۆسپێکمان دێتەڕێ ئەویش ئەوەیە کە هەموو مێژوونووسان لەسەر ئەوە کۆکن، رەوادی کە لە ئازەربایجان و ئاران بنەماڵەی

---

(٨٠٤) بۆ ئاگاداری لەو شیعرانە بروانە : هەمان لا چواردەو پازدە .

(٨٠٥) کەشکۆلە شیعرێکی کوردی (( گۆران )) ؛ ( لەندەن : ١٩٩٨ ) ، ل ٣٣ .

(٨٠٦) مروج ، ج ٢ ، ص١٣٣ .

(٨٠٧) شهریاران ، ب٢ ، لا ١٥٠ — ١٥٦ .

(٨٠٨) مینورسکی ، أذربیجان ، ص٢٩ ؛ الأحمدیلیة ، دائرة المعارف الاسلامیة ، ط ٢ ، ص٤٠٠ ؛ studies, pp. 114-115.

فەرمانڕەوایەتیان دامەزراند ، تیرەیەکن لە هۆزی گەورەی کوردی هەزەبانی ، کەسیان نەیانبردوونەتەوە سەر بەنی ئەزد ، هەروەك چۆن بە بەنی رەوادی بەراییان وا کرد))[٨٠٩].

د– لەبارەی بنەماڵە کوردە فەرمانڕەواکانەوە :

لە دەرەنجامی بایەخدانی مینۆرسکی بە رابردوو و مێژووی کورد، ئەوا سەرەنجام رایکێشا سەر تۆژینەوە لە دەسەڵاتی سیاسی[٨١٠] و بنەماڵە کوردە فەرمانڕەواکانیش. ئەوەبوو لەسەراوودەراوی باسە جۆراوجۆرەکان و بە وتاری سەربەخۆش ئاماژەی پێ کردوون و لەو بنەماڵانەی تۆژیوەتەوە، بەبێ ئەوەی لەلایەنە مێژووییەکانی قوول بێتەوە، رەنگە رێبازی شەرەفنامەی[٨١١] لە خستنە بەرچاوی گرتبێتە بەر، هەروەك لەو نووسینانەی کە لەبارەی لوڕی گەورە و بچووك و ئەحمەدیلی و عەنازیدا بە روونی دیارە. لەو وتارانەدا مینۆرسکی شتێکی، لەئاکامی شەن و کەوو تاوتووکردن لێ زێدە نەکردوون، بەڵام ئەو لێکۆلینەوانە جێی پێناسەکردنن بۆ رۆشنبیرانی ئاگاداری رۆژئاوا و رۆژهەڵاتی .

ئەو رەخنەیەی کە لەو تۆژینەوەی لەبارەی لوڕی گەورەوە لێیان گرتووە، ئەوەیە کە ئەو وشەو زاراوەی هاوچەرخی بەکارهێناوە، جا کە ناوی

---

(٨٠٩) أذربيجان ، ص١١٧ . بۆ زانیاری پتر بڕوانە : ابن خلكان ، وفيات الأعيان ، ج ٧ ، ص١٣٩.

(٨١٠) وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد ، مینۆرسکی پەنجەی بۆ جولانەوەو دەسەڵاتی دەیسەمی کوڕی ئیبراهیمی کورد ، راکێشاوە ، بەڵام دەڵێت باوکی دەیسەم عەرەب بووە ، بەبێ ئەوەی ناوی سەرچاوەیەك ببات ، راستییەکەی سەرچاوەکان ئەو قسەیەی مینۆرسکی ناسەلمێنن . رەنگە ئەو بڕوایە لەوەوە سەری هەڵدابێت کە هەندێ هۆزی عەرەب بە تێپەربوونی رۆژگار لەگەڵ خەڵکی رەسەنی ناوچەکە لە ئازەربایجان توابنەوەو تەنانەت سەرچاوە ئیسلامییەکانیش لەو رایەدا پێچەوانەبن . بڕوانە : مسكويه ، تجارب الامم ؛ ج ١ ، ص ص٤٠١ – ٤٠٢ ؛ أبن الأثير ، الكامل ، ج ٨ ؛ ص٣٤٩ .

(٨١١) بڕوانە : البدليسی ؛ ص ص٣٩ – ٧٦ .

پێتەختەکەی دەهێنێ، ئەوا ناوی ئێستای دەنووسێت کە ( مالامیر )ە، کەچی ناوەکە لەسەردەمی ئیسلامەتی ( ئیذەج )[٨١٢] بووە .

ئەوەی مینۆرسکی کردە پێشرەوی تۆژینەوە ئەکادیمییەکانی بواری مێژووی کورد لە سەردەمی ئیسلامەتی، ئەو لێکۆلینەوەیەی بوو لەبارەی هەردوو بنەماڵەی شەدادی و ئەیوبی لە کتێبە بەنرخەکەی لێکۆلینەوە لە مێژووی قەفقاس .

لەوێدا توانای زانسی مینۆرسکی تا ئەندازەیەك لە هەموو لایەکانییەوە بەدەردەکەوێت ، وەك وەرگێرو ساخکەرەوە و خاوەن لێدوانی بە پێز لە دەستنووسە عەرەبییەکان و دەستنووسی کردبووە سەرشاری لێکۆلینەوەکانی، بەڵام ئەرکێکی زۆری کێشاوە بۆ نووسینەوەی مێژووی بنەماڵەی شەدادی هەر بە دەستنووس وازی نەهێناوە، بەڵکو سەرچاوەگەلی جۆراوجۆری بەکارهێناوە، بە عەرەبی و فارسی و تورکی و ئەرمەنی و جۆرجی و بێزەنتی و ئەبخازی، ئەمە وێرای سەرچاوە رۆژهەلاتناسییەکانی وەك کتێبی بەروومەتی (مێژووی جۆرجیا) ی بروسیەی رۆژهەلاتناسی فەرەنسییە[٨١٣] .

جێی ئاماژە پێکردنە مینۆرسکی ئەو قسانەی وەریان دەگرێت، هەروا وەك خۆی بەکاریان ناهێنێ، بەڵکو لەگەل یەکدی بەراوردیان دەکات[٨١٤] و تێبینەکانی لەسەر ئەو سەرچاوانەی بەکاریان دەهێنێ تۆمار دەکات ، تەنانەت برێ جار رەخنەشیان لێ دەگرێت[٨١٥] .

لە ساخکردنەوەو پەراوێز لێدانی دەقی منجم باشی هەندێ هەڵەی راست کردۆتەوە و هەندێکیشی لەبیرکردووە . منجم باشی دەڵێ: (( سولتان ئەلەب ئەرسەلان ولاتی باب ئەلئەبواب و ئارانی بۆ ساوتکینی گەورە سەرکردە و

---

(٨١٢) یاقوت، معجم البلدان، ج١، ص ص٢٨٨ –٢٨٩؛ ابن بطوطة، رحلة، ج٢، ص٢٣؛ پەراوێزی١٠؛ لسترنج ، بلدان الخلافة ، ص٢٨٠ .

(813) studies، pp. 89-92، 98، 103.

(814) Ibid، PP. 66-91.

(815) Ibid، pp،46،48،58-59،67-68،79،105.

نزیکترین پیاوی دابڕی، ئەویش بە خۆو کۆمەڵێ تورکەوە لە ساڵی ( ٤٦٨ ك / ١٠٧٦ ز ) چووە ئەوێ، کەچی فەزلون ڕازی نەبوو وڵاتەکەی بداتە دەست، ساوتکینیش بۆی چوو ، هەر کە فەزلون زانی ناتوانێت شەڕ بکات و بەرگری بکات ( جەنزەی دارومولکی و شوێنی دیکەی لەوڵاتی ئاران دایە جێگرەکانی سولتان، تورکەکان لە وڵاتی ئاران و چیاو دەشت و هەمووشار و قەڵاتەکانی نیشتەجێبوون و دەولەتی شەدادی شوێنەواریان لەوێ بڕایەوە و هەموو گەنجینەو سەروسامانیان کەوتە دەست تورکان، سەدو سی و هەشت ساڵ فەرمانڕەوایەتیان کرد ...))[٨١٦] .

مینۆرسکی ئاگاداری دوایین قسە بوو لەسەبارەت بە مێژووی کۆتایی هاتنی بنەماڵەی شەدادی، بۆ سەلماندنی ئەمەش، بەشی دووەمی کتێبەکەی بۆ تۆژینەوە لە بەردەوامی فەرمانڕەوایەتی ئەو بنەماڵەیە لە شاری ئانی لەنێوان ساڵانی (٤٥٦ — ٥٩٥ ك / ١٠٦٣ — ١١٩٨ ز ) تەرخان کردبوو. بەڵام هەڵەی دووەمی فەرامۆش کردووەو ئاگاداری ئەو نووسینانە نەبووە کە لە بارەی سولتان ئەلب ئەرسەلانی سەلجووقی نووسراوە[٨١٧]. وەك زانراوە ئەو لەسەرەتای ساڵی (٤٦٥ك /١٠٧٣ ز )[٨١٨] مردووە، ئەدی چۆن دەکرێ هەرێمی ئاران بداتە یەکێك لە نۆکەرەکانی لە ساڵی (٤٦٨ك/١٠٧٦ز).

مینۆرسکی سەرچاوەی ئەرمەنی بەچاکی بەکارهێناوە لە زۆر شوێندا و تەنانەت لەفەسڵی دووەمی کتێبەکەیدا زۆری پشت بە کتێبی فاردانی ئەرمەنی بەستووە و بەکاری هێناوە ، مینۆرسکی خۆی دەڵێت : (( سەبارەت بە لایەنی

---

(٨١٦) بەشێك لە شەدادییە لە کتێبی ( جامع الدول ) ؛ مینۆرسکی لە دووتۆیی کتێبی ( دراسات في التاريخ القوقازی ) ل ١٨ ؛ ساخیکردۆتەوەو بڵاوی کردۆتەوە .

(٨١٧) فرای ڕۆژهەڵاتناسیش قسەی منجم باشی پەیڕەو کردووە . بڕوانە : أران ، دائرة المعارف الاسلامية ، ط ٢ ؛ ج ٢ ؛ ص٥٧٢ . هەروەها ئیسماعیل شوکری تۆژەر . بڕوانە : الشداديون ، ص ص٥٦ — ٥٧ .

(٨١٨) ابن الجوزی ، المنتظم في تأريخ الملوك والأمم . ( الدكن : ١٣٥٧ هـ ) ، ج٨ ، ص٢٧٩ ؛ الحسينی ؛ ص١١٩ ؛ أبن الأثير ، الكامل ، ج ٨ ، ل ١١٢ .

ئەرمەن، ئەوەی کە پێوەندی بە سەردەمی دوادوایی شەدادییەکان تا ساڵی ١٢٦٨ ز وە هەیە ؛ ئەوە فاردان سەرچاوەیەکی بنەرەتییمانە ))[٨١٩] ، بەڵام گلەیی ئەوەی لێ دەکرێت ، کەوا قسەکانی فاردان بەبێ شەنوکەوکردن وەردەگرێت[٨٢٠]، هاوسۆزی خۆشی بۆ مەسیحییەکان ناشارێتەوە ، ئەویش بە بەڵگەی ئەوەی کە دێتە سەرباسی میر مەنوچەهر دەبینین هاوسۆزی بۆ هەڵوێستە سازش و نەرم و نیاکان بەرانبەریان نیشان دەدات[٨٢١] ، کەچی ئاوا لە هەلوێستی توندڕەوانەی میر شاور دەدوێت : (( هاتەوەسەر سیاسەتی دوژمنکارانە))[٨٢٢] .

سەبارەت بە لێکۆلینەوەکەی لەبارەی شەدادییەکانەوە، لەبەر ئەوەی مینۆرسکی زمانی عەرەبی بەچاکی نازانێ، سەرنج دەدەین؛ لە وەرگێڕانی هەندێ دەقدا دەکەوێتە هەڵەوە ، کەئەو دەستەواژەیە وەردەگێڕێت (( مەسعود ئەوەی لە شەڕەکەدا بە سەلامەتی دەرچوو ))[٨٢٣]، لە وەرگێڕانەکەیدا وا تێدەگەین کە مەسعود کەسێکە بۆخۆی ، بەڵام وەك لە مانای دەستەواژەکەدا حالی دەبێت ئەوا مانای وەسف دەدات نەك ناو .

ئەوەی مایەی دەست خۆشییە بۆ مینۆرسکی لە لێکۆلینەوەکانیدا، شەنوکەوکردن و شیکردنەوەی ناوی شوێنە جوگرافییەکانە، کە زانیاری و شارەزایی تایبەتی خۆی تێدا بەکاربردووە و دەرەنجامی بەنرخی لێ کەوتۆتەوە[٨٢٤]، ئەگەر ئەنجامێکی روونیشی وەگیر نەکەوتبێ، ئەوە دان بە

(819) Studies، p.97.
(820) Ibid، pp. 81-86.
(821) Ibid، p. 82.
(822) Ibid، p. 83.
(٨٢٣) بروانە : تأريخ الفاروقى ، کە لە پەراوێزی ئیبنی القلانسی بڵاوکراوەتەوە، ذيل تأريخ دمشق، تحقيق امد روز ، ( بيروت : ١٩٠٨ ) ، ص٣٦١ .
(824) Studies، p. 98.

دەستەپاچەیی خۆی دەنێ[٨٢٥] کە ئەوەش سیمای لێکۆڵینەوە ئەکادیمییەکانیەتی .

ئەوەی ئەو لێکۆڵینەوەی پێ جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە بەتەنیا لە مێژووی ئەو بنەماڵەیەی نەکۆڵیتەوە، بەڵکو لەو بابەتانەشی کۆڵیتەوە کە سەروکاریان پێیەوە هەیەو بە درێژی لێیان دواوە و تیشکی خستۆتە سەر مێژووی جورجی و ئەرمەنی و بیزەنتییەکان لە ناوچەی قەفقاس[٨٢٦]، جائەو تێوردبوونەوە یارمەتی بە تێگەیشتنی لایەنە جیاجیاکانی بنەماڵەی شەدادی بە شێوەیەکی سەرتاپەگیر دەدات .

جێی سەرنجە کە ئاماژە بە لێبوردەیی و هاوسۆزی میرە موسلمانەکان لەگەل مەسیحییەکان دەکات، کەچی باسی نەرم و نیانی ئایینی ئیسلام و لێبوردەیی لەسەر هەلوێستەکانیان ناکات، بەڵکو ئەوە بۆ هۆکاری ئابووری دەباتەوە[٨٢٧] .

لەگەل دەربڕینی ئەو سەرنجانەش سەبارەت بەو لێکۆلینەوەیەی، بەلام هەر بە لێکۆلینەوەیەکی بەنرخ دەمێنێتەوە، رۆژهەلاتناسە گەورەکان دانیان بەنرخی زانستیانەیدا ناوە ، ئەوەتا هاملتون کیی رۆژهەلاتناسی بەریتانی لەبارەیەوە دەلێت: (( پرۆفیسو مینۆرسکی بەئارامی و هێمنی و کارزانییەکی بێ ئەندازەوە مێژووی پەرش و بلاوی قەفقاسی رۆژهەلاتی لەهەردوو سەدەی دەیەم و یازدەیەمی زایینی کۆکردۆتەوە. بنچینەی ئەو لێکۆلینەوەیەش بەشێکی کورتی کتێبێکە بە عەرەبی .... بەلام هەرچی ئەو دەقەیە بەتەنیا شتێکی کەمە، لە زۆربەی کاتدا دەقە عەرەبییەکە ناتەواوەو وردنییە. بایەخی ئەو کتێبە بە چاوپۆشیی لەو زانیارییە جوگرافیایی و مێژووییانەی ناوەرۆکی، ئەوا دەلێین بایەخی لەوەدا بەدەردەکەوێت کە مینۆرسکی لە چۆنیەتی باسکردنی بابەتە جۆراوجۆرەکانی، وەکو قۆزتنەوەی خەلکی بەرزاییەکانی

---

(825) Ibid، p.42.
(826) Ibid، pp. 74-76، 90-106.
(827) Ibid، p. 106.

ئێران ئەو بۆشاییەی لە هەڵوێستی لێبوردەیی بویهیەکان و دەستەپاچیان لە زاڵ بوون بەسەریدا هاتە کایەوە ، چوونی کورد وەکو گەلێکی سەربار بۆ ناو ئەو هەرەمە رەگەزو توخم و رۆشنبیریی و ئاینیانە لە ئەرمینیادا....))[٨٢٨] .

هەروەها لانکی رۆژهەڵاتناسی بەریتانیاش دوای دوانێکی کورت لەبارەی ئەو نووسینەی مینۆرسکی کە لەبارەی شەدادییەکانی نووسیوە دەڵێت: ((مینۆرسکی بە بڵاوکردنەوەو وەرگێڕانی ئەو دەستنووسە .. زانیاری گرنگی دیکەی خستە سەر زانیارییەکانمان ... نووسراوێکی جوان و پڕ زانیاری لەبارەی شەدادییەکان و هاوسێیەکانیان و پاشکۆیەکی بۆ رەچەڵەك و بنەماڵەکان نووسیوە، کە زانیاری زۆری خستە سەر ئەوەی زامباور[٨٢٩] تۆماری کردبوو))[٨٣٠] .

فایری رۆژهەڵاتناسیش دەڵێت : (( مینۆرسکی خزمەتێکی گەورەی کردووە لە رێکخستنەوەی ئەو هەرا و پەشێوی و وێنە سەیر و سەمەرانەی ئەو بەشەی جیهان لەسەردەمی نێوەڕاستدا ... ئەوبەشە تا ئێستاشی لەگەڵدابێت لە دنیادا وروژێنەرو مەیدانێکی سەرنج راکێشی مێژوونووسانە ))[٨٣١] .

سەبارەت بە بنەماڵەی ئەیوبیش مینۆرسکی لە کتێبی لێکۆلینەوە لە مێژووی قەفقاسدا، فەسڵێکی تەواوی لە کتێبەکەدا بۆ تەرخان کردووە ، ئەویش لەئاکامی بڕوای تەواوی بەوەی بنەماڵەی ئەیوبی بەرەسەن، خەڵکی ناوچەی

---

(828) Review of Minorskys studies in Caucasian History، BSOAS، 1955،Vol.XVII ،P.187.

(٨٢٩) ئەدوارد فون زامباوری نەمساوی خاوەنی کتێبی بەنرخی ( فەرهەنگی رەچەڵەك و بنەماڵە فەرمانڕەواکان لە مێژووی ئیسلامیەتیدا ) یە ؛ مینۆرسکی دانی ناوە بەچاکەی ئەو کتێبە (بنەماڵە موسلمانە فەرمانڕەواکان ) ی ستانلی لین پولی رۆژهەڵاتناس . بۆ زانیاری پتر بڕوانە:
Review of Zambaurs Manuel de Gencalogie pour l Historie de la Islam، BSOAS،Vol.L/13 PP.797-802.

(830) Review of Minorskys studies in Caucasian History، JRAS،1954، P.76.

(831) Review of Minorskys studies in Caucasian History، Speuslum، 1954، Vol. xxix، p.301.

قەفقاسن و تیشکی خستۆتە سەر بابەتی دیاریکراوی وا کە سەروکاری بە رەسەن و رەچەڵەکی سەلاحەددین و بنەماڵەکەیەوە هەیە، بۆیە ناوی لە لێکۆلینەوەکە ناوە رێورەچەلەکی بەر لە سەلاحەددین .

دوای خوێندنەوەی هەرچی مینۆرسکی لەو بارەوەی نووسیوە، ئەوا دەردەکەوێت : مینۆرسکی هاوسۆزی بەلای سەلاحەددیندا نییە و هەمان هەڵوێستی هەردوو رۆژهەلاتناس ستانلی لین پول و هاملتون کیی بەرانبەر بە ئاکارو سیاسەتی سەلاحەددین نەبووە[٨٣٢]، مینۆرسکی رەخنەی ئەوە لە رۆژئاواییەکان دەگرێت کە بە سەلاحەددین داخبارن و خۆیان لە کردارەکانی نەبان کردووە. ئاماژەش بە کوشتنی میر رینالدشاتیون ( ئەلبرنس ئەرنات)[٨٣٣] بەدەستی[٨٣٤] سەلاحەددین خۆی دەکات، بەلام ئەوکارە ئەوروپاییەکان بەر لە موسلمانان دەست خۆشیان لێ کرد، چونکە خۆفرۆش بوو مالوێرانی بەسەر خاچپەرستەکاندا هێنا[٨٣٥]، وێرای ئەوەش مینۆرسکی خۆ لە رەفتاری جوامێرانەو لێبوردوویی سەلاحەددین لە سەروبەندی رزگارکردنی قودس لەگەل دیلە خاچپەرستەکان ، دەبوێری .

رەنگە ئەو هەڵوێستەی مینۆرسکی لەوەوە سەرچاوەی گرتبێ کە بەتەواوی پشتی بە ئیبن ئەثیر بەستووە ، ئەویش بە بەڵگەی ئەوەی کە لەهەمان لێکۆلینەوەدا رەخنە لە کیی رۆژهەلاتناس دەگرێت کە گومان لە جێ بروابوونی ئیبن ئەثیر دەگرێت لەو نووسینانەی کە لەسەر سەلاحەددینی نووسیوە؛ کیپش ئەوا وەلامی دەداتەوە و داکۆکی لە لێکۆلینەوەکەی دەکات و دەڵێت: ((زۆربەی

---

(٨٣٢) الملا جاسم ؛ كب ، ص ص١٣١ — ١٤٢ .

(٨٣٣) لەبەر ئەوە سەلاحەددین کوشتی، چونکە چەندین جار بەگژ کاروانی موسلماناندا چوبۆوەو قسەی ناشرینی بە محەمەد پێغەمبەر ( د. خ ) گوتووە و هەولیشیدا دەست بەسەر شاری مەدینەدا بگرێت. بڕوانە: أبن شداد : النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية ؛ تحقيق جمال الدين شيال ، (القاهرة : ١٩٦٤)؛ ص ص٧٧ — ٧٨ ؛ أبن واصل؛ مفرج الكروب؛ ج١، ص ص١٠١ -١٠٢.

(834) Studies، p.107.

(835) N. Daniel، Islam and Medeval Europe، ( London: 1965)، p.197.

قوتابیانی مێژووی ئیسلامەتی لە چاخەکانی ناوەراست لەسەر ئەوە کۆك دەبن کە یەکێ لە گەورەترین کێشەی ئەو بوارە دیاریکردنی ئەو سەرچاوە راستەقینانەیە کە ئیبن ئەثیر بەکاری هێناون و هەلسەنگاندنی شێوازی بەکارهێنانیان لە وتاری ئاماژە پێکراویش[٨٣٦] پوختەکەی پشت بە ژمارەیەکی زۆر نموونەی ورد دەبەستێ کە جەخت لەسەر ئەوە دەکات، کە زۆربەی ئەو زانیاریانەی ئیبن ئەثیر سەبارەت بە سەلاحەددین لە عیمادەدینەوەی وەرگرتوون[٨٣٧] ، راستییەکان دەشێوێنێ ، رەنگە ئەو پوختەیە هەڵەش بێت، بەڵام بەدرۆخستنەوەی پێویستی بەلێکترازانی هەموو بەڵگەکان هەیە، لەسەرێکی دیکەشەوە نەبوونی لایەنگیری تایبەتی سەبارەت بە بابەتەکانی دیکەی کتێبەکەی بە روونی لای ئیبن ئەثیر دیارە ))[٨٣٨] .

جێی سەرنجە کە بوونی ئەو جوداوازییە سەبارەت بە هەڵوێستی ئیبن ئەثیر لە سەلاحەددین لە نێوان لێکۆڵەرەوانی نوێیشدا هەیە[٨٣٩] . هەرچەندە مێژوونووس هەوڵبدا، کەم وایە بتوانێ هەستی لایەنگیری خۆی لە لێکۆلینەوەدا بخاتە لاوە . هەروەها مینۆرسکیش نەیتوانیوە خۆی لە تێکەڵی تایبەتی خۆی لەو لێکۆلینەوەیەی لەمەڕ شەدادییانی نووسیوە ، دوور بگرێ .

---

(٨٣٦) وتارەکەی کپ لەگۆڤاری Speculum, 1950, Volxxv, pp. 58-78. بڵاوبۆتەوە و مینۆرسکیش لەو لێکۆلینەوەیدا رەخنەی لێ گرتووە .

(٨٣٧) عیمادەدین ئەسفهانییە ( لە ٥٩٧ ك / ١٢٠١ ز مردووە ) ؛ لە هەرە نزیکەکانی سەلاحەددین بووە، دوو کتێبی لەبارەی سەلاحەددین و سەردەمەکەی لەپاش بەجێ ماوە ( البرق الشامي والفتح القسي في الفتح القدسي ) ، کە بوونەتە سەرچاوەی هەرە رەسەنی سەردەمی سەلاحەددین . بۆ زانیاری پتر بروانە : حکیم احمد مام بکر ؛ عماد الدين الكاتب الأصفهاني و منهجه التأريخي من خلال كتابه البرق الشامي ، ر. م . غ . الآداب، ( جامعة صلاح الدين / أربيل: ١٩٩٦ ) .

(838) Review, p.187.

(٨٣٩) محسن محمد حسين ؛ أبن الأثير وأحداث عصره وحقيقة موقفه من صلاح الدين الأيوبي ، باسەکە لە گۆڤاری رۆژی کوردستان / شمس کردستان ، ( بەغدا : ١٩٧٥ ) ، ع٢٨، ص ص٦–١٢ ؛ ع٢٩ ؛ ص ص٨ – ١٨ ؛ درید عبدالقادر نوري ، سياسة صلاح الدين في مصر و بلاد الشام و الجزيرة ، ( بغداد : ١٩٧٦ ) ؛ ص ص٢٣ – ٢٨ .

ئـەوەی پێویســتـە بگـوترێ کپی ڕۆژهـەڵاتنـاس بایـەخی لێکـۆڵینەوەی مینۆرسکی نەخستۆتە لاوە، بەڵکو ئاوا لەبایەخداری دەدوێت ((بەشێکی ڕەسەن و بەکەڵکی بەناوی مێژووی بەر لە سەلاحەددین، خستۆتە سەرو تێیدا هۆکارە ئاماژە پێکراوەکانی لە پێوەندی لە گەڵ بنەماڵەی ئەیوبی کە دەچنەوە سەر پەیرەوانی شەدادی و سەلاحەددین خۆشی و بە چەندین دەزووله لەگەڵ زانایەکی زۆرباش کۆی کردوونەتەوە و دوو پاشکۆشی پێوە لکاندوە، یەکەمیان توخمە کوردەکانی لە سوپای سەلاحەددین و ڕەگوڕیشەی هەندێ لە هۆزەکانیان تێدا تۆمار کراوە، کە دەکرێ زۆرتریشی بخرێتە سەر، بەڵام ئەوەی نووسیوویەتی تەواوەو لێدوانەکانیشی یەکجار بایەخدارن ))[٨٤٠] .

کپ لە هەلسەنگاندنەکەی بەردەوام دەبێت و دەڵێت (( هەرچی پاشکۆی دووەمە باس لە فراوانخوازی ئەیوبیەکان بەرەو ڕۆژهەڵات دەکات ، کە ڕەنگە لە بەرچاوخستنەکەی هەندە ڕۆمانسیانە نەبێت ... بەڵام وای دەبینین کە ئەوە جگە لەسیاسەتێکی واقیعی بۆ بەرگریکردن لە سەر زەمینەکانی شام نەبێت ... پێویستە ڕەچاوی ململانێی نێوان هێزەکان لە ناوچەکەو ناکۆکی ناوەخۆی نێوان میرە ئەیوبییەکان بکەین ))[٨٤١] .

ئـەوەی جێی گومــان نییە ئەوەیـە، ئەو پاڵنـەرە پەنامەکییانــەی، کـە مینۆرسکی ئاماژەی پێ کردوون و ئەو هۆکارانەی کە کپیش دیاریان دەکات نەخشیان لە جموجۆڵی ئەیوبییەکان بەرەو ڕۆژهەڵاتەوە هەبووە .

لانکی ڕۆژهەڵاتناسیش لە هەلسەنگاندنی لێکۆڵینەوەکەی مینۆرسکی ئاوا سەرکلۆمی دەکات و دەڵێت : (( مینۆرسکی چارەسەری بڕێ کێشەی کردووە ، کەچی بایەخی مێژوونووسانی پسپۆری وڵاتی ئێران و قەفقاس بوون ... هەروەها جێی بایەخی پسپۆرانی زانستی ( النميات ) و جوگرافیناسانیش بوو))[٨٤٢] .

---

(840) Studies. pp. 116-124.
(841) Review. p. 187.
(842) Review. p.77.

لە دوادواییدا مینۆرسکی بەشێوەیەکی زۆرباش لە لایەنە جۆراوجۆرەکانی ڕێورەچەڵەکی سەلاحەددین و بنەماڵەکەی تۆژیوەتەوەو بە بەڵگەی جۆراوجۆر سەلماندوویە، کە لەناوچەی قەفقاس سەریان هەڵداوە و هەڵسوکەوت و سیاسەتیان لە میسرو وڵاتی شام هاوشێوەی بنەماڵەی شەدادییەکان بوو(٨٤٣).

**پێنجەم : هەڵوێستی خەڵك بەرانبەر مینۆرسکی و لێکۆڵینەوەکانی :**

جێی خۆیەتی لێرە تێڕوانینی تۆژەر و ڕۆژهەڵاتناسان لە هەمبەر سەلاحەددین و لێکۆڵینەوەکانی بزانین ، بۆ ئەوەی بزانین برادەرە ئێرانییەکانی چۆنیان سەیر کردووە(٨٤٤) .

سەبارەت بە پایەی زانستی مینۆرسکی سەیدحەسەن تەقی زادەی کۆنە هاوڕێی دەڵێت : هاوشێوەی مینۆرسکی لەناو ڕۆژهەڵاتناسان دەگمەنن، نەخاسما لە بواری ئێراناسیدا(٨٤٥) . مجتەبی مینوی هاوڕێشی لە چلەیدا دەڵێت: (( بە مردنی مینۆرسـکی گـەورەترین و زانـاترین ڕۆژهەڵاتـناس کـۆچی کـرد ... کـۆڕی ڕۆژهەڵاتناسی نەخوازە لەبواری ئێراناسیدا ، بەچۆڵی مایەوە))(٨٤٦) .

هەروەها هەموو هاوڕێ ئێرانییەکانی گەواهی نەفەس بەرزی بۆ لێ دەدەن، لەژیاندا سادەوساکار بووە، ئەوەندە بەتەنگ دەسکەوتی مادییەوە نەبووە لە لێکۆڵینـەوەو کـارە جـۆراوجـۆرەکـانییەوە سـەوداسـەرو خزمەتکاری زانست بوو(٨٤٧) .

---

(843) Review، p.187.

(٨٤٤) جێی سەرنجە کە قسەی ئەو برادەرە ئێرانیانەی زێدەڕۆیی تێدایە و هەست و سۆزی برادەرایەتی تێدا زاڵە .

(٨٤٥) در رثای ، ص ص٧ – ٨ .

(٨٤٦) یاد برفیسور . ص١٥ .

(٨٤٧) بڕوانە : کارنك ، ملاقات با مینورسکی ، ص ص٩٨ – ١٠٠ ؛ جهانبهانی برفیسور ولادیمیر ، ص١٦٣ ؛ مینوی، بیاد برفیسور ، ص ص١٤ – ١٥ ؛ غلامحسین یوسفی، یادی از مینورسکی، مقال منشور فی مجلة برکهایی درأغوش آباد، (تهران : ١٣٧٢ – هـ . ش) ، ج٢، ص ص٨٦١ – ٨٦٦ .

لانكي رۆژهه‌ڵاتناس ئاوا رای خۆی ده‌رده‌برێت و ده‌ڵێت : كه‌من له‌و زانا ناودارانه‌ ئه‌وه‌نده‌ زانابن و ساكار و دڵسۆزیش بن ... من باشم له‌بیره‌ له‌و كاته‌ی كه‌ تازه‌ خه‌ریكی لێكۆڵینه‌وه‌ی پاره‌ی قه‌فقاسی بووم ، مامۆستا مینۆرسكی ئه‌و رۆژنامه‌ سۆڤێتیانه‌ی بۆ ده‌ناردم كه‌ باسیان له‌ دۆزینه‌وه‌ی گرنگی پاره‌ی كۆن له‌گه‌ڵ زانیاری دیكه‌ كه‌ له‌ شوێنی دیكه‌ ده‌ست نه‌ده‌كه‌وتن ))(٨٤٨) .

ئه‌ . س . تریتونی رۆژهه‌ڵاتناس، كه‌ ماوه‌یه‌ك له‌گه‌ڵ مینۆرسكی ژیاوه‌ ده‌ڵێت : (( شتی هه‌ره‌ مه‌زنی مینۆرسكی ئه‌وه‌بوو ، پێوه‌ندی به‌ هیچ لایه‌كه‌وه‌ نه‌بوو ، حه‌زی ده‌كرد له‌ كۆڕ و كۆبوونه‌وه‌ ئه‌كادیمییه‌كان ئاماده‌ بێت ))(٨٤٩) .

ج. بمویلی رۆژهه‌ڵاتناسی قوتابی مینۆرسكیش له‌ رۆژنامه‌ی تایمسی به‌ریتانی له‌ ماڵئاوایی مامۆستاكه‌یدا ده‌نووسێ : (( قوتابی بواری توركناسی یان مه‌غولی پتر قه‌رداری مینۆرسكین تا قوتابیه‌كی ئێرانناسی ... زانیارییه‌كانی بارته‌قای به‌برشتی به‌رهه‌مه‌كانی بوو ))(٨٥٠) .

ئه‌دموندزی رۆژهه‌ڵاتناسیش رای خۆی سه‌باره‌ت به‌ كاره‌كانی مینۆرسكی ئاوا ده‌رده‌برێ: ((ژماره‌یه‌كی زۆری وتار له‌ ئینسكلوپیدیای ئیسلام و گۆڤاره‌كانی كۆمه‌ڵه‌ زانستییه‌كانیدا هه‌یه‌ ، كه‌له‌ زانیاری و شاره‌زای فراوانی له‌باره‌ی خوارووی كوردستانه‌وه‌ ده‌سه‌لمێنن و به‌ سه‌رچاوه‌یه‌كی سه‌ربه‌خۆی ئه‌و بابه‌ته‌ داده‌نرێت ))(٨٥١) .

م.س. لازاریفی رۆژهه‌ڵاتناسی رووسیش سه‌باره‌ت به‌ لێكۆڵینه‌وه‌كانی مینۆرسكی له‌ بواری كوردناسیدا ده‌ڵێت: (( كاره‌كانی مینۆرسكی له‌باره‌ی كوردستان قووڵترین و وردترین لێكۆڵینه‌وه‌ن ))(٨٥٢) .

ئارشاك پۆلادیانی رۆژهه‌ڵاتناسی ئه‌رمه‌نی ئاوا كاره‌كانی مینۆرسكی ده‌نرخێنێ : (( وتاری ( كوردستان و كورد ) ی مینۆرسكی كه‌ بۆ

(848) The obituary، p. 699.
(849) Ibid. p. 698.
(850) 28 - March 1966.

(٨٥١) كرد و ترك و عرب ، ص٣١ .
(٨٥٢) كێشه‌ی كورد ، ل ١٨ .

ئینسکلوپیدیای ئیسلامی نووسیوه، تا ئەورۆکەشی لەگەڵدابێت جێی بایەخی پسپۆرانی بواری کوردەوانیین. سەرباری تۆژینەوەی لە بواری مێژووی بنەماڵەیی و زمان و ئەدەب و ئەوانی دیکەش، ئەوا مینۆرسکی لە وەسفی سەردەمی نێوان هەردوو سەدەی حەوتەم و دەیەمی — زایینیدا پشت بە زانیارییەکانی بەلازەری و تەبەری و مەسعودی و ئیستەخری و ئیبن حەوقەل و ئیبن ئەثیر و ئەوانی دیکە ... دەبەستێت ))[٨٥٣].

پ. ئی. ڤاسیلیڤای رۆژهەڵاتناسی رووسیش لە نامەیەکدا بۆ تۆژەر سەبارەت بە هەلسەنگاندنی کارەکانی مینۆرسکی دەڵێت: (( مینۆرسکی زانایەکی بەرزە ، ئەو بوو بەشێوەیەکی زۆر چاك مێژووی کوردی لە سەدەکانی نێوەڕاست پێناساندین ، وتارەکانی لە ئینسکلوپیدیای ئیسلام لە بارەی کورد و کوردستان بنچینەی ناسینی ئێمەیە بۆ مێژووی کورد لە سەدەکانی نێوەڕاستدا، لە وتارەکانیدا باسی هۆزە کوردەکان و زمان و ئایینیان دەکات. مینۆرسکی کوردی خۆش دەویست ))[٨٥٤]. بەڵام لە هەمان کاتدا هەندێ لایەنیشی بەدڵ نەبوو .

لە نامەیەکی تایبەتی عەبدولعەزیز دوری ئاوا پەسنی مامۆستاکەی دەدات:((مینۆرسکی مامۆستاو یەکە پسپۆری بواری ئێراننناسییە و لەوتەکەی ئەو لێکۆلینەوانەبوو. لێکۆلینەوەی باشی لەمەڕ کورد کردووە، وتارێکی درێژی لە ئینسکلوپیدیای ئیسلام ( چ١ )دا هەبوو . لە تۆژینەوەکانیدا بابەتی و قوول و بێ لایەن بوو . لە درێژەی سەروکارم لەگەڵیدا، هەستم بە دڵنیایی رێبازی ئەکادیمیانەی و شێوازی زانستیانەی کردووە، دوور لە گۆترەکاری[٨٥٥])) .

---

(٨٥٣) الاكراد حسب المصادر العربية، ترجمة خشادور قصباريان و عبدالكريم ابازيد (يريڤان: د.ت)، ص ص١٢ .

(٨٥٤) نامەیەکی تایبەتی لە رۆژهەڵاتناسەوە بۆ تۆژەر لە ١٦ ی شوباتی ٢٠٠٠ . بڕوانە: پاشکۆ .

(٨٥٥) نامەیەکی تایبەتی لە ٢٤ی نیسانی ٢٠٠٠.

## کورتەو دەرەنجامەکان :

دوای ئەو گەشتە لەگەڵ مینۆرسکی و نووسراوەکانی، پێویستە هەڵوەستەیەك بکەین بۆ لێرامان و پوختەیەك هەلێنجین بۆئەوەی سەرەداوی سەرەکی تایبەتیی کارەکانی دەربخەین :

**یەکەم** : مینۆرسکی لەباوەشی رۆژهەلاتناسی رووسیدا وەك تۆژەر هاتە مەیدان ، سیاسەتیش هۆکاری سەرەکی بوو، کە خۆی لە بەرژەوەندییەکانی رووسیا لە وڵاتی قەفقاس و ئاسیای بچووك و ئێران دەبینییەوە . کاری دبلۆماسییانەی مینۆرسکی لە ئێراندا، بایەخێکی زۆری هەبوو، بۆ ئەوەی مینۆرسکی رووەو سیاسەت بچێ . کارە بەراییەکانی ، نووسینی راپۆرتی سیاسی بوو وەك ئەو راپۆرتانەی هەر فەرمانبەرێکی بواری دبلۆماسی بۆ حکومەتەکەی دەینێرێ . بایەخدانیشی بەکورد هەر لەبنجدا لە پێویستی سیاسی وڵاتەکەیەوە سەرچاوەی دەگرت، کە هاوسنووری ناوچەکانی وەك ئازەربایجان و ئێران بوو کە زۆرینەی کوردبوون .

**دووەم**: مینۆرسکی لە پێکهاتەو رێبازیدا رۆڵەی رۆژهەلاتناسی رووسی بوو، توانی چەندین زمانی رۆژهەلاتی و رۆژئاوایی بزانێت، ئەوە سەرباری وردی و بەورەیی و هێوری و ئارامی و وێرای تواناو ئاوەز زیندوویی .

**سێیەم** : مینۆرسکی توانی ئەوە بەدەست بێنێ کە رووس نەیتوانی بەدەستی بێنێ، ئەویش دەرچوونی بوو لە قەپێلکی سیاسی خۆی ، بازیدا بۆ جیهانی ئەکادیمی رووت و رزگاربوونی لە دەروێشایەتی کردن بۆ سیاسەت و سیاسییەکان، لەئاکامی سەرهەڵدانی شۆرشی ئوکتۆبەر و کۆچکردنی بۆ فەرەنسا و پاشان بۆ بەریتانیا . لە قەپێلکی رووسیانەشی دەرچوو، لەو کاتەی کە هەنگاوی بارتولدی مامۆستای گرتەبەر و خۆی بەجیهانی رۆژئاوا ناساند، کە بەتوانای هەلاوێردەی شاگەشکەبوون و نەیانتوانی هاوشانێکی وەك ئەو پەیدابکەن. بۆیە بەدرێژایی ژیانی بالادەستی ئەویان سەلماند .

**چوارەم:** بەڵام ئەو لێك دابڕان و پچڕان و ترازانە مانای ئەوە نەبوو ئیدی مینۆرسکی لە ویژداندا لە ولاتەکەی دابڕاوە ، رووسیاو بەرژەوەندییەکانی جێی بایەخ و تەوەری مێشکی مینۆرسکی بوون بەبەڵگەی:

١- رەتکردنەوەی وەرگرتنی رەگەزنامەی بەریتانی و لەخۆشی و ناخۆشیشدا لەبیری ولاتەکەیدا بووە .

٢- بەردەوام سەروسۆراخی چالاکی تۆژینەوەی رووسییەکانی لە بواری لێکۆلینەوەی رۆژهەلاتناسیدا کردووە .

٣- هەروەها کارە تایبەتییەکەی لە چوارچێوەی پێشووی، کە رۆژهەلاتناسی رووسی دیاری کردبوو.

**پێنجەم:** بەهەر رەوشتێکدا بگری کارەکانی لە مەیدانی کوردناسیدا بایەخێکی زۆریان هەیە ، پێشەنگی ئەو رووسیانە بوو کە کارەکانیان لەو بابەتەوە بەزمانی فەڕەنسی و ئینگلیزی و ئەلمانی بلاوکردۆتەوە ، وەستۆگرتنی نووسینی هەردوو وتارەکەی لەبارەی کورد و کوردستان لە ئینسکلوپیدیای ئیسلامدا گەوا هینامەی زانایەکی ئەکادیمی رۆژئاوایە بۆ ئەو.

**شەشەم:** بۆ مینۆرسکی لوا هەرچی باشترین زانیاری بۆ لێکۆلینەوە لەمەڕ کورد کە بۆ زانایەکی ئەکادیمی پێویستی راستەوخۆی ناوچەکە و جوگرافیاو خەڵکەکەی کۆبکاتەوە و زانیارییەکی زۆری لە مێژوو و بیروباوەڕو سیما شارستانییەکانی کورد هەبوو ، هەموو ئەوەش کاری وای لێکەوتەوە کە بەکاری تۆژینەوەولێگەڕان و بەدواداچوون بێن ،کە ببێتە نموونە بۆ تۆژەرە هاوچەرخەکان، روونتریش دوای ئەوەی مەبەستی سیاسی بۆ نووسینی لەئارادا نەما و کاری بووە مەبەست ئەکادیمییە .

**حەوتەم:** لەگەل سەلماندنی هەموو ئەمانەی پێشوو ، بەلام ناتوانین بڕوا بە هەموو ئەونووسینانەی مینۆرسکی نووسیوویەتی سەبارەت بە مێژووی کورد و ئەو وێنەو روخسارەی نەخشاندوویەتی ، لەگەڵ بایەخیشی، ئەوە وێنەیەکی

ڕۆژئاوایە و بێ گومان دووچاری پێشینەی ئایینی و سیاسی و کۆمەڵایەتی بووە، کە شوێنەواری لەسەر هەموو چالاکییەکی هزری ڕۆژئاوادا هەبوو ، هەرچەندە خاوەنەکەی هەوڵی بابەتی بوونیشی داوە، بەواتای ئەوەی کە نووسینەکانی لە ژینگەیەکی ڕۆژئاوایی سەرچاوەی گرتووە و لەبازنەی دۆخی هزری ڕۆژئاوای مەسیحییەتدا دەخولێتەوە، کە بەو شێوە یا شێوەیەکی دی وێنەیەکی ڕاستەقینەی جیاوازی نیشاندا.

**هەشتەم**: توانای هەر ئادەمیزادێك هەرچەند مەزنیش بێت ، ئەوا توانایەکی سنووردارە ، لەگەل بەبڕشتی بەرهەمەکانی و جۆراوجۆریشی ، دەبێ شارەزای جۆراوجۆری لەولایەنە جیاجیانەوە هەبێت کە جێی بایەخییەتی . دەبینین لەبواری لێکۆلینەوەی عەرەبیدا لاوازە ، هەروەها کەوتۆتە هەڵە و شاشی وا کە لە دووتۆیی تۆژینەوەکەیدا ئاماژە بە هەڵە دیارەکان کرا .

# لیستی سەرچاوەکان

## یەکەم: دەستنووسەکان

العمري. شهاب الدين احمد بن يحيى بن فضل الله (ت ٧٤٩هـ/١٣٤٨م)

١- مسالك الابصار في ممالك الأبصار. مخطوط مصور عن نسخة مكتبة أحمد الثالث. طوبقا بوسراى - استانبول. اصدار فؤاد سزكين. المجمع العلمي العراقي. رقم(٣٠٠/٢٩٠جـ).

## دووەم: سەرچاوە عەرەبی و بەعەرەبی کراوەکان

ابن الأثير. عزالدين أبي الحسن علي بن محمد بن عبد الكريم الجزري(ت٦٣٠هـ/١٢٣٢م).

٢- التأريخ الباهر في الدولة الأتابكية بالموصل. تحقيق عبد القادر طليمات. (القاهرة:١٩٦٣م).

٣- الكامل في التأريخ. دار الفكر. (بيروت: ١٩٧٨م).

الأ صطخري. أبو إسحاق محمد بن إبراهيم الفارسي(ت بعد ٣٤٠هـ/٩٥١م)

٤- كتاب الأقاليم. تحريرج. موللر. (د.م.ت).

٥- مسالك الممالك. مطبعة بريل. (ليدن: ١٩٢٧م)

الأصفهاني. حمزة بن الحسين(ت٣٦٠هـ/٩٧٠م)

٦- تاريخ سني ملوك الأرض والأنبياء. منشورات دار مكتبة الحياة. (بيروت. ١٩٦١م).

الأنصاري. شمس الدين أبوعبد الله محمد شيخ الربوة (ت ٧٢٧هـ/١٣٢٦م)

٧- نخبة الدهر في عجائب البر والبحر. تصحيح اغسطس بن يحيى. (لايبزك: ١٩٢٣م).

البدليسي. شرفخان (ت١٠١٠هـ/١٦٠١م)

٨- الشرفنامه في تأريخ الدول والإمارات الكردية. ترجمة وتعليق ملا جميل بندى رۆژبەیانی. مطبعة النجاح. (بغداد: ١٩٥٣م) .

ابن بطوطة. أبوعبد الله محمد بن عبدالله اللواتي الطنجي(ت٧٧٩هـ/١٣٧٧م) .

٩- رحلة ابن بطوطة أوتحفة النظار في غرائب الأمصار وعجائب الأسفار. تقديم وتحقيق عبد الهادي التازي. مطبعة المعارف الجديدة. (الرباط: ١٩٩٧م).

البلاذري. أحمد بن يحيى بن جابر(ت. ٢٧٩هـ/٨٩٢م).

١٠- فتوح البلدان. نشره ووضع ملاحقه وفهارسه صلاح الدين المنجد. مكتبة النهضة المصرية. (القاهرة. د.ت).

البنداري. قوام الدين الفتح بن علي بن محمد الأصفهاني(ت٦٤٣هـ/١٢٤٥م).

١١- تأريخ دولة آل سلجوق. تحقيق لجنة احياء التراث العربي في دار الآفاق الجديدة. (بيروت: ١٩٨٠م).

التطيلي، بنيامين بن يونة النباري الأندلسي(ت بعد٥٦٩هـ/١١٧٤م)
١٢- رحلات بنيامين. ترجمة وتعليق عزرا حداد،المطبعة الشرقية،(بغداد: ١٩٤٥م).
ابن الجوزي،أبو الفرج عبد الرحمن بن علي(ت٥٩٧هـ/١٢٠٠م)
١٣- المنتظم في تاريخ الملوك والأمم،مطبعة دائرة المعارف الإسلامية،الطبعة الأولى،(الدكن:١٣٥٧هـ).
الحسيني، صدر الدين علي بن ناصر(ت بعد٦٢٢هـ/١٢٢٤م).
١٤- زبدة التواريخ اخبار الامراء والملوك السلجوقية. تحقيق محمد نورالدين،دار إقرأ، الطبعة الثانية،(بيروت: ١٩٨٦م).
ابن حوقل،أبو القاسم النصيبي(ت ٣٦٧هـ/٩٧٧م)
١٥- صورة الأرض،الطبعة الثالثة،منشورات دار مكتبة الحياة،(بيروت: ١٩٧٩م).
ابن خرداذبة، ابو القاسم عبيد الله بن عبد الله (ت حدود ٣٠٠هـ/٩١٢م)
١٦- المسالك والممالك،(بريل: ١٨٨٩م)، اعادت طبعه بالأوفسيت مكتبة المثنى ببغداد.
ابن خلكان، ابو العباس شمس الدين احمد بن محمد(ت٦٨١هـ/١٢٨٢م).
١٧- وفيات الأعيان وأنباء أبناء الزمان. تحقيق إحسان عباس،دار الثقافة، (بيروت: ١٩٧٩م).
ابو دلف الخزرجي،مسعر بن مهلهل، (ت بعد٣٨٤هـ/٩٩٤م)
١٨- الرسالة الثانية، عني بنشرها والتعليق عليها بطرس بولغاكوف وانس خالدوف. دار النشرللآداب الشرقية،(موسكو: ١٩٦٠م).
الزبيدي، محب الدين ابن السيد محمد مرتضى الحسيني الواسطي(ت١٢٠٦هـ/١٧٩١م)
١٩- تاج العروس من جواهرالقاموس،الطبعة الأولى،المطبعة الخيرية،(القاهرة: ١٣٠٦هـ)
ابن شداد،ابو المحاسن بهاء الدين يوسف بن رافع الأسدي(ت٦٣٢هـ/١٢٣٤م)
٢٠- النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية. تحقيق جمال الدين شيال،(القاهرة: ١٩٦٤م).
أبو الفداء، عماد الدين اسماعيل بن محمد بن عمر(ت٧٣٢هـ/١٣٣١م)
٢١- تقويم البلدان، نشر وتصحيح رينود وماك كوكين ديسلان،دار الطباعة السلطانية،(باريس: ١٨٤٠).
القزويني، زكريا بن محمد بن محمود،(ت٦٨٢هـ/١٢٨٣م).
٢٢- آثار البلاد وأخبار العباد، دار صادر،(بيروت: د.ت).
ابن القلانسي، ابويعلي حمزة،(٥٥٥هـ/١١٦٠م).
٢٣- ذيل تاريخ دمشق، تحقيق امدروز، مطبعة الآباء اليسوعيين،(بيروت: ١٩٠٨)
القلقشندي، أبو العباس أحمد بن علي(ت٨٢١هـ/١٤١٨م)

٢٤- صبح الأعشى في صناعة الإنشاء، شرح وتعليق يوسف علي طويل. دار الكتب العلمية، الطبعة الأولى. (بيروت: ١٩٨٧م).

ماركوبولو. (ت٧٢٣هـ/١٣٢٣)

٢٥- رحلات ماركوبولو، تعريب عبد العزيز جاويد. الهيئة المصرية العامة للكتاب. (مصر: ١٩٧٧م).

المسعودي. أبو الحسن علي بن الحسين(ت٣٤٦هـ/٩٥٦م)

٢٦- التنبيه والإشراف، منشورات دار مكتبة الهلال. (بيروت: ١٩٨١م).

٢٧- مروج الذهب ومعادن الجوهر، شرح وتقديم محمد مفيد محمد قميحة. دار الكتب العلمية، الطبعة الأولى. (بيروت: ١٩٨٦م).

مسكويه، أبو علي محمد بن احمد بن يعقوب(ت٤٢١هـ/١٠٣٠م)

٢٨- تجارب الأمم وتعاقب الهمم، عني بنشره وتصحيحه هـ. ف. امدروز. مطبعة شركة التمدن الصناعية. (مصر: ١٩١٤م).

المقدسي، أبو عبد الله شمس الدين محمد البشاري(ت٣٧٥هـ/٩٨٥م)

٢٩- احسن التقاسيم في معرفة الأقاليم، مطبعة بريل، الطبعة الثانية. (ليدن: ١٩٠٩).

المقريزي، تقي الدين أحمد بن علي(ت٨٤٥هـ/١٤٤١م)

٣٠- السلوك لمعرفة دول الملوك، تحقيق محمد عبد القادر عطا، دارالكتب العلمية، الطبعة الأولى. (بيروت: ١٩٩٧م).

منجم باشي، أحمد بن لطف الله (ت١١١٣هـ/١٧٠٢م).

٣١- باب في الشدادية من كتاب جامع الدول، عني بتحقيقه ونشره مينورسكي ضمن كتابه Studies in Cucasian History.(London: 1953).

الهمداني، رشيد الدين فضل الله(ت٧١٨هـ/١٣١٨م)

٣٢- جامع التواريخ، ترجمة محمد صادق نشأت وفؤاد عبد المعطي الصياد. دار احياء الكتب العربية. (القاهرة: د ت).

ابن واصل، جمال الدين محمد بن سالم(ت٦٩٧هـ/١٢٩٨م)

٣٣- مفرج الكروب في أخبار بني أيوب، تحقيق جمال الدين شيال. مطبعة جامعة فؤاد الأولى. (القاهرة: ١٩٥٣م).

ياقوت الحموي، شهاب الدين بن عبد الله(ت٦٢٦هـ/١٢٢٩م)

٣٤- معجم البلدان، دار صادر. (بيروت، د ت).

## سێیەم: سەرچاوە فارسییەکان

حمد الله المستوفي. أبوبكر بن أحمد بن نصر القزويني. (ت٧٥٠هـ/١٣٤٩م)

٣٥- نزهة القلوب. بكوشش محمد دبير سياقي. كتابخانه طهوری. (تهران: ١٣٣٦هـ.ش).

أبودلف الخزرجي. مسعر بن مهلهل (ت بعد٣٨٤هـ/٩٩٤م)

٣٦- سفرنامه ابو دلف درايران در٣٤١هجری. با تعليقات وتحقيقات ولاديمير مينورسكي. ترجمه سيد ابوالفضل طبا طبايي. كتاب فروشی زوار. چاپ دوم. (تهران: ١٣٥٤هـ.ش).

سميعا. ميرزا (ت بعد١١٤٢هـ/١٧٣٠م)

٣٧- تذكرة الملوك. بكوشش محمد دبير سياقي. وسازمان اداری حكومت صفوی با تعليقات مينورسكي. ترجمة مسعود رجب نيا. مؤسسةانتشارات أمير كبير. چاپ دوم. (تهران: ١٣٦٨هـ.ش).

شبانكاره ای. محمد بن علي بن محمد (ت بعد٧٣٣هـ/١٣٣٢م)

٣٨- معجم الأنساب. تصحيح مير هاشم محدث. مؤسسة انتشارات أمير كبير. چاپ دوم. (تهران: ١٣٧٦هـ.ش).

مؤلف مجهول. (ت٥٢٠هـ/١١٢٦م)

٣٩- مجمل التواريخ والقصص. تصحيح ملك الشعراء محمد تقي بهار. چاپخانه خاور. (تهران: ١٣١٨هـ.ش)

## چوارەم: سەرچاوە ئینگلیزییەکان

40- Hudud Al Alam, Translated and Hudud Explained By V. Minorsky, (London:1937 ).

41- Persian text Tadhkirat al-Muluk Amanual of Safavid Administration(circa1137-1725),TranslatedandExplainedByV. Minorsky. (London: 1943).

42- Sharaf AL-Zaman Tahir Marvazi: on China, The Turks and India. (London:1942).

## پێنجەم: نامەی زانکۆیی

ب. بە عەرەبی

احمد. كاوە فريق

٤٣- امارة بادينان ١٧٠٠-١٨٤٢م دراسة سياسية اجتماعية ثقافية. رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى كلية الآداب. (جامعة صلاح الدين/اربيل: ١٩٩٨م).

آميدی. كرفان محمد أحمد

٤٤- الملك الأشرف موسى بن الملك العادل الأيوبي دوره وأثره في الدولة الأيوبية. رسالة ماجستير غير منشورة. مقدمة إلى كلية الآداب. (جامعة صلاح الدين/أربيل: ١٩٩٩م).

توفيق، زرار صديق

٤٥- الكرد في العصر العباسي حتى مجئ البويهيين،رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة إلى كلية الآداب،(جامعة صلاح الدين/اربيل: ١٩٩٤م).

٤٦- كردستان في القرن الثامن الهجري،رسالة دكتوراه غير منشورة،مقدمة الى كلية الآداب،(جامعة صلاح الدين/أربيل: ٢٠٠٠م) .

الداودي، رمضان شريف

٤٧- لورستان الكبرى ٥٥٠-٨٢٧هـ/١١٥٥-١٤٢٣م. رسالة ماجستير غيرمنشورة، مقدمة إلى كلية الآداب،( جامعة صلاح الدين/أربيل: ١٩٩٤م).

رسول، إسماعيل شكر

٤٨- الشداديون في بلاد اران،رسالة ماجستير غيرمنشورة، مقدمة الى كليةالآداب،(جامعة صلاح الدين/اربيل: ١٩٩٠م).

الشواني، كريم نجم خضر

٤٩- الكاكائية أصولها وعقائدها،رسالة ماجستير غيرمنشورة، مقدمة الى كلية الشريعة،(جامعة بغداد: ١٩٨٩م)

شوبل، فوزي خلف

٥٠- تغلغل النفوذ الأمريكي في إيران،رسالة دكتوراه غير منشورة،مقدمة الى كلية الآداب، (جامعة بغداد: ١٩٩٠م).

طه، صلاح الدين أمين

٥١- الحياة العامة في أرمينية،رسالة دكتوراه غير منشورة،مقدمة الى كلية الآداب،(جامعة بغداد: ١٩٧٩م).

عزت، فائزة محمد

٥٢- الكرد في اقليم الجزيرة وشهرزور في صدر الاسلام،رسالة ماجستير غيرمنشورة، مقدمة الى كليةالآداب،(جامعة صلاح الدين/ اربيل: ١٩٩١م).

كاظم، سلامة حسين

٥٣- التبشير في العراق وسائله وأهدافه، رسالة ماجستير غيرمنشورة،مقدمة الى كلية الشريعة،(جامعة بغداد: ١٩٨٥م) .

مام بكر، حكيم أحمد

٥٤- عمادالدين الكاتب الأصفهاني ومنهجه التأريخي من خلال كتابه البرق الشامي، رسالة ماجستير غير منشورة،مقدمة الى كلية الآداب، (جامعة صلاح الدين/اربيل: ١٩٩٦م).

محمود، أحمد عبد العزيز

٥٥- الهذبانيون في آذربيجان وأربل والجزيرة الفراتية، رسالة ماجستير غيرمنشورة، مقدمة الى كليةالآداب، (جامعة صلاح الدين/أربيل: ١٩٩٠م).

الملاجاسم، ناصر عبد الرزاق

٥٦- المستشرق هاملتن كب دراسة نقدية لتطور مواقفه من التأريخ والحضارة العربية الإسلامية. رسالة دكتوراه غير منشورة، مقدمة الى كلية الآداب، (جامعة الموصل: ١٩٩٨م).

النقشبندي، حسام الدين علي غالب

٥٧- الكرد في الدينور وشهرزور خلال القرنين الرابع والخامس الهجريين، رسالة ماجستير غيرمنشورة، مقدمة الى كلية الآداب، (جامعة. بغداد: ١٩٧٥م).

٥٨- آذربيجان دراسة سياسة حضارية، رسالة دكتوراه غير منشورة، مقدمة الى كلية الآداب، (جامعة بغداد: ١٩٨٤م).

هرزاني، نوري ياسين

٥٩- الكاكائية دراسة أنثروبولوجية، رسالة ماجستير غيرمنشورة، مقدمة الى كلية الآداب، (جامعة بغداد: ١٩٨٥م).

### ب. به كوردى

محمد، رمزية صابر

٦٠- حوزني موكرياني نووسەرو رۆژنامەنووس، رسالة ماجستير غيرمنشورة، مقدمة الى كليةالآداب، (جامعة صلاح الدين/اربيل: ١٩٩٣ز).

### ج. به فەرەنسى

Omar, Mohsen Ahmed.

61- Les Voyageurs Francais Au Kurdistan XV11e XV111 eX 1X e Siecles. رسالة دكتوراه غير منشورة، مقدمة الى جامعة سوربون، (باريس: ١٩٩٦م).

## شەشەم: مەراجيع

### أ. به عەرەبى و به عەرەبيكراوەكان

أحمد، جمال رشيد، الدكتور

٦٢- لقاء الأسلاف الكرد واللان في بلاد الباب وشروان، دار رياض الريس للكتب والنشر، الطبعة الأولى، (لندن: ١٩٩٤م).

أحمد، كمال مظهر، الدكتور

٦٣- كردستان في سنوات الحرب العالمية الأولى. (بغداد: ١٩٨٤م).

أدمونز، س. ج

٦٤- كرد وترك وعرب سياحة ورحلات وبحوث عن الشمال الشرقي من العراق (١٩١٩-١٩٢٥م). ترجمة جرجيس فتح الله. ( بغداد: ١٩٧١م).

باقر، طه وفؤاد سفر

٦٥- المرشد إلى مواطن الآثار، الرحلة الثالثة. (بغداد: ١٩٦٥م).

بولاديان، الدكتور أرشاك

٦٦- الأكراد حسب المصادر العربية، ترجمة خشادور قصباريان و عبد الكريم أبا زيد، (يريفان: د.ت).

بولارد، س. ر، الدكتور

٦٧- بريطانيا والشرق الأوسط من أقدم العصور حتى عام (١٩٥٢م). ترجمة حسن أحمد السلمان. (بغداد: ١٩٥٧م).

بيربالي، فرهاد الدكتور

٦٨- دراسات في التأريخ الكوردي، ترجمة ته رزه فائق الجاف. (بيروت، ١٩٩٨م).

التكريتي، محمود ياسين، الدكتور

٦٩- الأيوبيون في شمال الشام والجزيرة، دار الرشيد، (بغداد: ١٩٨١م).

جحا، ميشيل

٧٠- الدراسات العربية والإسلامية في أوربا. (بيروت : ١٩٨٢م)

جواد، مصطفى، الدكتور

٧١- جاوان القبيلة الكردية المنسية ومشاهير الجاوانيين. من مطبوعات المجمع العلمي الكردي. (بغداد ١٩٧٣م).

حسين، محسن محمد

٧٢- أربيل في العهد الأتابكي. (بغداد: ١٩٧٤م)

حمه خورشيد، فؤاد

٧٣- اللغة الكردية التوزيع الجغرافي للهجاتها. (بغداد ١٩٨٣م).

خصباك، شاكر، الدكتور

٧٤- الأكراد دراسة جغرافية أثنوغرافية. مطبعة شفيق. (بغداد ١٩٧٢م)

خليل، عماد الدين، الدكتور

٧٥- عماد الدين زنكي. مطبعة الزهراء الحديثة.(الموصل: ١٩٨٥م).

دانشمنو. ب.م.

٧٦- الرحالة الروس في الشرق الأوسط. ترجمة وتعليق معروف خزندار.(بغداد: ١٩٨١م).

رودنسون. ماكسيم

٧٧- الصورة الغربية والدراسات الغربية الإسلامية. ضمن كتاب تراث الإسلام. تحريرشاخت وبوزورث. ترجمة محمد زهير السمهوري. سلسلة عالم الفكر.(الكويت: ١٩٨٨م).

ريج. ك.ج.

٧٨- رحلة ريج في العراق عام ١٨٢٠. ترجمة بهاء الدين نوري.(بغداد: ١٩٥١م).

زقزوق. محمود حمدي

٧٩- الاستشراق والخلفية الفكرية للصراع الحضاري. (قطر: ١٤٠٤هـ).

زكي. محمد أمين

٨٠- خلاصة تأريخ الكرد وكردستان من أقدم العصور التاريخية إلى الآن. ترجمة محمد علي عوني. الطبعة الأولى.(مصر: ١٩٣٩م)

٨١- تأريخ الدول والامارات الكردية. ترجمة ومراجعة محمد علي عوني.(مصر. ١٩٤٨م).

السامر. فيصل. الدكتور

٨٢- الدولة الحمدانية في الموصل وحلب. مطبعة الإيمان. الطبعة الأولى.(بغداد: ١٩٧٠م).

سعيد. إدوارد

٨٣- الاستشراق. ترجمة كمال أبو ديب.(بيروت: ١٩٨١م)

صفوة. نجدة فتحي

٨٤- العراق في مذكرات الدبلوماسيين الأجانب.( بيروت: ١٩٦٩م).

العزاوي. عباس

٨٥- شهر زور-السليمانية اللواء والمدينة. تقديم وتعليق. محمد علي قره داغي. الطبعة الأولى.(بغداد: ٢٠٠٠م).

٨٦- العشائر الكردية. ترجمة وتعليق فؤاد حمه خورشيد.(بغداد: ١٩٧٩م).

العقيقي. نجيب

٨٧- المستشرقون. دار المعارف.(مصر: ١٩٦٤م).

عواد. كوركيس

٨٨- ماضي الأكراد وحاضرهم في المصادر العربية القديمة والحديثة.(بغداد. ١٩٩١م).

لسترنج، كي

٨٩- بلدان الخلافة الشرقية، ترجمة بشير فرنسيس وكوركيس عواد، مطبعة الرابطة، (بغداد: ١٩٥٤م).

مجموعة من المستشرقين الروس

٩٠- تأريخ الاستشراق والدراسات العربية والكردية في المتحف الآسيوي ومعهد الدراسات الشرقية في لينينغراد (١٨١٨-١٩٦٨)، ترجمة وتعليق د.معروف خزندار، (بغداد: ١٩٨٠م).

مينورسكي، فلاديمير

٩١- الأكراد ملاحظات وانطباعات، ترجمة د. معروف خزندار، مطبعة النجوم، (بغداد: ١٩٦٨م).

نباتي، عزيز عبد الأحد

٩٢- تأريخ عينكاوه، مراجعة وتقديم البير أبونا، الطبعة الاولى، (أربيل: ٢٠٠٠م).

ناجي، عبد الجبار، الدكتور

٩٣- تطور الاستشراق في دراسة التراث العربي، سلسلة الموسوعة الصغيرة، (بغداد: ١٩٨١م).

نوري، دريد عبد القادر

٩٤- سياسة صلاح الدين في مصر وبلاد الشام والجزيرة، ( بغداد: ١٩٧٦م).

يوسف، عبد الرقيب

٩٥- الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى، مطبعة اللواء، الطبعة الاولى، (بغداد: ١٩٧٢).

## ب. به فارسى

الهى، نورعلى

٩٦- برهان الحق، چاپ هفتم، (تهران: ١٣٦٩هـ ش).

دهخدا، علي أكبر

٩٧- لغت نامه دهخدا، تحريرمحمد معين وسيد جعفر شهيدى، چاپ دووم، (تهران: ١٣٣٤هـ.ش).

٩٨- دوره هفتوانه جزوى أز نامه مينوى سرانجام، صديق صفى زاده بورەكەيى، (تهران: ١٩٨٢م).

سلطانى، محمد على، الدكتور

٩٩- جغرافيــاى تــاريخى وتــاريخ مفصــل كرمانشــاهان، تقديــم عبــد الحســين نوايــى، چــاپ دوم، (تهران: ١٣٧٤هـ.ش).

١٠٠- قيام نهضت علويان زاگرس يا تاريخى تحليلى اهل حق، (تهران: ١٣٧٦هـ.ش) .

١٠١- سەگفتار تحقيقى در آيين اهل حق، ترجمة مريم بــانو رزازيــان، تقديــم وتعليــق محمــد علــى سلطانى، (تهران: ١٣٧٨هـ.ش).

سوري، ما شاءالله

١٠٢- سرودهاى دينى يارسان، ( تهران: ١٣٤٤هـ ش) .

طروه مؤلفان ومترجمان،

١٠٣- فرهنگ خاورشناسان، (تهران: ١٣٧٦هـ ش).

كسروى، أحمد

١٠٤- شهرياران گمنام، مؤسسة انتشارات امير كبير، چاپ دوم، (تهران: ١٣٣٥هـ ش).

١٠٥- تأريخ مشروطه إيران، مؤسسة انتشارات اميركبير، چاپ دوم، (تهران: ١٣٧٨هـ ش).

مردوخ، محمد

١٠٦- تأريخ مردوخ، چاپخانەی آرتش، (تهران: د.ت).

مينورسكي، فلاديمير

١٠٧- تأريخ تبريز، ترجمة وتعليق عبد العلى كارنك، (تهران: ١٣٣٧هـ ش).

مينوى، مجتبى وايرج أفشار

١٠٨- يادنامه ايرانى مينورسكى، انتشارات دانشكاه تهران، (تهران: ١٩٦٩م).

## ج. به كوردى

برونسن، مارتن فان

١٠٩- ئاغاو شێخ و دەوڵەت، ترجمة كوردۆ علي، ( سليمانى: ١٩٩٩ز).

پرشكين، ئەليكسەندەر

١١٠- گەشتێک بۆ ئەرزەروم، ترجمة د. مارف خەزنەدار، (سويد: ١٩٩٥ز).

پيربال، فەرهاد، الدكتور

١١١- سەرچاوەكانی كوردناسی، (سلێمانی: ١٩٩٥ز).

١١٢- وێنەی كورد لە ئەرشيفی كوردناسە ئەورووپييەكاندا، ( هەولێر: ١٩٩٩ز) .

١١٣- ئينجيل د مێژوويا ئەدەبياتين كورديدا، مراجعة محمد گەزنەيی، (دهوك، ١٩٩٩ز).

خالفين، ن.أ.

١١٤- خەبات لە رێی كوردستاندا، ترجمة جلال تقی، چاپخانەی راپەرين، چاپی يەكەم، (سلێمانی: ١٩٧١ز).

رودنكو، ب

١١٥- احمد خانی مەم و زين، (مۆسكۆ: ١٩٦٢ز).

سولتانی، ئەنوەری
١١٦- کەشکۆلە شیعرێکی کوردی (گۆران)، تراستی سۆن بۆ کوردستان،(لەندەن:١٩٩٨ز).
فاسیلیفا، ی.ئی
١١٧- کوردستانی خوارووی رۆژهەلات، ترجمة د. رەشاد میران، چاپی یەکەم، (هەولێر:١٩٩٧ز).
قوبادی، خانای
١١٨- شیرین وخوسرە و، اعداد محمد ملا کریم،(بەغدا: ١٩٧٥ز) .
لازاریف، م.س.
١١٩- کێشەی کورد، ترجمة وتعلیق د. کاوس قەفتان. چاپی یەکەم، (بەغدا:١٩٨٩ز).
محمد، ئەنوەر قادر، الدکتور
١٢٠- لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی،(ستۆکۆلم: ١٩٩٠ز).
المدرس، ملا عبد الکریم
١٢١- بنەماڵەی زانیاران، ئامادە کردنی محمد علي قەرەداغی، چاپخانەی شفیق،(بغداد: ١٩٨٤ز) .
مەزهەر،کەمال، الدکتور
١٢٢- چەند لاپەرەیەک لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، چاپخانەی الأدیب البغدادیە،(بەغدا :١٩٨٥ز).
موکریانی، حسین حوزنی
١٢٣- کوردستانی موکریان یا آتروپاتین. چاپخانەی زاری کرمانجی،چاپی یەکەم، (رواندوز:١٩٣٨ز).
میران، رەشاد، الدکتور
١٢٤- رەوشی ئاینی و نەتەوایەتی لە کوردستاندا،چاپی دووەم،(هەولێر: ٢٠٠٠ز).
مینتشاشفیلی،ا.م
١٢٥- کورد کورتەی پیوەندی کۆمەلایەتی ئابوری رۆشنبیری و گوزەران، وەرگێرانی د.عیزەدین مستەفا رەسول،(سلێمانی:١٩٩٩ز).
نیکیتین، واسیلی
١٢٦- کوردو کوردستان، ترجمة خالیدی حسامی (هێدی)،چاپی یەکەم، (هەولێر:١٩٩٨ز)
هاوار،م.ر.
١٢٧- شێخ محمودی قارەمان و دەولەتەکەی خوارووی کوردستان، (لەندەن: ١٩٩٠ز)
هەورامانی، محەمەد امین
١٢٨- کاکەیی، چاپخانەی الحوادث،(بغداد: ١٩٨٤ز).

## حەوتەم: خووڵاوەكان

أ. بە عەرەبی


حسين، محسن محمد

١٢٩- ابن الأثير وأحداث عصره وحقيقة موقفه من صلاح الدين الأيوبي،بحث منشور في مجلة شمس كردستان،العددين ٢٨، ٢٩، (بغداد: ١٩٧٥م).

خزنه دار، معروف، الدكتور

١٣٠- المستشرق الكبير مينورسكي، مقال منشور في مجلة زاگروس،العدد ١، (اربيل: ١٩٩٧م).

خودو، شكري، الدكتور

١٣١- كوردولوجيا، ترجمة حازم عبد القادر الباشا، مقال منشور في مجلة لالش،العدد١٠،(دهوك: ١٩٩٩م).

الطيباوي،عبد اللطيف، الدكتور

١٣٢- المستشرقون الناطقون بالإنكليزية ومدى اقترابهم من حقيقة الإسلام، بحث منشور في مجلة الفكر العربي، العدد ٣٢، (بيروت: ١٩٨٣م).

عزيز، يوئيل

١٣٣- اللغات الشرقية وآدابها في القرن السابع عشر في انكلترا، بحث منشور في مجلة الجامعة،العدد ١، (الموصل: ١٩٧٥م).

غاليتي، ميريلا

١٣٤- التراث الكردي في مؤلفات الإيطاليين، ترجمة يوسف حبي، بحث منشور في مجلة المجمع العلمي العراقي -الهيئة الكردية-،المجلد ٨، (بغداد: ١٩٨١م).

فرح، سهيل

١٣٥- الاستشراق الروسي نشأته ومراحله التاريخية، بحث منشور في مجلة الفكر العربي، العدد٣١، (بيروت: ١٩٨٣م).

فرنسيس، بشير وكوركيس عواد،

١٣٦- نبذة تاريخية في أصول أسماء الأمكنة العراقية، بحث منشور في مجلة سومر،المجلد ٨، الجلد ٢، (بغداد: ١٩٥٢م).

گوراني، علي سيدو

١٣٧- اللور ولورستان، بحث منشور في مجلة المجمع العلمي الكردي،المجلد ٢، القسم ٢، (بغداد: ١٩٧٤م).

كوردو، قناتي، الدكتور

١٣٨- اوربيلي والدراسات الكردية. ترجمة اورحمان حاجي مارف. بحث منشور في مجلة المجمع العلمي الكردي. المجلد ٣، القسم ١. (بغداد: ١٩٧٥م).

معروف. عبد الرحمن. الدكتور

١٣٩- موجز تأريخ وضع القواميس الكردية. بحث منشور في مجلة المجمع العلمي الكردي. المجلد ٣، القسم ١. (بغداد: ١٩٧٥م).

الملاجاسم، ناصر عبد الرزاق

١٤٠- صلاح الدين الأيوبي في القصص الرومانسية الفرنسية والإنكليزية، بحث منشور في مجلة مركز الوثائق والدراسات الإنسانية. العدد٨. ( جامعة قطر: ١٩٩٦م).

منتران. روبير

١٤١- الاستشراق الفرنسي أصوله تطوره آفاقه. ترجمة د. يوسف حبي. بحث منشور في مجلة الاستشراق. العدد ٢. (بغداد: ١٩٨٧م).

النجار. شكري

١٤٢- لم الاهتمام بالاستشراق. بحث منشور في مجلة الفكر العربي. العدد ٣١. (بيروت: ١٩٨٣م).

النقشبندي. حسام الدين

١٤٣- ملاحظات حول جاوان القبيلة الكردية المنسية ومشاهير الجاوانيين. بحث منشور في مجلة مجمع العلمي الكردي. المجلد٢. القسم ٢. (بغداد: ١٩٧٤م).

النملة. علي بن ابراهيم

١٤٤- كنه الاستشراق مناقشات في التعريف والنشأة. بحث منشور في مجلة كلية الدعوة لجامعة محمد بن سعود الإسلامية. العدد١. (الرياض: ١٩٩٣م).

هولت. ب.م.

١٤٥- من رواد الدراسات العربية في انكلترا أدوارد بوكوك، ترجمة يوئيل عزيز. بحث منشور في مجلة الاستشراق. العدد٢. (بغداد: ١٩٨٧م).

يوسف. عبد الرقيب

١٤٦- نبذة وثائقية عن تأريخ قبيلة جاوان الكردية بحث منشور في مجلة شمس كردستان: العدد ٥٥. (بغداد. ١٩٧٩م).

## ج. به كوردي

أفشار. ايرج

١٤٧- نامه هاى مينورسكى به تقى زاده، مقال منشور في مجلة يغما،المجلد٢٩، (تهران: ١٣٥٥هـ.ش) .

تقي زاده، سيد حسن

١٤٨- در رثاى مينورسكى، مقال منشور في مجلة راهنمائي كتاب،المجلد٩، شماره١، (تهران: ١٣٤٥هـ.ش).

١٤٩- برفيسور مينورسكى، مقال منشور في مجلة يغما،(تهران: ١٣٤٥هـ.ش)، المجلد ١٩

جمالزاده، سيد محمد

١٥٠- نامه جمالزاده برفيسور ولاديمير مينورسكى، مقال منشور في مجلة يغما،المجلد١٩، (تهران: ١٣٤٥هـ.ش)،.

جهانبهاني، سبهبند أمان الله

١٥١- برفسور ولاديمير فيودورويج مينورسكى، مقال منشور في مجلة يغما،المجلد ١٩، (تهران: ١٣٤٥هـ.ش).

حسين شاه، مير

١٥٢- به ياد استاد مينورسكى،مقال منشور في مجلة آريانا،شماره ٢٦٣. (تهران: ١٣٤٥هـ.ش).

رجب نيا، مسعود

١٥٣- استاد مينورسكى، مقال منشور في نشرية كتابخانه ملى تبريز،شماره ١٠، (تبريز، ١٣٤٥هـ.ش).

سياقي، محمد دبير

١٥٤- مرگ مينورسكى، مقال منشور في مجلة سخن، شماره ٣، (تهران: ١٣٤٥هـ.ش).

كارنك، عبد العلى

١٥٥- ملاقات با مينورسكى، مقال منشور في مجلة كتابخانه ملى تبريز،شماره١٠، (تهران: ١٣٤٥هـ.ش) .

مينورسكي، ولاديمير

١٥٦- ابن سينا چگونه مردى بود، ترجمة شجاع الدين شفا، بحث منشور في مجلة دانشكده أدبيات، شماره ٤، (تهران: ١٣٣٣هـ.ش).

١٥٧- بياد قزوينى، مقال منشور في مجلة يغما،المجلد ٨، (تهران: ١٣٣٣هـ.ش).

١٥٨- جهانى كه جهانى نبود،ترجمة مير حسين شاه بحث منشور في مجلة آريانا،شماره ٦، (تهران: ١٣٣٦هـ.ش).

مينوى،د. مجتبى

١٥٩- ياد بروفيسور ولاديمير مينورسكى، مقال منشور في مجلة راهنمائي كتاب، المجلد٩، (تهران: ١٣٤٥هـ.ش).

يوسفي، غلام حسين

